

# مُخْتَصَر صَحِيحْ الْبُخَارِي

المُسَمّى

# بِالتَّجْرِيد الصَّرِيحْ


دانراوى: أبى العباس زين الدين الزبيدى

به كوردى كردن و ليكۆلينهوهى

**نورى فارس حمه خان**

بهگويرهى تهخريجى ( د. مصطفى ديب البغا ) تهخريج كراوه

محمود أحمد محمد

پيێيدا چۆتهوهو سهرپهرشتى له چاپدانى كردووه



2010 ز　　　　1431 ك

بهرگى پێنجهم

بسم الله الرحمن الرحيم

**************************************************

📖 ناوى كتێب: مختصر صحيح البخاري المسمى بـ( التجريد الصريح ).

📖 دانراوى: ابي العباس زين الدين الزبيدي.

📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان.

📖 تیراژ ( ٢٥٠٠ ) دووهەزارو پێنج سەد دانـه.

📖 ژمارەی سپاردن: ( ٢٤٦٤ سالی ٢٠٠٩ ).

📖 سالی چاپ: ٢٠١٠ ز ١٤٣١ ك

📖 کۆمپیوتەرو هەلە چنین : ( رویار حسین/کۆمپیوتەری شانیا )

📖 لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپ کراوە. مافی چاپکردنەوەی بۆ کتێبخانەی ناوبراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٧٠- نامەی ژنهێنان * كِتَابُ النِّكَاح

**پێشەكی:**

١. باسی ژنهێنان (نیكاح) لەفیقهی ئاسان دا، واله بەرگی دووەم دا، زنجیرە: ٢٥٣ لاپەڕە: ٦٠٥ هەتا لاپەڕە: ٦٥٢ چاپی یەكەم.

٢. باسی ژنهێنان لەتاجول ئوصوول دا، وەرگەڕاوە كوردی یەكەی، وا لەبەرگی سێیەم دا، چاپی یەكەم، زنجیرە: ٢٢، لاپەڕە ٤٧ هەتا لاپەڕە ١٥٠.

٣. بۆ ئەم باسە تەماشای ئەم جێگەیەش بێ سوود نابێ: ریاض صالحين، بەرگی یەكەم ل-٢٢٣ ز-٣٢ هەتا لاپەڕە: ٢٤٧ كۆتایی زنجیرە/٣٦- كوردییەكەی.

١٧٤٣ – عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ: جَاءَ ثَلَاثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلَا أُفْطِرُ، وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلَا أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْهِمْ فَقَالَ: أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي. (الحديث ٥٠٦٣) [١٧٤٣].

ئەنەسی كوڕی مالیك -رەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: سێ كەس چوون بۆ ماڵی هاوسەرەكانی پێغەمبەر- دروودی خودای لەسەر بێ – كەئیمامی عەلیو عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاصو عوسمانی كوڕی مەظموون بوون،

---

[١٧٤٣] اخرجه مسلم في النكاح، باب: استحباب النكاح لمن تاقت نفسه اليه...رقم: ١٤٠١.

لەبارەی پەرستیشو خوا پەرستی ی پێغەمبەرەوە -دروودی خوای لەسەر- پرسیاریان هەبوو، کەپێیان گوترا عیبادەتی پێغەمەر -دروودی خوای لەسە- چەندە و چۆنە، وەك بلێی بەکەمی بزانن وابوو، لەبەر ئەوە لەناو خۆیانا گوتیان: ئێمە لەکوێ و پێغەمبەر- دروودی لەسەر- لەکوێ، ئەو خودا بەڕاشکاوی بەدەقی ئایەت لەگوناهی بەرودوای خۆش بووە، ئەوەتانێ یەزدانی گەورە مژدەی دەداتێو پێی دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا. لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا. سورة الفتح ٤٨/١-٢﴾ جایەکێکیان گووتی: من بەشەو ناخەوم هەر شەو نوێژ دەکەم هەتا هەتایە، یەکێکی تریشیان گوتی: منیش ساڵ دوازەدە مانگە هەر بەڕۆژوو دەبمو یەك ڕۆژی لێ ناخۆم، ئەوی تریشیان گوتی: منیش کەنار دەگرم لەژنو هەتا هەتایە ژن ناهێنمو توخنی ژن ناکەوم. کاتێ پێغەمبەر — دروودی لەسەر- بەمەی زانی، هات بۆ لایانو فەرمووی: ئەوە ئێوە وەها وەها دەڵێنو ئەم جۆرە قسانە دەکەن! دەسا بەو خودایە من لەئێوە زیاتر لەخودا دەترسمو، لەئێوە زیاتر تەقوای دەکەم، بەلام لەگەڵ ئەوەیش دا من بەش بەحاڵی خۆم ڕۆژوویش دەگرمو ڕۆژوویش ناگرمو شەو نوێژیش بەشی خۆم دەکەمو بەشی خۆیشم دەخەومو سەرەڕای ئەمانەیش ژنیش دەهێنم، جا ئەمە ڕێگەو رەوشتو ڕەفتاری منە، ئەوەی لێی لابداو پەیڕەوی نەکا لەمن نیەو، بەپەیڕەوی تەواوی ئایینی من دانانرێ، گەرچی بەموسوڵمانیش دابنرێ. ( تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی سێیەم لاپەڕە: ٤٨ زنجیرە/٢٢).

## رەبەنیو خۆخەساندن زۆر ناباشە

١٧٤٤- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لَاخْتَصَيْنَا. (الحديث ٥٠٧٣ - طرفة في ٥٠٧٤)[١٧٤٤].

---

[١٧٤٤] اخرجه مسلم في النكاح، باب: استجاب النكاح لمن تاقت نفسه إليه.. رقم : ١٤٠٢.

سەعدی کوری ئەبو وەقاص -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی عوسمانی کوڕی مەزعوون ویستی لێ ببڕێ بۆ خوداو، واز لەدنیا بهێنێ و بەرەبەنی بژی و ژن نەهێنێ، پێغەمبەریش- دروودی خودای لەسەر بێ - ڕێگەی ئەوەی نەدا، ئەگەر پێغەمبەر- دروودی لەسەر- بۆ ئەوە ڕێگەی ئەوی بدایە، ئێمەیش خۆمان دەخەسان و تەرکی دنیاو ژنهێنانمان دەکردو سەرمان دەکردە خوا پەرستی هەتا مردن!. (تاجی کوردی/٣ ز/٢٢ ژ/٦ ل/٥٠).

١٧٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰه عَنْه قَال: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنِّي رَجُلٌ شَابٌّ، وَأَنَا أَخَافُ عَلَى نَفْسِي الْعَنَتَ، وَلَا أَجِدُ مَا أَتَزَوَّجُ بِهِ النِّسَاءَ، فَسَكَتَ عَنِّي، ثُمَّ قُلْتُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَسَكَتَ عَنِّي، ثُمَّ قُلْتُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَسَكَتَ عَنِّي، ثُمَّ قُلْتُ مِثْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا أَنْتَ لَاقٍ فَاخْتَصِ عَلَى ذَلِكَ أَوْ ذَرْ. (الحديث ٥٠٧٦)[١٧٤٥].

ئەبو هورەیرە- ڕەزای خودای لێ بێ - فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! من پیاوێکی گەنجم و جەهێڵم و نیمە ژن بهێنم و، لەخۆشم دەترسم کەتووشی نارەوایی و بێ شەرعی ببم، کەواتە: ڕێگەم پێ بدە باخۆم بخەسێنم، هەتا لەمەترسی بێ ژنی و ڕەبەنی ڕزگار ببم! پێغەمبەریش خامۆش بوو، وەهیچی نەفەرموو، هەتا سێ جار ئەمەم لێ دووبارە کردەوە، هەردەنگی نەکرد: تالەجاری چوارەما فەرمووی: ( ئەی ئەبو هورەیرە! ئەوەی کەدێتە ڕێت تازەتێ پەڕیوەو ڕەت بوونەوەی بۆ نییەو، کار لەکار تەرازاوەو لەچارەت نووسراوەو کاغەزو قەڵەم پێچراونەتەوەو هەڵگیراون و هیچ لەگەڵ چارەنووس ناکرێ! لەگەڵ ئەمیشە کەیفی خۆتە حەزدەکەی خۆت بخەسێنەو، حەزدەکەی واز بهێنەو خۆت مەخەسێنە، هیچ لەکارەکە ناگۆڕێ و لەئاستی چارەنووسی

---

[١٧٤٥] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابى هريرة: (شاب اخاف العنت..) (فتح البارى ج/١٠ ص ٤٣٢- خاتمة كتاب النكاح. (فأختص على ذلك ابوذر). (الحديث ٥٠٧٦). - المترجم-

لەوحولەحفووظ هیچ سوودی نییە). (بڕ: تاجول ئوصول بەکوردی، لاپەڕە: ٥٠ بەرگی/سێیەم).

## هێنانی کچ پەسەندە

١٧٤٦- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰه عَنهَا قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَرَأَيْتَ لَوْ نَزَلْتَ وَادِيًا وَفِيهِ شَجَرَةٌ قَدْ أُكِلَ مِنْهَا وَوَجَدْتَ شَجَرًا لَمْ يُؤْكَلْ مِنْهَا فِي أَيِّهَا كُنْتَ تُرْتِعُ؟ قَالَ: فِي الَّذِي لَمْ يُرْتَعْ مِنْهَا تَعْنِي أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَتَزَوَّجْ بِكْرًا غَيْرَهَا. (الحديث ٥٠٧٧)[١٧٤٦].

عائشە -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر لەشوێنێ دابەزیت، دوو جۆرە لەوەڕی لێ بوو. یەکێکیان لێ ی خورابوو، ئاژەڵ تیا لەوەڕابوو، ئەوی تریان لێ ی نەخورابوو، ئاژەڵ لێ ی نەلەوەڕابوو، تۆ لەکامیانا وشترەکەت دەلەوەڕێنی؟ فەرمووی: لەو لەوەڕەیانا کەدەمی بۆ نەبراوەو لێی نەخوراوە! عائیشە مەبەستی ئەوە بوو کەپێغەمبەر -درودی لەسەر- بێجگە لەخۆی کچی تری نەهێناوە، وەژنەکانی تری بەبێوەژنی هێناونی. هەر لەبەر ئەوەیش پێغەمبەر- درودی لەسەر بێ- زیاتر نازی عائیشەی دەگرت. (تاج/ ٣ ز/٢٤ ل/٥٦ ژ/٥).

ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەوا باشە: هەر قسەو گوفتوگۆیەك کەپەیوەندی بەکاری نهێنی ی نێوانی ژن و پیاوەوە هەبێ، لەژێر پەردەوە بێ و بەڕاشکاوی و سەروالاّیی نەبێ. هەروەك جۆرە بەڵگەیی یەکی واتیادا: کەکچیش واپەسەندە شووبکا بەکوڕ.

---

[١٧٤٦] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عائشة:( لو نزلت واديا...). (فتح الباري. ج/١٠ ص٤٣٢ -خاتمة كتاب النكاح) - المترجم

# ماره برینی بچووك لەگەورە دروستە

١٧٤٧- عَنْ عُرْوَةَ رحِمَهُ اللهُ تَعَالَى: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطَبَ عَائِشَةَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّمَا أَنَا أَخُوكَ، فَقَالَ: أَنْتَ أَخِي فِي دِينِ اللَّهِ وَكِتَابِهِ، وَهِيَ لِي حَلَالٌ. (الحديث ٥٠٨١)[١٧٤٧].

عوروه -رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ- فەرمووی پێغەمبەر دروودی لەسەر- خوازبێنی عائیشەی کچی ئەبوبەکر، لەئەبوبەکر، دەکا بۆ خۆی، ئەبوبەکریش پێی دەڵێ: (جانەوە چۆن دەبێ، چونکە من برای تۆم، ئەویش کچی منە، برازاش بەمامەی خۆی ناشێ؟). پێغەمەریش حاڵی دەکاو پێی دەفەرموێ: (ڕاستە تۆ برای ئایینی منی، بەپێی نامەی خودا، کەدەرفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ.(١٠) سورة الحجرات﴾ واتە: موسوڵمانان لەناو خۆیانا خوشكو برای ئایینین. بەڵام خوشكو برای ئایینی، نابێ بەمایەی لەیەكتری حەرام بوون، بەڵکوو تەنها خوشكو برای خوێنیوشیری (نەسەبیو ریضاعی) دەبێ بەهۆی حەرامبونی خوشكو برا لەیەكتری، تۆیش نەبرای خوێنی منیو نەبرای شیری، کەواتە: عائشەی کچت بۆ من دروستەو پێم دەشێ).

ڕاڤەو شیكردنەوە:

بەڵگەیی ئەم فەرموودەیە لەسەر سەرباسەکە، لەو ڕووەوەیە: کەپێغەمبەر گەلێ لەعائیشە گەورەتر بووە، بەتەمەن، عائیشە لەو کاتەدا، زۆر بچکۆلە بووە. ئەم فەرمووده‌یە مورسەلی تابیعی یە، بەڵام لەبەر ئەوەی شکۆمەندیی عوروەی کوڕی زوبەیر ناسراوە لەناو فەرمودە زاناکان دا، وەئەم باسو خواسەیش پەیوەندی بەعائیشەی پوریو بەئەبوبەکری باپیریەوە هەیە، کەباوکی ئەسمای دایکی عوروەبووە، وەعوروە خۆی فەقێ و شاگردی عائیشەی پوری بووە، لەبەر ئەم چەند هۆیە چاوپۆشی لە ئرسالەکەی کراوەو لەحوکمی

[١٧٤٧] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث (خطب عائشة...) خاتمة كتاب النكاح.

مسندی متصل دایه (تەواو کاریٚ) . هەروەك دروستە ژنی گەورە یاپیر لەمناڵ، یالە کوڕی گەنج مارە بکریٚ. (بڕ: بەرگی/١ ژ/٣ ل/١٢ + ژ/٧٥ = بەرگی/١ ل/٩٥).

## باسی هاوتایی و هاولفی- کەفائەت

١٧٤٨- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰه عَنْهَا: أَنَّ أَبَا حُذَيْفَةَ بْنَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِشَمْسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَبَنَّى سَالِمًا، وَأَنْكَحَهُ بِنْتَ أَخِيهِ هِنْدَ بِنْتَ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَهُوَ مَوْلًى لِامْرَأَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ كَمَا تَبَنَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْدًا، وَكَانَ مَنْ تَبَنَّى رَجُلًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ دَعَاهُ النَّاسُ إِلَيْهِ وَوَرِثَ مِنْ مِيرَاثِهِ حَتَّى أَنْزَلَ اللّٰهُ: (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ) إِلَى قَوْلِهِ ( وَمَوَالِيكُمْ ) فَرُدُّوا إِلَى آبَائِهِمْ فَمَنْ لَمْ يُعْلَمْ لَهُ أَبٌ كَانَ مَوْلًى وَأَخًا فِي الدِّينِ فَجَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلِ ابْنِ عَمْرٍو الْقُرَشِيِّ ثُمَّ العَامِرِيِّ وَهِيَ امْرَأَةُ أَبِي حُذَيْفَةَ بْنِ عُتْبَةَ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّا كُنَّا نَرَى سَالِمًا وَلَدًا وَقَدْ أَنْزَلَ اللّٰهُ فِيهِ مَا قَدْ عَلِمْتَ فَذَكَرَ الْحَدِيثَ. (الحديث ٥٠٨٨ –طرفه في ٤٠٠٠)[١٧٤٨].

عائیشە -ڕەزای خودای لیٚ بیٚ- فەرمووی: ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدو شەمس- ڕەزای خودای لیٚ بیٚ – سالمی کوڕی مەعقلی، لەسەردەمی نەزانیدا، کردبوو بەکوڕی خۆی، کەبەم کرداره لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا، دەگوتریٚ : (تبني) ئەم ئەبو حوزەیفەیە یەکیٚك بوو لەوزاتانەی کەلەگەڵ پیٚغەمبەردا، ئامادەی جەنگی بەدر بوو بوو، لەم ڕووەوە پیٚی دەگوتریٚ: بەدری. ئەبو حوزەیفە برازایەکی خۆشی – کەناوی هیندی

---

[١٧٤٨] أشار العسقلاني في خاتمة كتاب النكاح بأنَ مسلماً وافقهُ في تخريجهُ. (انظر فتح الباري ج/١٠ ص/٤٣٢). –المترجم

کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بوو لەم سالمەی بەناو کوڕی مارە کردبوو، سالم ئازاد کراوی ژنێکی ئەنصاری بوو، ناوی ثوبەییە بوو، ژنی ئەبو حوزەیفە بوو، ئەم ڕووداوی کردنی کەسێ بەکوڕی خۆت، لەپێش ئیسلاما باو بوو، ئەوە بوو: پێغەمبەریش لەو سەردەمەدا، زەیدی کوڕی حاریسەی کردبوو بەناو کوڕی خۆی، وەك لەقورئانا باسی ئەم داستانە کراوە، لەسەردەمی نەفامیش دا دەستوور بوو، کەسێ پیاوێکی بکردایە بەکوڕی خۆی، مەردمەکە بەناوی ئەوەوە ناویان دەهێنا، وەك بەزەیدی کوڕی حاریپەیان دەگوت: زەیدی کوڕی موحەمەد، وە بەناو کوڕەکە لەباوکە درۆینەکەی میراتو کەلەپوری دەگرت، ئەم باوو دەستوورە هەروا ما، هەتا ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە: ﴿مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ. ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا. -سورة الأحزاب (٣٣/٤-٥)-﴾.

واتە: وەخودا زڕ کوڕەکانیشتانی نەکردووە بەکوڕی ئێوە، ئەوە قسەیەکی رووتە، کەبەزار دەیکەن، بڕیاری یاسایی بەشتی وا دانامەزرێ، خودا فەرمانیشتی راستو دروستە، وە هەرخۆی ڕێگەی هەق نیشانی بەندەکانی خۆی دەدا. ئیتر ئەم زڕکوڕانەتان بەناوی خۆتانەوە بانگ مەکەن، بەڵکوو بەناوی باوکی ڕاستەقینەی خۆیانەوە بانگیان بکەن. بۆ نمونە: مەڵێن: زەیدی کوڕی موحەمەد، بەڵکو بڵێن: زەیدی کوڕی حاریسە. چونکە والەبارترو ڕەواترە لەلای خودا، خۆئەگەر دنیا بوو، باوکی ئەوانتان نەدەناسیو نەتان دەزانی کەکوڕی کێن، ئەوا برای دینیو دۆستی ئێوەن. ئەگەر بەهەڵە، لەسەر عادەتی کۆن، شتی واتان لەدەم دەرچوو، بەوێنە: لەباتی ئەوەی کەبڵێن: سالمی

کوڕی معقل، گوتتان: سالی کوڕی ئەبو حوزەیفە، ئەوە قەیدی نییەو بەوە گوناهبارنابن، بەڵام لەپاش ئەم ڕوونکردنەوەیە، بەقەستی دڵ، ئەگەر شتی واتان گوت، ئەوە بەرپرس دەبنو پێی گوناهبار دەبن هەمیشە خودا لەگوناه دەبوورێ و ڕەحم بەدروستکراوانی خۆی دەکا. جاکاتێ ئەم ئایەتە پیرۆزانە سەبارەت بەم بابەتە هاتنە خوارەوە، ئیتر ئەو زڕکوڕو بەناو کوڕانە بەناوی باوکی خۆیانەوە بانگ دەکران، وەهەر کەسێ لەوان ناوی باوکی نەزانرایە، ئەوە ئازاد کراویان بوو، وەبرای ئایینی یان بوو، وەبەناوی زڕبابەکەیەوە ناویان نەدەهێنا، جا سەهلەی کچی سوهەیلی کوڕی عەمری ناسراو: هەم بەقوڕەیشیو هەم بەعامیری، کەهەوێ ی ثوبەییەی ژنی ئەبو حوزەیفە بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت- دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی کەئێمە جاران لەسەر دەستووری کۆن، سالمان بەکوڕی خۆمان دەزانی، وە وەك کوڕی خۆمان ڕەفتارمان لەگەڵ دەکردو مەحرەمو خۆیی بوو لەناو مانا، بەڵام ئێستا ئەوەتا وەك دەزانیت خودای گەورە بەئایەتی قورئان ئەو دەستورو باوو نەریتە کۆنەی پووچ کردۆتەوەو هەڵی وەشاندۆتەوە. جا ئەی پێغەمبەری خودا ! تۆ ئێستا چی دەفەرمووی لەم بارەیەوە؟ فەرمووی: (مەمکی بدەرێ هەتا سالم ببێ بەخۆیی (بەمەحرەم) بۆت، سوهیلەیش پێنج جار لەشیری خۆی تیر شیری کرد، ئیتر سالم بوو بەکوڕی شیریی سوهەیلەو کێشەکەیان کرایەوە. (بڕ:تاج/٧ ل/٩٣ ژ/١٦ ژ/١٠ + ژ/١١) + (ژ: ١٧٥٣ تجرید).

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

١- پەیوەندی فەرموودەکە بەسەر باسەکەوە لەوەدایە، گەرچی سالمو هیند کەژنو مێرد بوون، یەکێکیان کۆنەبەندەو ئەوی تریان ئازادی ئەصڵی بووە، بەڵام چونکە لەئایین دا هاوکوف بوونو هەردوکیان موسڵمان بوون

مارەیان لەیەکتر هاتووە، بەلاّم ئەگەر نەسەب مەرج بوایە، دەبوو مارەیان لەیەکتری نەیەت.

٢- ئەم فەرموودەیە بەلگەی ئەوەیە، کەشیرو مەمکخواردن بە گەورەییش کاری گەری هەیەو تەحریمی تەئبیدی پیێ دادەمەزریێ، حەزرەتی عائیشە فەتوای وای دەدا بۆ خەلّكو خۆشی کاری پیێ دەکرد، چونکە وادەبوو فەرمانی دەکرد بەخوشکە زاو برازاکانی کە مەمك بدەن بەهەندیێ پیاو، هەتا ببن بە خوشکەزاو برازای حەزرەتی عائیشە، ئیتر لەوە دواڕیێگەی هاموشوی پیێ دەدان وەك خۆییو مەحرەم، ژنەکانی تری پیێغەمبەر شتی وایان نەدەکرد.

١٧٤٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّه عَنْها قَالَتْ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ضُبَاعَةَ بِنْتِ الزُّبَيْرِ فَقَالَ لَهَا: لَعَلَّكِ أَرَدْتِ الْحَجَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ لَا أَجِدُنِي إِلَّا وَجِعَةً فَقَالَ لَهَا: حُجِّي وَاشْتَرِطِي قُولِي: اللَّهُمَّ مَحِلِّي حَيْثُ حَبَسْتَنِي. وَكَانَتْ تَحْتَ الْمِقْدَادِ بْنِ الْأَسْوَدِ.(الحديث ٥٠٨٩)[1749].

عائیشە- ڕەزای خودای لیێ بیێ- فەرمووی پیێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بیێ- چوو بۆ سەردانی ضوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموگەلیب، کەئامۆزای پیێغەمبەر بوو، ضوباعە گوتی: ئەی پیێغەمبەری خودا؟ دەمەویێ بچم بۆ حەج،بەلاّم دەترسم لەڕیێ نەخۆش بکەوم؟ فەرمووی پیێی- دروودی خودای لەسەر بیێ -: (بڕۆ بۆ حەجو مەرج دابنیێ، ئاوا؛ بلّیێ : ئەی خودایە! لەهەر کویێ تۆ نەخۆشت خستم، لەویێ ئیحرام دەشکیێنم). ضوباعە ژنی میقدادی کوڕی ئەسەدبوو. (تاج/٢ ل/١٧٠ ز: ٨٧ ژمارە/٥) .

ڕاڤەو شیکردنەوە:

دەی ئەگەر بیێجگە لەهاوکوفی لەئایین دا، هاوکوفی لەنەژادو نەسەبدا مەرج بوایە، مارەی ضوباعەی ئامۆزای پیێغەمەر- درودی لەسەر- لەمیقداد

---

[1749] اخرجه مسلم في الحج، باب: جواز اشتراط المحرمالتحلل بعذر.. رقم:١٢٠٧.

نـەدەهات، بڕوانـە: ژمـارە/١٥٣٥ تجريـد = ٤٠١٩ فـتح البـاری = بـەرگی چوارەم ل/٢٦٩.

١٧٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَـا وَلِـدِينِهَا فَـاظْفَرْ بِـذَاتِ الـدِّينِ تَرِبَـتْ يَدَاكَ.(الحديث ٥٠٩٠)[١٧٥٠].

ئـەبو هـورەیرە -ڕەزای خـودای لێ بـێ- فـەرمووی: پێغەمبـەر -دروودی لەسەر- دەفەرمویٚ: (واباوە لـەناو خـەڵکا، کـەژن لەبـەر ئـەم چوار شـتە مـارە دەکرێو دەخوازرێ: لەبەر ئەوە کەماڵی هەیـە، یالـە بـەر ئـەوە کـە خانـەدانـە، یالەبەر ئەوە کەجوانە، یالەبەر ئەوە کە بەئایینەو بەدینەو دینـدارە، جائـەی ژنخوازی هۆشمەند! تۆ ئافرەتی ئایینداری بەدین بهێنەو لـەکیس خـۆتی مـەدە، هەتا دەستە شکێن نەبیت!). (تاج/٣ ل/٥٤ ز/٢٤ ژ/١).

ڕوونکردنەوە:

بۆ ژنیش هەروا، وەئـەم چـوار شـتـە، بـەپێی ئـەم فەرمودەیـە، سـوننە تـە هەم بۆ پیاو و هەم بۆ ژن ڕەچاوبکرێن. بەنموونە: ژنێ کوڕێکی دەوڵەمەنـدی خانەدانی بەدینو کـوڕێکی هـەژاری بـەدین داوای بکـەن، واباشـە شـوو بکـا بـە کوڕە دەوڵەمەنـدە بەدینەکەیان. مەبەست هەر ئـەم چـوار شـتـە نییـە، بـەڵکوو هەموو شتێکی باش، هاندەرێکە بۆ ژنهێنانو شووکردن، بەڵام سەر گولەکەیان دینە.

١٧٥١- عَنْ سَهْلٍ رَضِيَ اللَّه عَنْهُ قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟ قَالُوا: حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ يُنْكَحَ وَإِنْ شَفَعَ أَنْ يُشَفَّعَ وَإِنْ قَالَ أَنْ يُسْتَمَعَ قَالَ: ثُمَّ سَكَتَ فَمَرَّ رَجُلٌ مِنْ فُقَرَاءِ الْمُسْلِمِينَ فَقَـالَ: مَـا تَقُولُونَ فِي هَذَا؟ قَالُوا حَرِيٌّ إِنْ خَطَبَ أَنْ لَا يُنْكَحَ وَإِنْ شَفَعَ أَنْ لَا يُشَفَّعَ وَإِنْ قَـالَ:

---

[١٧٥٠] اخرجه مسلم في الرضاع، باب: استحباب نكاح ذات الدين، رقم: ١٤٦٦.

أَنْ لَا يُسْتَمَعَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا خَيْرٌ مِنْ مِلْءِ الْأَرْضِ مِثْلَ هَذَا.(الحديث ٥٠٩١ طرفه في: ٦٤٤٧)[١٧٥١].

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ئەنصاری فەرمووی: پیاوێکی داراو دەوڵەمەند، لەلای پێغەمبەرو مەجلیسە کەیەوە ڕابورد. فەرمووی: (ئەم پیاوە چۆن پیاوێکە بەلاتانەوە؟) گوتیان: ئەمە پیاوێکی خانەدانی دەوڵەمەندە، بەخودا ئەمە شایستەی ئەوەیە ئەگەر داوای ژن بکا، ژنی پێ بدرێ، ئەگەر تکایێ بکا تکای بگیرێ، ئەگەر قسەیێ بکا گوێ بۆ قسەکەی بگیرێ و گوێی بۆ شل بکرێ. پێغەمبەریش- دروودی لەسەر بێ – خامۆش بوو، تاپیاوێکی هەژار لەموسڵمانان لەوێوە ڕەت بوو، جا فەرمووی: (ئەدی ئەی ئەم پیاوە چۆن پیاوێکە بەلاتانەوە؟) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە پیاوێکە لەهەژارانی موسڵمانان، ئەمە هەقی وایە کەژنی پێ نەدرێ، تکای نەگیرێ، گوێ لەقسەی نەگیرێ! پێغەمبەریش – دروودی لەسەر بێ – فەرمووی: (دەسا بزانن کەئەمەیان، کە ئێوە لەبەر هەژاری واتان پێگوت، لەلای خودای گەورە، باشترو لەپێشترە لەپڕ زەوی لەوێنەی ئەوەی تریان. قەدرو ڕێزو چاکی لەلای خودای گەورە، بەدڵی پاکە، بەباوەڕی جوانە، بەماڵو سامانو خانەدانی نییە). (تاج/٣ ل/٥٨ ز/٢٥ ژ/١) + (ریاض/١ ل/ ٢٢٣ ژ/٢٥٣).

## باسی شوومیو بەدقوومی ژن

١٧٥٢- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنْ النِّسَاءِ.(الحديث ٥٠٩٦)[١٧٥٢].

---

[١٧٥١] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث سهل: مر رجل فقالوا: هذا حرى إن خطب ان ينكح- فتح/١٠ خاتمة كتاب النكاح ص٤٣٢. - المترجم-

[١٧٥٢] اخرجه مسلم في الذكر والدعاء والتوبة والرقاق، باب: أكثر أهل الجنة الفقراء...رقم: ٢٧٤٠.

ئوسامەی کوڕی زەید -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی (لەپاش مەرگی خۆم، هیچ ئاژاوەو فیتنەیەکم لەناو ئومەتما بەجێ نەهێشتووە، کەوەك ئاژاوەو فیتنەی ژنان زیانبەخشن بێ بۆ پیاوان). (تاج/٣ ل/٥٧ ز/٢٤ ژ/٨) + (ریاض/١ ز/٣٥ ل/٢٤٤ ژ/٢٨٨).

ڕوونکردنەوە:

بۆ ئەم باسە بڕوانە: (تاج/ ٤ل/٢٣١ ز/٧٧) + (ریاض الصالحین، بەرگی چوارەم، لاپەڕە/١٢٣٠ ز/٣٠٤) = ژمارە: ١٦٧٤ تا ١٦٧٧.

## باسی شیرو مەمکخواردن

١٧٥٣- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللّٰه عَنْهُما قَالَ: قِيلَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَلَا تَتَزَوَّجُ ابْنَةَ حَمْزَةَ؟ قَالَ: إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنْ الرَّضَاعَةِ.(الحديث ٥١٠٠ طرفه في: ٢٦٤٥)[١٧٥٣].

ئیبنو عەباس -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی ئیمامی عەلی عەرزی پێغەمەر دەکا- دروودی لەسەر- ئەوە بۆچی کچەکەی حەمزەی مامەت، کەئامۆزای خۆتە مارە ناکەی بۆ خۆت، بەڕاستی کچێکی شۆخ و شەنگە؟ فەرمووی: (پێم ناشێ، چونکە برازای شیریمەو کچی حەمزەیە، حەمزەیش هەم مامی هەقمە، برای باوکمەو هەم برای شیریمە، چونکە ثوومیبە هەم شیری دابوو بەئیمامی حەمزە، هەم شیری دابوو بەپێغەمبەر- دروودی لەسەر- بەدووسالْ لەپاش حەمزە مەمکی دابوو بەپێغەمبەر. (تاجول ئوصول، بەرگی/سێیەم لاپەڕە/٦٧ ز/٢٩) + (ل-٦٩ ز/٣٠ - باسی مەمکخواردن و شیرخواردن).

---

[١٧٥٣] أخرجه مسلم في الرضاع، باب: تحريم ابنة الأخ من الرضاعة، رقم: ١٤٤٧

١٧٥٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰه عَنها أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ عِنْدَهَا وَأَنَّهَا سَمِعَتْ صَوْتَ رَجُلٍ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ قَالَتْ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِكَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُرَاهُ فُلَانًا لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنْ الرَّضَاعَةِ قَالَتْ عَائِشَةُ لَوْ كَانَ فُلَانٌ حَيًّا لِعَمِّهَا مِنْ الرَّضَاعَةِ دَخَلَ عَلَيَّ؟ فَقَالَ: نَعَمْ الرَّضَاعَةُ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلَادَةُ.(الحديث٥٠٩٩ طرفاه في: ٢٦٤٦، ٣١٠٥)[١٧٥٤].

عائشه -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر-دروودی لەسەر- لەلای من بوو، گویم لێ بوو پیاوێ ڕێخوازی دەکرد کەبچێ بۆ لای حەفصەی کچی عومەر، کەژنی پێغەمبەر بوو، عائیشە فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە پیاوێکە ڕێخوازی دەکا، کەبچێ بۆ ماڵی تۆ، واتە: بۆ ماڵی حەفصەی ژنت؟ فەرمووی: (وادەزانم کەفیسارە کەسە، کەمامی شیریی حەفصەیە) کەواتە: خۆیی یەو بێگانە نییە، بابچێت) عائیشە فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: دەی کەوابێ ئەگەر ئێستا فیسارەکەس بمایی، کەمامی شیریی من بوو، دەیتوانی وەك مەحرەم هاموشۆی من بکا؟ فەرمووی: (بەڵێ، چونکە هەرچی بەخزمایەتیو زاوزێ حەرام ببێ، بەهۆی مەمکخوادنیشەوە حەرام دەبێ). (تاج/٣ ل/٦٧ ز/٢٩ ژ:١ - ش/د/ت/ن= شەیخان + ئەبوداوود + تەرمەزی + نەسائی. ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێ).

١٧٥٥- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ رَضِي اللّٰه عَنهُما أَنَّهَا قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ انْكِحْ أُخْتِي بِنْتَ أَبِي سُفْيَانَ فَقَالَ: أَوَتُحِبِّينَ ذَلِكِ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ وَأَحَبُّ مَنْ شَارَكَنِي فِي خَيْرٍ أُخْتِي فَقَالَ النَّبِيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ ذَلِكِ لَا يَحِلُّ لِي قُلْتُ: فَإِنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ؟ قَالَ: بِنْتَ

---

[١٧٥٤] اخرجه مسلم في الرضاع، باب: يحرم من الرضاعة مايحرم من الولادة، رقم:١٤٤٤.

أُمّ سَلَمَةَ قُلْتُ: نَعَمْ فَقَالَ: لَوْ أَنَّهَا لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ لِي إِنَّهَا لَابْنَةُ أَخِي مِنْ الرَّضَاعَةِ أَرْضَعَتْنِي وَأَبَا سلمةَ ثُوَيْبَةُ فَلَا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلَا أَخَوَاتِكُنَّ.(الحديث ٥١٠١ أطرافه في: ٥١٠٦، ٥١٠٧، ٥١٢٣، ٥٣٧٢)[١٧٥٥].

ئوم حەبیبەی كچی ئەبو سوفیان -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! حەمنەی خوشكم كەكچی ئەبو سوفیانە،مارە بكە بۆ خۆت. فەرمووی: جاپێت خۆشە؟) گوتم: بەڵێ، چونكە ئەوە نەبێ كەتۆ تەنیا هەر بۆ من بیت، خۆشەویسترین كەسیش كەهاوبەشم بێ لەم بەهرەی هاوسەرێتی ی تۆدا، ئەو خوشكەمە، كەوابوو حەزدەكەم مارەی بكەی، هەتا ئەو شانازیو سەربەرزی یە بەویش ببڕێ. فەرمووی: (دەسا ئەوە بۆ من دروست نییەو پێم ناشێ، چونكە دروست نییە بۆ پیاوێ دووخوشك مارە بكا بۆ خۆی). منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! سائێمە لەناو خۆمانا مقۆ مقۆی ئەوە مانە كەتۆ دەتەوێ دوڕەی كچی ئەبو سەلەمە مارە بكەی بۆ خۆت، ئەی ئەوە چۆنە؟ فەرمووی: (هەنەزاكەی خۆم كەكچی ئوممو سەلەمەی ژنمە؟) . گوتم: بەڵێ ئەو! فەرمووی: (دەسا بەخودا ئەوە ڕاست نییە، چونكە ئەوە گریمان ئەگەر زڕ كچیشم نەبێو لەكۆشی خۆشم دا بەخێوی نەكەم، هەر پێم ناشێ، چونكە ئەو برازای شیریمە؟ لەكاتی خۆیدا ثوەیبە مەمكی داوە هەم بەمنو هەم بەئەبو سەلەمەی باوكی،جا نەكچی خۆتانو نەخوشكی خۆتانم بۆ هەڵ مەدەنو ئەوانەم پێشكەش مەكەن، ئێوە كەژنو هاوسەری منن). (تاج/٣ ل/٦٨ ز/٢٩ ژ/٤).

ڕاڤەو شیكردنەوە:

---

[١٧٥٥] اخرجه مسلم في الرضاع، باب تحريم الربيبة واخت الزوجة.. رقم:١٤٤٩.

١. ثووەیبە دایکی شیری ئیمامی حەمزەو پێغەمەرو ئەبو سەلەمەبوو، لەسەردەمی پیش هاتنی ئیسلام دا شیریی دابوو بەهەرسێکیان‌و ئەو شیر پێدانە کاریگەر بوو. کەواتە ئێستایش ئەگەر دوو کەس شیرو مەمکی ژنێ بخۆن‌و پاشان ئیسلام ببن، لەیەکتر حەرام دەبن.

٢. ئەم چوار ژنە مەمکیان بەپێغەمبەر داوە: ئامینەی دایکی‌و ثووەیبەو حەلیمەی سەعدییەو ئوم ئەیمەن.

٣. ئیبنو مەندە دەفەرموێ: ثووەیبە ئیسلام بووە. پێغەمبەر زۆر بۆی باش بووە، خەدیجەیش زۆر ڕێزی دەگرت، لەسالی حەوتی کۆچی دا لەپاش ئازاد کردنی خەیبەر، کۆچی دوایی کردووە. ڕەزای خودای لێ بێ. بڕوانە: بەرگی پێنجەم، تاج، لاپەڕە:

١٧٥٦- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا قَالَتْ: أَنَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدِها رَجُلٌ فَكَأَنَهُ تَغَيَّرَ وَجْهَهُ كَأَنَّهُ كَرِهَ ذٰلِكَ فَقَالتْ إِنَّهُ أَخِي، فَقَالَ: انْظُرْنَ مَنْ إِخْوَانُكُنَّ فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنْ الْمَجَاعَةِ.(الحديث ٥١٠٢)[١٧٥٦].

عائیشە -ڕەزای خودای‌لێ بێ- فەرمووی: جارێ لەماڵی خۆم پیاوێ لەلام دانیشتبوو، پێغەمبەر- درووودی لەسەر- لەوکاتەدا هات بۆ لام، کەئەمەی دی لەبەری گران بوو، سەرەنجی دەمو چاویم کردتووڕەبوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە برای شیریمە، بێگانە نییە، پێت ناخۆش نەبێ. فەرمووی: (باش سەرنج بدەن لەبراو خوشکی شیریی خۆتان، هەتا بزانن هەموو مەرجەکانی شیرو مەمکخواردن هاتۆتە جێ ئەو جا بڕیار بدەن، چونکە نەمکخواردن کاتێ دادەمەزرێ، کەلەکاتی ساوایی دابێ، کەمناڵ لەبەر برسێتی ی شیر دەخوات). (تاج/٣ ل/٧٠ ز/٣٠ ژ/٢ - ش/د).

---

[١٧٥٦] أخرجه مسلم في الرضاعة، باب: إنما الرضاعة من المجاعة، رقم: ١٤٥٥.

## دروست نییه ژن بەسەر پووری، یابەسەر میمکی خۆی شوو بکات

١٧٥٧- عَنْ جَابِر بن عبدالله رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُنْكَحَ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا أَوْ خَالَتِهَا.(الحديث ٥١٠٨)[١٧٥٧].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر-دروودی لەسەر – ڕێگری دەکرد لەوە: کەژن شووبکا بەسەر خوشکی باوکی، کەپێ ی دەگوترێ میمك، یاشوو بکات بەسەر خوشکی دایکی کەپێی دەگوترێ پوور، وەهەروا پورو میمکیش نابێ شوو بکەن بەسەر برازاو خوشکەزای خۆیان. (تاج/٣ ل/٦٨ ز/٢٩ ژ/٣ ش/ د/ ت/ن).

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

**چەند بڕیارێکی شەرعی عەمەلی:**

**یەکەم: پوختەیی لەبڕیارەکانی شیرو مەمکخواردن:**

أ- هەردوو کەسێ شیر خواردنی شەرعی چەسپا لەنێوانیان دا، هەتا هەتایە لەیەکتر حەرام دەبن، مارەیان لەیەکتری نایێ، نەظەریان بۆ یەکتر حەرام نییە، خەڵوەتیان دوو بەدوو لەگەڵ یەکتردا حەرام نییە، سەفەریان پێکەوە دوو بەدوو دروستە،دروستە لەگەڵ یەکتری بچن بۆ حەج، دەستنوێژیان لەیەکتری ناشکێ، بەشێوەی گشتی، لەبابەتی خواستن و تەماشا کردن و دوو بەدوو پێکەوە بوون و سەرفەر کردن و دەستنوێژو تەوقەکردن و ماچ کردن و تەوابیعی نیکاحەوە، دادەنرێن بەدوو خزمی خۆیی و مەحرەم، بەبێ زیادو کەم، چی بۆ ئەوان دروستە بۆ ئەمانیش دروستە، وەچی بۆ ئەوان دروست نییە بۆ ئەمانیش کەکەسی شیریی یەکترین دروست نیە.

---

(١٧٥٧) لم يوافقه مسلم حديث جابر في الجمع بين المراة وعمتها. (فتح/١٠ص٤٣٢- خاتمة كتاب النكاح) -المترجم-

ب- بەڵام بەشیرو مەمکخوارن ئەم بڕیارانە ناچەسپێ: کەلەپوورو میرات لەیەکتری ناگرن، ژێوارو نەفەقەیان لەسەر یەکتری نییە، ئەگەر کوڕی شیری خوشکی شیری خۆی، یادایکی شیری خۆی، یاباوکی شیری، یاهەر کەسێکی تری شیری خۆی بوو بەبەندەو موڵکی، بەوە ئازاد نابێ، بەپێچەوانەی باوكو دایكو براو کەسی نەسەبی، کەلەکاتی وادا یەکسەر ئازاد دەبن. یا شایەتی برای شیریی بۆ دایکی شیری قەیدی نییەو وەردەگیرێ، یائەگەر باوکی شیریی کەسێ، یاباپیری شیریی کەسێ، یان دایکی شیریی کەسێ، کەسێکی تری کوشت، ئەم مناڵە شیرییەی بەعاقلە دانانرێ، واتە: بەشێ لەخوێنی کوژراوەکە ناکەوێتە ئەستۆی ئەو. ئەگەر باوکی شیریی یادایکی شیریی، مناڵی شیریی خۆیی کوشت دەکوژرێتەوە لەباتی، بەپێچەوانەی مناڵو باوكو دایکی خوێنی، واتە: نەسەبی. چونکە ئەوان لەباتی مناڵی خۆیان ناکوژرێنەوە وەهەروەها براو باوكو مامی شیریو ئەمانە، لەکاتی مارەبڕین داو، لەکاتی حەددو تۆڵە سەندنو قصاصو قەزفو تەعزیرو ئەمانەدا نابن بەهەقدارو وەلی ژنە شیرە خۆرەکەیان، یاباوکە شیرییەکەیان.

ج- بەشێوەی گشتی سیلەی رەحمیان سوننەتە، بەسەرکردنەوەو سەر لێدانو دیاری بردن بۆیان سوننەتە، باشبوون بۆیان سوننەتە.

د- شیرخواردن مەحرەمییەت لەنێوان شیرە خۆرو ئەم کەسانەدا لەسەر ئەم شێوەیە دادەمەزرێنێ:

١- ژنە شیردەرەکە، چونکە دایکی شیریی یەتی.

٢- مێردەکەی چونکە خاوەنی شیرەکەیەو ئەو ژنەکەی متوربە کردووە.

٣- ئاغای ژنەکە، ئەگەر ژنەکە کەنیزەكو جاریە بوو، مێردی نەبوو، ئوم وەلەدبوو.

٤- دایکی ژنە شیردەرەکە، چونکە نەنکی شیرییەتی، بابەرەو زووریش بڕوا.

٥- خوشکی شیر دەرەکە،چونکە پوورییەتی.

٦- كچی شیردەرەکە چونکە خوشکی شیرییەتی.

٧- کچی کچی شیردەرەکە، چونکە خوشکەزایەتی، بابەرەو خواریش بڕوا،

٨- کچی پیاوی خاوەن شیرەکە بالەژنێکی تریشی بێ چونکە خوشکی شیرییەتی.

٩- کچی کچی خاوەن شیرەکە، چونکە خوشکەزای شیرییەتی، بابەرەو خواریش بڕوا.

١٠- دایکی خاوەن شیرەکە، چونکە نەنکی شیرییەتی، بابەرەو ژووریش بڕوا،

١١- خوشکی خاوەن شیرەکە، چونکە پووری شیرییەتی.

١٢- برای خاوەن شیرەکە چونکە مامی شیرییەتی.

١٣- کوڕی خاوەن شیرەکە، چونکە برای شیرییەتی

١٤- باوکی خاوەن شیەکە چونکە باپیرەی شیرییەتی، بابەرەو ژووریش بڕوا.

١٥- کوڕی شیر دەرەکە، چونکە برای شیرییەتی.

١٦- برای شیردەرەکە، چونکە خاڵی شیرییەتی.

١٧- کوڕو کچی کوڕی شیردەرەکە، چونکە کوڕە زاو خوشکەزایەتی لە شیرەوە. (بۆ زیادە بەهرە، بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، لاپەڕە/٦٢٧ زنجیرە/٢٦١).

هـ- باوكو دایكو براو خوشكو کەسی تری مەحرەمی منداڵە شیرخۆرەکە نابن بەهیچی ژنە شیر دەرەکەو مێردەکەیو منداڵو کەسو کاری تریان، ئەگەر لەلایەکی ترەوە مەحرەمیان نەبن.

و- شیرو بڕیارەکانی شیر لەنێوانی موسوڵمانو ناموسڵمانیش دا دادەمەزرێ، ئەگەر شیردەر مەسیحی بوو، منداڵە شیرە خۆرەکە موسڵمان بوو، دەبن بەدایكو کوڕی شیریی یەکتری وەهەروا.

**دووەم: پوختەیی لەنادورستبوونی کۆکردنەوەی دووژنی لەناوخۆیانا خۆیی، لەژنێتی ی یەك پیاودا:**

١- حەرامە کۆکردنەوەی دایكو کچ.

٢- حەرامە کۆکردنەوەی نەنكو نەوەی خۆی.

٣- حەرامە کۆکردنەوەی دوو ژن، کە ئەگەر گریمان یەکێکیان پیاو بێو یەکێکیان ژن بێ، مارەیان لەیەکتریی نەیێ، وەك دوو خوشك پێکەوە، یاژن لەگەڵ برازای خۆی دا، یالەگەڵ خوشکەزای خۆی دا، یاکۆکردنەوەی دوو خوشکی شیریی بەیەکەوە، یاکۆکردنەوەی کچ لەگەڵ دایکی شیریی خۆی دا، یاکۆکردنەوەی کچ لەگەڵ نەنکی شیریی، یا کۆکردنەوەی ژن لەگەڵ دایکی شیری، یانەنکی شیریی باوكو دایکیدا... تادوایی.

## باسی ژن بەژن

١٧٥٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ الشِّغَارِ وَالشِّغَارُ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ الْآخَرُ ابْنَتَهُ لَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ.(الحديث ٥١١٢ طرفه في: ٦٩٦٠)[١٧٥٨].

ئیبنو عومەر- ڕەزای خودایان لێ بێ – فەرمووی: پێغەمبەر- دروودی لەسەر- ڕێگەی ژن بەژنی نەئەدا، ژن بەژنیش ئەوەتانێ کەدوو پیاو بەکچی خۆیان ژن بەژن بکەن، بەبێ مارەیی (تاج/٣ ل/١٤٧ ز/٥٩ ژ/٢ - ش/د/ت/ن = شەیخان + ئەبوداوود + تەرمەزی + نەسائی -رەحمەتی خودا لەهەموویان).

**روونکردنەوە:**

ژن بەژن لەسەر ئەم شێوەیەی کەوا لەم فەرموودەیەدا نادروستە، ئیتر کچ بەکچ بێ، یاخوشك بەخوشك بێ، یاکچ بە خوشك بێن یاپوور بێ، یادایك

---

[١٧٥٨] اخرجه مسلم في النكاح، باب: تحريم نكاح الشفار و بطلانه ، رقم: ١٤١٥.

بەخوشك بێ، یاكچ بەكچە زاو كوڕەزا بێ هەروەها. بەلآم ئەگەر ژن بەژنەكە لەسەر ئەم شێوەیەی تر بێ كەئێستا باوە، ئەوە ژنبە ژنەكە دادەمەزرێ، چونكە بەدوو عەقدی صەحیح هەردوو ژنە، هەریەكەیان لەمێردەكەی خۆی مارە دەكرێ، وە مارەیی بۆ هەردوو ژنەكە دادەنرێ، وەتاڕادەیێ بەرژەوەندو ڕەزامەندیی هەردوو ژنەكە ڕەچاو دەكرێ. بەلآم لەگەڵ ئەمەیشە ژن بەژن زۆر باش نییە، گەلێ جاركێشەو بەرە دروست دەكا. (بڕوانە: فیقهی ئاسان، بەرگی/دووەم ل/٦٤١).

## باسی سیغەكردن، واتە: موتعە

١٧٥٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ وَسَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ رَضِيَ اللَّه عَنْهُمْ قَالَا: كُنَّا فِي جَيْشٍ فَأَتَانَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُمْ أَنْ تَسْتَمْتِعُوا فَاسْتَمْتِعُوا.(الحديثان:٥١١٧-٥١١٨)[١٧٥٩].

جابیری كوڕی عەبدوللآو سەلەمەی كوڕی ئەكوەع -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرموویان: لەناو سوپایەكا بووین، لەغەزایەكا فروستادەی پێغەمبەر -دروودی لەسەر- هات بۆ ناومان، فەرمووی: لەلایەنی پێغەمبەرەوە -دروودی خودای لەسەر بێ- ڕیگەی ژن سیغەكرنتان دراوە، دەتوانن‌و دروستە بۆتان كەژن سیغە بكەن). (تاج/٣ ز/٦٠ ل/١٤٧ ژ/١، ٢، ٣، ٤).

ڕوون كردنەوە:

ئەم بابەتی سیغە كردنە، كەپێشی دەگوترێ: مارە بڕینی كاتی، قسەی زۆری لەسەر كراوە، لەلای شیعەكان دروستە، وەبەزۆریش دەیكەن. بەلآم لەلای سوننیەكان: ژنهێنانی كاتی، ماوەیێ ڕەوا بووە، بەلآم دوایی پێغەمبەر- دروودی لەسەر- حەرام‌و نادروستی كردووە هەتا ڕۆژی قیامەت، وەهیچ

---

[١٧٥٩] أخرجه مسلم في النكاح، باب:نكاح المتعة وبيان أله أبيح، ثم نسخ... رقم: ١٤٠٥.

بایەخێ بەرای پێچەوانەی ئەم ڕایە نادرێ، لێرەدا شتێ هەیە حەز دەکەم روونی بکەمەوە: (لەسەرەتاوە وەك ئێستا ئەم فەرموودەو بڕیارە شەرعی یانە مەشهوورو زانراو نەبوون، بەڵکو پوختەو موجمەلێکیان لەبابەتی عیباداتو خواپەرستیو دروشمو شەعائیرەوە سەقامگیر بوونو بوون بەپێناسەو دروشمو جیاوەکەری ئایینی پیرۆزی ئیسلام، لەئایینەکانی تر. بەڵام هۆی زۆر هەبوو، بۆ دروستبوونی ڕای زۆر لەهەندێ بابەتی شەریعەتدا، کەئەو ڕاجیاجیا یانە، هەیان بوو لەیەکترەوە نزیك بوون، هەیان بوو بەپێچەوانەی یەکتری بوون، هەیان بوو تەواو کەری یەکتری بوون، یەکێ لەم هۆ سەرەکییانە ئەوە بوو: کەزۆرینەی کات وەفدو خەڵکی زۆرو زۆرینەی سەحابەکان، ناو بەناو بەخزمەت پێغەمبەر دەگەیشتن، وەزۆرینەی کات دادەبران لەپێغەمبەر وەئاگایان لەبڕیاری نوێ نەبوو، وە ئەو فەرموودەو بڕیارانەی کەلەو دانیشتنانەدا، لەپێغەمبەر دەبیست، کاریان پێ دەکردو فەتوایان پێ دەداو پەخشیان دەکردەوە، هەتا فەرمانێکی نوێ ی پێغەمبەریان لەو بارەیەوە دەبیست، کەتەعدیلی دەکرد، یانەسخی دەکردەوە، ئەوان بەردەوام بوون لەسەر ئەو بڕیارو فەرموودەو زانیاریانەی کەکاتی خۆی لەپێغەمبەریان وەرگرتبوو، جائەمەو زۆر هۆی تر بوون بەهۆی ئەم هەموو ڕاجیایی یە).

## ژن پێشکەش کردن بەپیاوی باش

١٧٦٠– عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ امْرَأَةً عَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ زَوِّجْنِيهَا فَقَالَ مَا عِنْدَكَ؟ قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ قَالَ: اذْهَبْ فَالْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لَا وَاللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا وَلَا خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي وَلَهَا نِصْفُهُ قَالَ سَهْلٌ: وَمَا لَهُ رِدَاءٌ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَمَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ

عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ مِنْهُ شَيْءٌ فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى إِذَا طَالَ مَجْلِسُهُ قَامَ فَرَآهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَعَاهُ أَوْ دُعِيَ لَهُ فَقَالَ لَهُ: مَاذَا مَعَكَ مِنْ الْقُرْآنِ؟ فَقَالَ: مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا لِسُوَرٍ يُعَدِّدُهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمْلَكْنَاكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنْ الْقُرْآنِ.(الحديث ٥١٢١ أطرافه في: ٢٣١٠، ٥٠٢٩، ٥٠٣٠، ٥٠٨٧، ٥١٢٦، ٥١٣٢، ٥١٣٥، ٥١٤١، ٥١٤٩، ٥١٥٠، ٥٨٧١، ٧٤١٧)[١٧٦٠].

ئەم فەرموودەیە لەتاجی پیرۆزدا ئاوەهایە: سەهلی کوڕی سەعد -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: ژنێك هاتەلای پێغەمبەر- دروودی لەسەر- گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هاتووم هەتا خۆم ببەخشم بەتۆ، پێغەمبەریش - دروودی خودای لەسەر بێ- سەرتاپا تەماشای کردو، ئەنجا سەری دانەواندو، هیچ قسەی نەکرد. ژنەکەیش کەزانی پێغەمبەر- دروودی لەسەر- هیچی نەگوت لەبارەیەوە دانیشت. جا پیاوێ- کەلەهاوڕێیانی پێغەمبەر بوو- هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر خۆت ناتەوێ لەمنی مارەبکە؟ فەرمووی : (ئایا هیچت هەیە کەبیکەی بەمارەیی؟ گوتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا! هیچم نییە کەبیکەم بەمارەیی. فەرمووی: ( دەبڕۆ بۆماڵەوە بۆ لای کەسوکارت بزانە هیچت دەست دەکەوێ کەبیکەی بەمارەیی) پیاوەکە ڕۆیشتو هاتەوە گوتی: بەخوا هیچم دەست نەکەوت، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دەشتێك پەیدا بکە بائەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ، بیکە بەمارەیی). پیاوەکە دیسان ڕۆیشتەوەو هاتەوەو گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! ئەنگوستیلەی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەڵام ئەم تاقە لۆ جلکەم هەیە، نیوەی بۆ من نیوەی بۆ ئەو لەباتی مارەیی؟

[١٧٦٠] اخرجه مسلم في النكاح، باب: الصداق وجواز كونه تعليم القرآن وخاتم حديد...، رقم: ١٤٢٥.

پێغەمبەر- دروودی لەسەر- فەرمووی: (ئەوە بەوچی، خۆی یەك پارچەیە، ئەگەر لەبەر تۆدا بێ، هیچی بەر ئەو ناکەوێ، ئەگەر لەبەر ئەودا بێ هیچی بەر تۆ ناکەوێ ).

جا پیاوێکە، تاوێکی باش دانیشت، لەپاشا هەڵسا ڕۆیشت، پێغەمبەر- دروودی لەسەر- چاوی لێ بوو، ناردی بەشوێنیدا، بانگی کردەوە، کەهات پێ ی فەرمووی: (چیت لەقورئان لەبەرە؟) گوتی: ئەو سوورەتەو ئەو سوورەتەم لەبەرە، وەسورەتەکانی ژمارد، فەرمووی: ( ئایا ئەم سوورەتانە هەموویان بەباشی لەبەر دەخوێنی؟) گوتی: بەڵێ. فەرمووی: ( دەبڕۆ ئەوا لەسەر ئەو قورئانەی کە لەبەرتە ئەم ژنەم کرد بەهی تۆ) .لەگێڕانەوەیەکدا: ( ئەوا لەسەر ئەوە کەفێری ئەو قورئانەی بکەی کەخۆت ئێستا لەبەرتە ئەم ژنەم مارە کرد لەتۆ! ). (تاج/٣ ز/٢٤ ل/٨١ ژ/١ ش/د/ت/ن -رەحمەتی خودا لەهەموویان بێت-).

لەگێڕانەوەی ئێرەدا ئەم ڕستەیەی پترە: (سەهل فەرمووی: پیاوەکە بەس ئەو بەرکۆشەی هەبوو، پەشتەماڵی سەرەوەی نەبوو کەبەعەرەبی پێ ی دەگوترێ: ریداء) بەبەرکۆشیش دەگوترێ: ئیزار. ئەمەیش لەدواوە گێڕانەوەکەی تاجول ئوصوول:

١٧٦٠- مكرر- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّه عَنْهُ أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ لِأَهَبَ لَكَ نَفْسِي فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَصَعَّدَ النَّظَرَ إِلَيْهَا وَصَوَّبَهُ ثُمَّ طَأْطَأَ رَأْسَهُ فَلَمَّا رَأَتْ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا فَقَالَ هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ فَقَالَ لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا قَالَ انْظُرْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي قَالَ سَهْلٌ مَا لَهُ رِدَاءٌ فَلَهَا نِصْفُهُ

فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ شَيْءٌ فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى طَالَ مَجْلِسُهُ ثُمَّ قَامَ فَرَآهُ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُوَلِّيًا فَأَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ فَلَمَّا جَاءَ قَالَ مَاذَا مَعَكَ مِنْ الْقُرْآنِ قَالَ مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا عَدَّهَا قَالَ أَتَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ قَالَ نَعَمْ قَالَ اذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنْ الْقُرْآنِ.(الحديث(٥٣٠) طرفه في: ١٧٦٠ تجريد = ٥١٢١ فتح)[١٧٦٠-م]. فەرمووی دەی پێش ئەم فەرموودەیە.

## وەلی - هەقدار

١٧٦١- عَنْ مَعْقِلُ بْنُ يَسَارٍ رَضِيَ اللّٰه عَنْهُ قَالَ: زَوَّجْتُ أُخْتًا لِي مِنْ رَجُلٍ فَطَلَّقَهَا حَتَّى إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهَا جَاءَ يَخْطُبُهَا فَقُلْتُ لَهُ زَوَّجْتُكَ وَفَرَشْتُكَ وَأَكْرَمْتُكَ فَطَلَّقْتَهَا ثُمَّ جِئْتَ تَخْطُبُهَا لَا وَاللّٰهِ لَا تَعُودُ إِلَيْكَ أَبَدًا وَكَانَ رَجُلًا لَا بَأْسَ بِهِ وَكَانَتْ الْمَرْأَةُ تُرِيدُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ فَأَنْزَلَ اللّٰهُ هَذِهِ الْآيَةَ: فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ. فَقُلْتُ: الْآنَ أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ فَزَوَّجَهَا إِيَّاهُ.(الحديث ٥١٣٠- أطرافه: ٤٥٢٩، ٥٣٣٠، ٥٣٣١)[١٧٦١].

مەعقیلی کوڕی یەسار-ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: خوشکێکم هەبوو، مارەییم بڕی لەپیاوێ، چوو بەرەڵای کرد، تەلاقی دا، لێ ی نەپرسییەوە هەتا حەیەی هەڵهاتو عیددەی بەسەر چوو، ئەوسا هات داوایکردەوە، منیش پێیم گوت: من خوشکەکەی خۆمم پێت دا، کردم بەنوێنو ژێرە خەرتو لەلای خۆی قەدرو ڕێزم لێ گرتی، کەچی تۆ چوویت بەپێچەوانەوە، تەلاقت داو بەرەڵایت کرد، ئێستایش هاتوویتەوە، دیسان خوازبێنی ی دەکەیتەوە لێم!

---

[١٧٦٠-م] راجع ١٧٦٠. -المترجم

[١٧٦١] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث معقل بن يسار في نزول (ولا تعضلو هن). فتح/٩ ص/٧٧٢ خاتمة كتاب التفسير. -المترجم

نابەخوا هەتا هەتایە نابێتەوە بەژنت لەراستیش دا پیاوەکە خراپ نەبوو، خوشکەکەی منیش کەناوی جومەیل بوو، دەیویست کە بگەڕێتەوە بۆ لای، جالەم نێوانەداو لەم هەڵو مەرجەدا ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ. (٢٣٢) سورة البقرة﴾. واتە: کاتێ ژنتان تەلاق دا وەعیددەیان تەواو بوو، وەمێردە کۆنەکانیان ویستیان بە پێ ی شەرعی خوا مارەیان بکەنەوە، ئێوە ئەی خاوەنانو هەقدارانی ئەو جۆرە ژنانە مەبن بەرێگر لەوە. ئیتر منیش گوتم: ئێستا ئەی پێغەمبەری خودا! خوای گەورە چۆن دەفەرموێ وادەکەم. فەرمووی: (ئیتر دووبارە براکەی لەسەر مارەیی یەکی تازە، مارەی بڕییەوە لەمێردە پێشینەکەی).

## هەقدار- وەلی- چ باوك بێ، چ کەسێ تر بێ، کچ یابێوە ژن نادات بەشوو، مەگەر بەئارەزووی خۆی

١٧٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا تُنْكَحُ الْأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ وَلَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: أَنْ تَسْكُتَ.(الحديث ٥١٣٧- طرفاه في :٦٩٤٩، ٩٧١)[١٧٦٢].

لەئەبو هوریرەوە- رەزای خودای لێ بێ – پێغەمبەر- دروودی لەسەر- دەفەرموێ: (بێوەژن نادرێ بەشوو، تا بەراشکاوی ڕای وەرنەگیرێ، کچیش نادرێ بەشوو، تا پرسو ڕای پێ نەکرێ!) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، کچان شەرمنن، لەروویان نایێ کەلەباسی وا بەروونی بدوێن، جا چۆن بزانین کەکچەکە قاییلە یانا؟ فەرمووی: (کەلەبەر شەرمو

[١٧٦٢] اخرجه مسلم في النكاح: باب استئذان الثيب في النكاح بالنطق،...، رقم: ١٤١٩.

شكۆ نەوەك لەبەر هۆیەکی تر، قسەی نەکرد، ئەوە مانای وایە کەڕازی یە).
(تاج/٣ ز/٣١ ل/٧٢ ژ/١).

**ڕاڤەو ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیەو کۆمەڵێ فەرموودەی تری ڕاستو دروست نیشانەو بەڵگەی ئەوەن کەژن، چ کچ بێ، چ بێوەژن، کاتێ دەدرێ بەشوو، دەبێ ڕەزای لەسەر شووکردنەکەی هەبێ، ئیتر ئەو ڕەزابوونو ڕێگە پێدانە، بەپێ ی ڕۆژ دەگۆڕێ، لەشەرعی پیرۆزدا کۆمەڵێك بڕیار هەیە بەپێ‌ێ کاتو سات دەگۆڕێ ئەم بابەتەیش لەو جۆرە بڕیارانەیە. من بەخودی خۆم، ئامادەی چەندین مارە بڕین بووم، بەشێوەی هەقدار، بەشێوەی شایەت، بەشێوەی مەلای مارە بڕ، بەشێوەی خزمی ریش سپی، لەکورد، لەعەرەب، لەتورکمان، لە سلێمانی، لەکەرکوك، لەبەغا، لەشوێنانی تر، لەکۆمەڵگای جۆراو جۆر، لەلادێو گوند، لەشارو شارۆچکە، لەخەڵکی بەدین، لەخەڵکی مەدەنی، کەپلەی هۆشیاریو زرنگیو ڕۆشنبیریی خەڵکەکەی بەرزونزمی پێوە دیار بێ.

جا لەپاش ئەم ڕێخۆشکردنە، ئەوەی کەڕەچاوم کردووەو لەلای هەموو کەسێ کەئاگای لەم بارودۆخە ناسکە بێ، ئەم دیاردە بەڵگە نەویستە یە، کەئەمە پوختەکەیەتی: (زۆرینەی کات، پەیوەندیدارانو عەلاقە مەندان، چ هەقدارو وەلی بن، چ ژنو مێردبن، چ شایەت بن، شەرمو شکۆ دەیانگرێ، سامیان لێ دەنیشێ، گەلێ جار وا دەپەشۆکێن، شپرزەیی یان پێوە دیارە، زۆر جار وادەشڵەژێن قسەکان تێکەڵو پێکەڵ دەکەن، باوکی کچەکە، یاکچەکە، یامێردەکە، زمانی تەتەڵە دەکا، دەمی دەلەرزێ، شەرمو سام وادەیگرێ تفی بۆ قووت نادرێ. جارێ من خۆم مەلای گرێدەری گرێبەندی مارەکردنەکە بووم، باوکی کچەکە کەپیاوێکی کامڵ بوو، پزیشك بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕەئیسی صیحەی شاری سلێمانی بوو مێردەکەیش پزیشك بوو، کچەکە دەرچووی کۆلێژ بوو، دایکی کچەکە خانمێکی شاژنی هۆشمەندی ژیرو سەلار بوو،

خوێنەوارێکی بەرز بوو، شایەتەکان کۆمەڵێ لەپیاو ماقووڵانی شارەکە بوون، کەناسیاو و دۆستی هەردوولا بوون. دەی باوکەکە واشەرم گرتبووی، زمانی گۆی نەدەکرد، قسەی بۆ نەدەکرا، هەروا کوڕو کچەکەش، تەنیا دایکی کچەکە نەشڵەژا، وەك ناوەندیێ ڕابەری ئەوانی دەکردو قسەکانی بۆ ڕاست دەکردنەوە، لەبەر ئەوە من کەهەستم بەم شڵۆقی هەڵوێستە کرد، ناچار بووم کەبە باوکی کچەکە بڵێم: تۆ من بکە بەوەکیل بۆ ئەم کارەو ئیتر هەقت نەبێ، ئەویش وایکرد! دەی برا! کەئەمە حاڵی دوکتۆرو ڕۆشنبیرانی سەدەی بیستەم بێ، لەکاتو ساتی وادا، ئیتر دەبێ حاڵی کچە دەوارنشینێکی کورد، یاعەرەب، یاهەر نەتەوەیەکی تر، لەگوندێکی لاڕێ، یالەکوێرە دێ یەك، یا لەدوورگەیەکی دوورە دەست، یالەزۆنگاوێ لەزۆنگاوەکانی خوارووی عیراق، لەمەوپێشو ئێستایشو لەمەودوایش چۆن بێ و چۆن بتوانێ کەوەك بولبول، بەگوساخی پڕ بەدەم هاوار بکاو بڵێ: من وادەکەم. ئەوەی کەلەم لایەنەوە پێویستە ئەوەیە: کەڕەزابوونی ژنو مێرد بەیەکتری مسۆگەر بێ، ئیتر دەربڕینو ئاشکراکردنی ئەم مەبەستە بەهەر شێوەیێ بێ دروستەو دەبێ. ئەوەی واناڵێ لەحاڵەکە حاڵی نییە یا نەیەوێ حاڵی ببێ.

١٧٦٣- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ الرَّبِيعِ بْنِ طَارِقٍ رَضِي اللَّه عَنْهُ قَالَ: أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ عَنْ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنْ أَبِي عَمْرٍو مَوْلَى عَائِشَةَ عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحِي؟ قَالَ: رِضَاهَا صَمْتُهَا.(الحديث ٥١٣٧ طرفاه في: ٦٩٤٩ - ٦٩٧١)[١٧٦٣].

عائیشە -ڕەزای خودای لێ بێ- عەرزی پێغەمبەر -دروودی لەسەر- دەکات:ئەی پێغەمبەری خودا! لەکاتێکچ بەشوودانا، کاتێ پرس و ڕاو ڕاوێژ بەکچ دەکرێ شەرم دەکا کەبەڕاشکاوی ڕەزابوونی خۆی دەربڕێو بڵێ: ئاشوو بەو پیاوە دەکەمو ڕازیم مارەم بکەن لێ ی، دەی لەبارودۆخی ئاوادا چار

[١٧٦٣] والحديث اخرجه مسلم في النكاح (العينى -ج/ ٢٠ ص١٢٩) -المترجم-

چـيـيه؟ فـهرمووى: (لـهكاتى ئـاوادا بـێ دەنگـى ى كـچەكە نيـشانەى ڕەزامەندييەتى).

## پياو كچى خۆى كەرەزامەنديى لەسەر نەبێ بدا بە شوو، بەشوودانەكەى پووچو بێ بايەخە

١٧٦٤ – عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الْأَنْصَارِيَّةِ رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْهـا أَنَّ أَبَاهَـا زَوَّجَهَـا وَهْيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذَلِكَ فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَـرَدَّ نِكَاحَهَـا. (الحديث ٥١٣٨ أطرا فه في: ٥١٣٩، ٦٩٤٥ ، ٦٩٦٩)[١٧٦٤].

خەنـساى كـچى خيـدام -كـەئافرەتێكى ئەنـصارى بـوو- فـەرمووى: بێـوەژن بـووم، بـاوكم دامـى بەشـوو، منـيش پـێم نـاخۆش بـوو، چـووم بـۆ خزمـەتى پێغەمبەر -دروودى لەسەر- ڕووداوەكەم حاڵى كرد، ئەويش مارەبڕينەكـەمى هەڵوەشاندەوە). (تاج/٣ ل/٧٣ ز/٣١ ز:٣).

ڕوونكردنەوە:

خەنـساء صـەحابييە بـووە، يـەك فـەرموودەى لـەبوخارى پـيرۆزدا هەيـە، كەئەم فەرموودەيەى ئێرەيە، بەلاَم لەسێ جێگەى تريش لەبوخاريدا دووبارە بۆتەوە، وەك لەئەطرافەكان دا ئاماژە بۆ ژمارەكانيان كراوە كەژمارە: (٥١٣٩) و (٦٩٤٥) و (٦٩٦٩) ن. كاتێ ئەم سكالاَيەى لەدەستى باوكى كرد، بێوەژن بووە، وە عـەرزى پێغەمبـەرى كـرد: ئـەى پێغەمبـەرى خـودا ! مـن پيـاوێكى تـر داواى كـردووم، وەدڵـم بەوەوەيـە، پێغەمبـەريش كەمارەبڕينەكـەى هەڵوەشـاندەوە، بەباوكەكەى ى فـەرموو: (الحقها بهواها: دڵـى بـە كێوەيـە بيدە بـەوە). ئـيتر باوكيشى بەدڵى ئەوى كرد.

---

[١٧٦٤] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث خنساء بنت خدام في تزويجها (فتح الباري- خاتمة كباب النكاح ص٤٣٢). – المترجم

## خوازبێنی لەسەر خوازبێنی نادروستە

١٧٦٥ – عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قال: نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَبِيعُ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَلَا يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَتْرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ أَو يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ.(الحديث ٥١٤٢ أطرافه في: ٢١٣٩ ، ٢١٤٠ ، ٢١٤٨ ، ٢١٥٠ ، ٢١٥١ ، ٢١٦٠ ، ٢١٦٢، ٢١٦٥ ، ٢٧٢٣ ، ٢٧٢٧، ٥١٤٤، ٥١٥٢، ٦٦٠١)[١٧٦٥].

ئیبنو عومەر –ڕەزای خودایان لێ بێ– فەرمووی: سەودا لەسەر سەودای برای ئایینی خۆتان مەکەن، هەروەها خوازبێنیش لەسەر خوازبێنی ی برای ئایینی خۆتان مەکەن، مەگەر خوازبێنی کاری پێش ئەو وازی هێنابێ، یا ئەو ڕێگەتان پێ بدا) . (تاج/٢ ز:١٥٢ ژ/٧ + تاج/٣ ز/٢٦ ژ/٥ ل/٦١) مامۆستای عەینی لەعمدە القاریو دا، لەروونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (وشەی برا لەم فەرمودەیەدا، ئەم سێ جۆرە برایە دەگرێتەوە: برای خوێنی- واتە: برای نەسەبی - وبرای ئایینیو برای شیریی).

برای خوێنی موسڵمانو ناموسوڵمانی هەیە، برای شیریش هەروەها، برای ئایینیش خوێنیو شیری و بیانی هەیە، لەم جۆرە بابەتانەدا، کەلەم جۆرە فەرموودانەدا باسکراون، کڕینو فرۆشتنو خوازبێنیو برا، نمونەن. قەیدو مەرج نین، بۆ زیادە ڕوونکردنەوەن، ڕوونترین نمونەن لەبابەتەکەدا، کەلەزاراودا پێی دەگوترێ : (أظهر مثال). کەواتە هەموو مامەڵەو سەودایەك بەسەر مامەڵەو سەودای برای خۆت نادروستە یابەسەر مامەڵەو سەودای خوشکی خۆت نادروستە، وەك: ڕەهن بەسەر ڕەهن، یاسەلەم بەسەر سەلەم، یاقیراض بەسەر قیراض، یاهاوبەشی بەسەر هاوبەشی، یاکەسێ خوشکی خۆی

---

[١٧٦٥] اخرجه مسلم في النكاح، باب: تحريم الخطبة على خطبة أخيه .. رقم:١٤١٢.

پێشکەش بکا بەپیاوێکی باش، کەسێکی تریش پێشبڕی لێ بکاو، بەسەر ئەو خوشکی خۆی، یا کچی خۆی پێشکەش بکابەو پیاوە باشە، وەزۆرشتی تری لەم چەشنە بابەتانە، وەهەروەها خوشك لەگەڵ خوشکا.

## ئەو مەرجانەی لەهاوسەرگرتن دا نا دروستن

١٧٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تَسْأَلُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا.(الحديث ٥١٥٢- أطرافه في: ٩٦٩ تجريد= ٢١٤٠ ، ٢١٤٨ ، ٢١٥٠ ، ٥١٥١ ، ٢١٦٠ ، ٢١٦٢ ، ٢٧٢٣ ، ٢٧٢٧ ، ٥١٤٤ ، ٦٦٠١ بەرگی/ ٣ل- ٤٢)[١٧٦٦].

**راڤەو روونکردنەوە:**

لێرەدا، لەکۆتاوە دەفەرموێ : (ئەو ژنە ئەگەر هەوڵی وایش بدا، ئەگەر چارەنووسی خوایی لەسەر نەبێ مەبەستەکەی نایەتەجێ، کەواتە: باهەوڵی بێ هوودە نەداو، خۆی تەسلیمی چارەنووسی ی خوایی بکا). زاناکان دەفەرموون: مەبەست لەخوشك لەم فەرموودەیەدا ئەم چوار جۆرەیە:

١- خوشکی خوێنی.

٢- خوشکی شیریی.

٣- خوشکی ئاینی.

٤- خوشکی ناموسڵمانن چونکە ئەویش خوشکێتی لەئادەمیزادیدا ئیبنو عەبدولبەر -رەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: بەپێ ی ئەم فەرموودەیە دروست نییە کەهەوێ داوا لەمێردەکەی بکا، کەهەوێکەی تەلاق بدا، هەتا هەرخۆی بەتەنها ژنی بێت.

---

[١٧٦٦] راجع رقم/٩٦٩ - بەرگی/٣ ل/٤٢. - المترجم.

## ژنان ژن دەبەن بەبووکی بۆ مێردەکەی‌و دووعای پیت‌و فەریان بۆ دەکەن

١٧٦٧ - عَنْ عَائِشَةَ رَضِي الله عَنْها أَنَّهَا زَفَّتْ امْرَأَةً إِلَى رَجُلٍ مِنْ الْأَنْصَارِ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا عَائِشَةُ مَا كَانَ مَعَكُمْ لَهْوٌ؟ فَإِنَّ الْأَنْصَارَ يُعْجِبُهُمْ اللَّهْوُ.(الحديث ٥١٦٢)[١٧٦٧].

عائیشه -رەزای خودای لێ بێ- فەرموی: ژنێکم گواستەوە بۆ پیاوێکی ئەنصاری، پێغەمبەر- دروودی لەسەر - فەرمووی: (عائیشە! ئایا هیچ بەزم‌و شادییەکتان نەگێڕا؟ چونکە یاریدەدەران (ئەنصار) حەزیان لەبەزم‌و شادیی هەیە). (تاج/٣ ل/٨٦ ز/٣٧).

## نزای کاتی دروستبوون لەگەڵ حەڵاڵ و هاوسەردا

١٧٦٨- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي الله عَنْهُما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَمَا لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ يَقُولُ حِينَ يَأْتِي أَهْلَهُ: بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنِي الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، ثُمَّ قُدِّرَ بَيْنَهُمَا فِي ذَلِكَ أَوْ قُضِيَ وَلَدٌ لَمْ يَضُرُّهُ الشَّيْطَانُ أَبَداً.(الحديث ٥١٦٥ أطرافه في : ١٤١، ٣٢٧١، ٣٢٨٣، ٦٣٨٨، ٧٣٩٦)[١٧٦٨].

ئیبنو عەبباس -رەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر- دروودی لەسەر- دەفەرموێ : (کاتێ یەکێ لەئێوە دەیەوێ بڕواتە لای خێزانی خۆی، ئەگەر بڵێ: باسم الله ...مارزقتنا:

---

[١٧٦٧] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عائشة: (فإن الأنصار يعجبهم اللهو...). (فتح/١٠ ص/٤٣٢ - خاتمة كتاب النكاح). -المترجم-

[١٧٦٨] اخرجه مسلم في النكاح، باب: ما يستحب أن يقوله عند الجماع، رقم/١٤٣٤.

بەناوی خودا، ئەی خودا! شەیتانمان لەکۆڵ بکەرەوەوشەیتان دووربخەرەوە لەم رزق‌و رۆژیی خۆتە کەداوتە بەئێمە. هەر کەسەتان لەو کاتەدا ئاوابڵێ، ئەگەر لەو جارەدا منداڵ لەچارەیان نووسرابێ، هەرگیز شەیتان زیانی بۆی نابێ). (تاج/٣ ز/٤٣ ل/٩٧ ژ/١).

## شایی‌و مەڕ سەربڕین لەشایی دا

١٧٦٩ – عَنْ أَنَسٍ رَضِي اللَّه عَنْهُ قَالَ: مَا أَوْلَمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ نِسَائِهِ مَا أَوْ لَمَ عَلَى زَيْنَبَ: أَوْ لَمَ بِشَاةٍ.(الحديث ٥١٦٨– أطرافه في: ٤٧٩١، ٤٧٩٢، ٤٧٩٣، ٤٧٩٤، ٥١٥٤، ٥١٦٣، ٥١٦٦، ٥١٧٠، ٥١٧١، ٥٤٦٦، ٦٢٣٨، ٦٢٣٩، ٦٢٧١، ٧٤٢١)[١٧٦٩].

ئەنەس- رەزای خودای لێ بێ – فەرمووی: نەم دیوە کە پێغەمبەر- درووردی لەسەر – بۆ کەسی تر لەژنەکانی، نانی شایی دروست بکا، وەك ئەو نانەی کەبۆ شایی یەکەی زەینەبی ژنی دروستی کردبوو: مەڕێکی کوشتەوەو کردی بەنانی شایی بۆی. (تاج/٣ ز/٤٠ ل/٩٤ فەرموودەی ژمارە/٤ - ش/د).

١٧٧٠– عضنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةِ رَضِي اللَّه عَنها قَالَتْ: أَوْ لَمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى بَعض نِسَائِهِ بِمُدَّيْنِ مِنْ شَعِيرٍ.(الحديث ٥١٧٢)[١٧٧٠].

سەفییەی کچی شەیبە -رەحمەتی خودای لێ بێ– فەرمووی: پێغەمبەر- درووردی خودای لێ بێ– بۆ یەکێ لەژنەکانی خۆی ، دوو موودد جۆی کرد بەنانی شایی. دوو موودد دەکاتە نیومەن، واتە: نیو صاع) سەفییە سەحابییە نییە، ئەم فەرموودەیەی مورسەلە.

---

[١٧٦٩] اخرجه مسلم في النكاح، باب زواج زينب- ونزول الحجاب..رقم/١٤٢٨.

[١٧٧٠] لم يوافقه مسلم على حديث صفية بنت شيبة في الوليمة (فتح الباري.ج/١٠ ص٤٣٢- خاتمة كتاب النكاح). -المترجم

١٧٧١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْوَلِيمَةِ فَلْيَأْتِهَا.(الحديث ٥١٧٣- طرفه في: ٥١٧٩)[١٧٧١].

عەبدوڵلای کوڕی عومەر -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر – دروودی خودای لێ بێ– فەرمووی: (کاتێ کەسێکتان خوڵك کرا بۆ سەر نانی شایی بابچێت).

## ئامۆژگاری خێر دەربارەی ژنان

١٧٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِي جَارَهُ. (الحديث ٥١٨٥ – أطرافه في: ٦٠١٨، ٦١٣٦، ٦١٣٨، ٦٤٧٥).

و اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْراً فَإِنَّهُنَّ خُلِقْنَ مِنْ ضِلْعٍ وإِنَّ اعوجَ شيءٍ في الضِلع أَعْلاهُ فإِنْ ذَهَبْتَ تُقِمُهُ كَسَرْتَهُ، وَ إِنْ تَرَكْتَهُ لم يزل أعوجَ فَاسْتَوْصَوْا بالنساءِ خيراً). (الحديث ٥١٨٦- طرفاه في : ٣٣٣١، ٥١٨٤)[١٧٧٢].

ئەبو هوریرە -ڕەزای خودای لێ بێ– لەحەزرەتەوە -دروودی خودای لێ بێ – دەفەرموێ: هەرکەسێ باوەڕی تەواوی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەبێ، نابێ ئازاری دراوسێی خۆی بدا، ئامۆژگاری بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنان، چونکە ژنان، لەبنەڕەتەوە، لەپەراسووی باوە ئادەم دروست کراون، چونکە دایە حەوا لەپەراسووی چەپی باوە حەوا (واتە: باوە ئادەم) دروست کراوە، لەلارترین شوێنی پەراسوو کەنووکە کەیەتی دروست کراوە، واتە : بەسروشت بەچەوتیو بەلاری و خواری دروست کراون، جائەگەر بتەوێ راستی بکەیتەوە

---

[١٧٧١] اخرجه مسلم في النكاح، باب: الأمر باجابة الداعي الى دعوة ، رقم: ١٤٢٩.

[١٧٧٢] اخرجه مسلم في الرضاع، باب الوصية بالنساء، رقم: ١٤٦٨.

راست نابێتەوە، بەڵام دەشكێ، ئەگەر دەستیشی لێ نەدەی ئەوا بەلاری دەمێنێتەوە، هەرچۆنێ بێ بوونی لەنەبوونی باشترە، كەوابوو، با ڕاسپێریو وەسێت بێ لێتان زۆر باش بن بۆ ژنان) لەگێڕانەوەیەكی تاجول ئوصول دا دەفەرموێ: (ژن لەپەراسوو دروست كراوەو چەوتییەكەی بەشێكە لەسروشتیو تێكلاوی خوێنو بیرو هۆشی بووە، جا لەبەر ئەوە تاسەر لەسەر یەك بار نامێنێ و زوو زوو دەگوڕێ و بەسروشت حول حولی یەو لەمەدا تارادەیی بیانووی هەیە، جالەسەر ئەم بنیاتەئەگەر دەتەوێ لەگەڵیا ڕابوێری، ئەوا دەبێ بەپێ ی سروشتەكەی بەلاریو خواری رابوێری لەگەڵی دا، ئەگینائەگەر بتەوێ ڕاستی بكەیتەوە، ئەوسا لەگەڵی ڕابوێری، ئەوە بەتۆ راست نابێتەوە، بەڵكو لەدەستتا دەشكێ، شكاندنەكەیشی بریتیە لەبەرەلا كردنیو تەلاق دانی، ئەوەیش بەپێچەوانەی مەبەستە). (تاج/٣ ز/٤٧ ل/١١٦ ژ/١-ش/تیرمیزی) + (ریاض/١ ل/٢٣٦ ز/٣٤ ژ/٢٧٣).

**ڕاڤەو ڕوونكردنەوە:**

مەبەست لەم جۆرە فەرموودانە تانەو تەشەر نییە لەژن، وەك هەندێ مرۆڤی گێلۆكە والێ ی تێ دەگەن، بەڵكو بەپێچەوانەوە مەبەست ڕوونكردنەوەی پێكهاتەی جەستەییو دەروونی ژنە، بەپێ ی سروشتی خودایی، هەتا تەكلیفی مالایطاقی لێ نەكرێو، ئەركێكی نەخرێتە سەر شان، كەلەتوانای دا نەبێ، كاری خودایش بێ دانایی نییە، دیارە كەئافرەتی لەسەر ئەو شێوە كەچو خوارە دروست كردووە، سوودی خۆیو سوودی پیاویشی واتیادا، نابینی خودی پەراسوو چەماوەو لارە، ئەگەر راستو ڕەوان بوایە وەك دووخ، ڕۆڵی خۆی نەدەبینی، قەفەزەی سینگ دروست نەدەبوو، كەشوورایەكی قاییمە بۆ هەموو ئەندامە هەناوییەكانی مرۆڤ وەك دڵو جەرگو سییو گورچیلەو ڕیخۆڵەو سپڵ.

## داستانی ئوم زرع

١٧٧٣- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنها زوج النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَـتْ: جَلَسَ إِحْدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً فَتَعَاهَدْنَ وَتَعَاقَدْنَ أَنْ لَا يَكْتُمْنَ مِنْ أَخْبَارِ أَزْوَاجِهِنَّ شَيْئًا. قَالَتْ الْأُولَى زَوْجِي لَحْمُ جَمَلٍ غَثٌ عَلَى رَأْسِ جَبَلٍ لَا سَهْلٍ فَيُرْتَقَى وَلَا سَمِينٍ فَيُنْتَقلُ، قَالَتْ الثَّانِيَةُ: زَوْجِي لَا أَبُثُّ خَبَرَهُ إِنِّي أَخَافُ أَنْ لَا أَذَرَهُ إِنْ أَذْكُرْهُ أَذْكُرْ عُجَرَهُ وَبُجَرَهُ قَالَتْ الثَّالِثَةُ: زَوْجِي الْعَشَنَّقُ إِنْ أَنْطِقْ أُطَلَّقْ وَإِنْ أَسْكُتْ أُعَلَّقْ قَالَتْ الرَّابِعَةُ: زَوْجِي كَلَيْلِ تِهَامَةَ لَا حَرٌّ وَلَا قُرٌّ وَلَا مَخَافَةَ وَلَا سَآمَةَ قَالَتْ الْخَامِسَةُ: زَوْجِي إِنْ دَخَلَ فَهِدَ وَإِنْ خَرَجَ أَسِدَ وَلَا يَسْأَلُ عَمَّا عَهِدَ قَالَتْ السَّادِسَةُ: زَوْجِي إِنْ أَكَلَ لَفَّ وَإِنْ شَرِبَ اشْتَفَّ وَإِنْ اضْطَجَعَ الْتَفَّ وَلَا يُولِجُ الْكَفَّ لِيَعْلَمَ الْبَثَّ قَالَتْ السَّابِعَةُ: زَوْجِي غَيَايَاءُ أَوْ عَيَايَاءُ طَبَاقَاءُ كُلُّ دَاءٍ لَهُ دَاءٌ شَجَّكِ أَوْ فَلَّكِ أَوْ جَمَعَ كُلًّا لَكِ قَالَتْ الثَّامِنَةُ زَوْجِي الْمَسُّ مَسُّ أَرْنَبٍ وَالرِّيحُ رِيحُ زَرْنَبٍ قَالَتْ التَّاسِعَةُ: زَوْجِي رَفِيعُ الْعِمَادِ طَوِيلُ النِّجَادِ عَظِيمُ الرَّمَادِ قَرِيبُ الْبَيْتِ مِنْ النَّادِ قَالَتْ الْعَاشِرَةُ: زَوْجِي مَالِكٌ وَمَا مَالِكٌ مَالِكٌ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكَ لَهُ إِبِلٌ كَثِيرَاتُ الْمَبَارِكِ قَلِيلَاتُ الْمَسَارِحِ وَإِذَا سَمِعْنَ صَوْتَ الْمِزْهَرِ أَيْقَنَّ أَنَّهُنَّ هَوَالِكُ قَالَتْ الْحَادِيَةُ عَشْرَةَ: زَوْجِي أَبُو زَرْعٍ وَمَا أَبُو زَرْعٍ أَنَاسَ مِنْ حُلِيٍّ أُذُنَيَّ وَمَلَأَ مِنْ شَحْمٍ عَضُدَيَّ وَبَجَّحَنِي فَبَجِحَتْ إِلَيَّ نَفْسِي وَجَدَنِي فِي أَهْلِ غُنَيْمَةٍ بِشِقٍّ فَجَعَلَنِي فِي أَهْلِ صَهِيلٍ وَأَطِيطٍ وَدَائِسٍ وَمُنَقٍّ فَعِنْدَهُ أَقُولُ فَلَا أُقَبَّحُ وَأَرْقُدُ فَأَتَصَبَّحُ وَأَشْرَبُ فَأَتَقَنَّحُ، أُمُّ أَبِي زَرْعٍ فَمَا أُمُّ أَبِي زَرْعٍ عُكُومُهَا رَدَاحٌ وَبَيْتُهَا فَسَاحٌ، ابْنُ أَبِي زَرْعٍ فَمَا ابْنُ أَبِي زَرْعٍ مَضْجَعُهُ كَمَسَلِّ شَطْبَةٍ وَيُشْبِعُهُ ذِرَاعُ الْجَفْرَةِ، بِنْتُ أَبِي زَرْعٍ فَمَا بِنْتُ أَبِي زَرْعٍ، طَوْعُ أَبِيهَا، وَطَوْعُ أُمِّهَا، وَمِلْءُ كِسَائِهَا وَغَيْظُ جَارَتِهَا، جَارِيَةُ أَبِي زَرْعٍ، فَمَا جَارِيَةُ أَبِي زَرْعٍ لَا تَبُثُّ حَدِيثَنَا تَبْثِيثًا وَلَا تُنَقِّثُ مِيرَتَنَا تَنْقِيثًا وَلَا تَمْلَأُ بَيْتَنَا تَعْشِيشًا قَالَتْ: خَرَجَ أَبُو زَرْعٍ وَالْأَوْطَابُ تُمْخَضُ. فَلَقِيَ امْرَأَةً مَعَهَا وَلَدَانِ لَهَا كَالْفَهْدَيْنِ يَلْعَبَانِ مِنْ تَحْتِ خَصْرِهَا، بِرُمَّانَتَيْنِ، فَطَلَّقَنِي، وَنَكَحَهَا، فَنَكَحْتُ بَعْدَهُ رَجُلًا سَرِيًّا رَكِبَ شَرِيًّا وَأَخَذَ خَطِّيًّا وَأَرَاحَ عَلَيَّ نَعَمًا ثَرِيًّا وَأَعْطَانِي مِنْ كُلِّ رَائِحَةٍ زَوْجاً وَقَالَ كُلِي أُمَّ زَرْعٍ. وَمِيرِي أَهْلَكِ. قَالَتْ:

فَلَوْ جَمَعْتُ كُلَّ شَيْءٍ أَعْطَانِيهِ مَا بَلَغَ أَصْغَرَ آنِيَةِ أَبِي زَرْعٍ قَالَتْ عَائِشَةُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كُنْتُ لَكِ كَأَبِي زَرْعٍ لِأُمِّ زَرْعٍ.(الحديث ٥١٨٩)[١٧٧٣].

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر- دروودی خودا لەسەر پێغەمەرو ڕەزای خودا لەوبێ – فەرمووی: یازدە ژن کۆڕی قسەی لێ دەبەستن، وەبەڵێن بەیەکتری دەدەن و، پەیمان دەبەستن کەهیچ شتێ لەدەنگوباسی مێردەکانیان نەشارنەوە، ژنی یەکەمیان دەڵێ: مێردەکەی من گۆشتەلەڕکی وشترە لەڕە، وابەسەر لووتکەی شاخێکی سەختەوە،نەشاخەکە سەرکەوتنی ئاسانەو، نەگۆشتەکەش ئەوەندە باش و قەڵەوە، تاکەسێ بچێ بۆی و بیبات بۆ خۆی. واتە: هەم ڕژدو چرووکەو هەم چەمووش و بەدخووە. دوەمیان دەڵێ: هەواڵی مێردەکەم بڵاو ناکەمەوە، چونکە ناوێرم ناوی بەرم، ئەگینا شەن و کەوی دەکەم و ناوی دەزڕێنم! واتە: نەنگی زۆرە، کەم نەنگ هەیە کەتیا نەبێ. سێیەمیان دەڵێ: مێردەکەی من فووچێکی ناقولای نەگریسە، ئەگەر نقە بکەم تەڵاقم دەدا، ئەگەر نقەیش ناکەم ئەوا وەك بێوەژن بەسراوەمەتەوە، نەخۆی بەمێرد دەچێ و، نەبەرەڵاشم دەکا. تابۆ خۆم شوویەکی تر بکەم بۆ خۆم. چوارەمیان دەڵێ: مێردەکەی من وەك شەوی تیهامە فێنك و خۆشە، نەساردەو نە گەرمە، بەبێ ترس و بەبێ بێزاریی، دوو بەدوو بۆ خۆمان رادەبوێرین. پێنجەمیان دەڵێ: مێردەکەی من لەماڵەوە وێزە، هەردەکاو دەخەوێ و لەدەرەوە شێرەو ئازایەو چاو تێرەو لەشتی ناوماڵ ناپرسێتەوە!

شەشەمیان دەڵێ: مێردەکەی من بۆ خواردن لرفەی لێ دێ و لەکاتی خواردنەوەدا بەشی کەس ناداو، کەدەخەوێ خۆی گرمۆڵە دەداو، دەس ناگێرێ تالەپەژارەی دڵ تێ بگا! واتە: زۆر خۆرو بەدفەڕو ڕژدو دزکردنە! ژنی حەوتەمیان دەڵێ: مێردەکەی من دزێکی ئێسك قورسی دژ پەڕینە، لاژگ و

---

[١٧٧٣] أخرجه مسلم في فضائل الصحابة. باب ذكر حديث ام زرع...رقم: ٢٤٤٨.

گەوج و گێلە، هەموو دەردێ بۆ ئەو دەردەو دەردە دارەو دەغـەزارەو دەردنییـە کەتووشی نەبووبێ! لەگەڵ ئەوەیشا هەروا بەئاسانی لەدەستی رزگارت نابێ، یاسەرت دەشکێنێ، یاشوێنێکت دەقرنجێنێ، یاتووشی چورتومێکی گەورەت دەکا!

ژنی هەشتەمیان دەڵێ: مێردەکەی من نەرم و نۆڵە وەك کەروێشك، بۆنی خۆشە وەك زەعفەران. ژنی نۆ هەمیان دەڵێ: مێردەکەی من خانەدان و نانبدەو جەوانمەرد و بالا بەرز و شۆخ و شەنگەو، ئالای بەخشندەیی لێ هەڵکردووەو خانەی نزیکی یانەیەو، سەردارو ئازاو میوانپەروەرو هۆشمەندە!

ژنی دەهەمیان دەڵێ: مالیکی مێردی من چۆن مالیکێکە! گەڵێ لەم پیاوانەی کەئێوە دەڵێن باشترە، وشترو پەچە وشتری زۆرە، بەڵام پاوان و پاکژی کەمە، چونکە بۆ سەربڕینی راگرتوون، نەوەك بۆ بەخێو کردن، کەوشترەکان دەنگی کەمانچە دەبیستن دەزانن کەوا سەریان دەبڕن بۆ میوانی نوێ!

ژنی یازدەهەم دەڵێ: ئەبو زەرعی مێردی من چۆن ئەبو زەرعێکە! هەردوو گوێچکەی پڕ کردووم لەگوارەو خشڵ، وەبازووی پڕ کردووم لە گۆشت و بەز، ئەوەندە نازی لێ گرتووم و ئەوەندە نازی کێشاوم تا نازدارو نازەنین بووم، لەناوخێزانێکی هەژاری مەردار دابووم، لە پەنا یەکابووین، ئەو هێنامیەناو خێزانێکی تێرو پڕی دەوڵەمەندی داراوە، کەبەچەندان ڕەوگ و ڕانە وشترو گاگەل و خەلەو خەرمان و مشتاخیان هەبوو، کەقسەم دەکرد لەگەڵیا کەسنەیدەدایەوە بەدەمما، بەشەو کەدەخەوتم لەباوەشیا، تابەیانی لەخەو هەڵ نەدەسام، چونکە کارەکەرو نۆکەری زۆرم هەبوو، ئەوان ئیشی ناوماڵیان دەکرد، وەهەتا دەمتوانی لەجۆرەها شەرابی نایاب دەمخواردەوە.

دایکە ئەبوزەرع، کەخەسووم بوو، چۆن ژنێکی شاهانەبوو، چۆن خان و مانی بوو، خورجەکانی هەمیشە پڕبوون و هەم قەبەو هەم کەشخە بوون و

هەمووكاتێ پڕ بوون لە گەوهەرو زێڕو زیوو جلی ئالآو والآ، وەماڵەكەی پان‌و پۆڕ بوو، وە بۆ هیچ شتێ دانە دەما! كوڕەكەی ئەبو زەرع چۆن كوڕێك بوو! كەڵەگەت و ناو قەد باریك، پاكخۆرو كەمخۆر، بەژن‌و باڵای ئەوەندە ڕێك‌و شووشو قەڵەمی بوو، لەشوێن تلیشی پەلكە خورما یەكا جێگەی دەبۆوە، لەبەر كەمخۆری لەدەستی كار ژەلەیی لەبەری دەمایەوە!

كچەكەی ئەبو زەررع چۆن كچێك بوو! گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرو كارمەند بوو، لەفەرمانی باوك‌و دایكی دەر نەدەچوو، بۆ جوانی وێنەی نەبوو، خرپنەو خڕو خەپان‌و خەپەتۆڵە بوو، لەبەر شۆخ‌و شەنگی‌و ناسك‌و نازداری‌و داوێن پاكی هەوێكەی ڕقەی لێ دەكێشاو، بوو بوو بەچقڵی چاوی ناحەزی!

كەنیزەكەكەی ئەبو زەرع چۆن كەنیزەكێك بوو!! نەقسەمانی دەبردە دەرەوەو، نەئازووقەو دانەوێڵەی دەپژاندین‌و، نەناومالی پڕ دەكردین لەپووشكەو پەلآش، زمانپاك‌و دلسۆزو پاك‌و تەمیزو ئیش جوان بوو، ئوم زەرع گوتی: مەشكە دەژەندرا، كات گەرمەی بەهار بوو، بەهارێكی خۆش، ڕۆژێ ئەبوو زەرع دەرچوو بۆ دەرەوە، تووشی ئافرەتێ دەبێ، دوو كوڕی خۆی بەبەرەوە دەبێ، وەك دوو بەچكە وێز، مەمكەكانی دایكیان دەمژن، كەوەك دوو هەنار وادەبن، خڕو نەرم‌و نۆڵ‌و پڕ بەدەست دەبن، ئیتر ئەبو زەرع منی تەلآق داو، ئەوی مارە كرد، بەهیوای ئەوەی كەمناڵی وەجاخزادەی لێببێ، وەك ئەو دوو مناڵە كەلەبەچكە وێزیان دەكرد! ئەنجامنیش- لەدوا ئەو-شوومكرد بەپیاوێكی خانەدانی داراو دەوڵەمەند، سواری ئەسپێكی نایابی خۆشڕەو بوو، وەڕمێكی چاكی هەلگرت، وەسەر لەئێوارێ ئاژەڵێكی بێ شوماری هێنایە وە بۆم، وە لەهەموو چەشنێ سەروجووتی داپێم، وەگوتی: ئەی ئوم زەرع! لەهیچ دەست مەگرەوە، نەلەخۆت‌و نەلەكەس‌و كارت.

ئوم زەرع گوتی: بەلأم ئەم هەموو نازو نیعمەتەی ئەم مێردە تازەیەم، نادات لەگوێچکەیی نانی ئەبو زەرع!!چ جای ئەو هەموو خێرو بێرەی کەهەی بوو.

عائیشە -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرمووم: (ئەی عائیشە! ئەبو زەرع چۆن بوو بۆ ئوم زەرع، منیش بۆ تۆ وام، بەلأم لەناز گرتن و قەدر زانین دا ، نەوەك لەجیا بوونەوەو تەلأق دان دا) . (تاج/٣ ز/٤٩ ل/١٢١ ژ/١ - ش/ن).

**رافەو شیکردنەوە:**

لەم فەرموودەدا: ڕێز گرتنی ژن دیاریکراوە، وەگوزەرانی خۆش لەگەڵیدا زۆر پەسەندە، فەرمانکراوە بەحوسنی موعاشەرەی، وەزۆر لەڕەفتاری بەرزی مێرد لەگەڵ هاوسەریدا دیاری کراوە، وەئەم جۆرە بڕیارانەشی لێ وەردەگیرێ:

١- تەمثیل و نمایش و شانۆگەری دروستن، بەمەرجێ لەپەردەی شەرم و شکۆدەرنەچن و سودو بەرژەوەندی کۆمەڵیان تیادا بێ، تەنانەت دروستە ڕۆمان و چیرۆك و حیکایاتی دەستهەڵبەست بۆ ئەم جۆرە شتانە دابنرێن و داستان و سەر گوزەشتەی نەتەوە پێشینەکان بکرێن بەسەر مەشق و نمونەو چاویان لێ بکرێ و بکرێن بەفلیم و ڕۆمان و شتی واو پەخش بکرێنەوە، دارشتنی گفتوگۆ لەم بوارەدا دانانرێ بەدرۆ.

٢- گفتوگۆی خۆش و گالتەو سوعبەت و قسەی نەستەق کردن و قسەی ڕەوا، بەهەر شێوەیی بێ، دروستەو هیچی تیا بەستە نییە.

٣- واپەسەندە قسەو گفتوگۆو گێڕانەوەو ئاخاوتن بەوشەی ناسك و ڕستەی دڵ و هەست بزوێن و بەقسەی نەستەق و بەپەندی بەرزی ڕەوان و بەدەربڕینی جوانی پڕ لەڕەوانبێژی بڕازێنرێنەوە، بەسەجع و هاوسەروایی جوان بنەخشێنرێن.

٤- چەند بڕگەیێ لەفەرمایشتەکانی مامۆستای عەسقەلانی، بەعەرەبی، سەبارەت بەسوودو بەهرەی ئەم فەرموودەیە، لەپاشەوە، راگوێز دەکەین، بۆ پشتیوانی ئەم خالآنەی پێشەوە: دەفەرموێ: (في هذا الحديث من الفوائد: حسن عشرة المرء أهله و المحادثة بالأمور المباحة، و فيه المزح احيانا و بسط النفس، و فيه الحديث عن الأمم الخالية و ضَرْبُ الامثال بهم اعتبارا، و جواز الانبساط بذكر طرف الاخبار و مستطابات النوادر و تنشيطا للنفوس، و جواز المبالغة، و فيه جواز التأسي بأهل الفضل من كل امة.. و فيه جواز الكلام بالألفاظ الغريبة و استعمال السجع.. وفي كلامهن من فنون التشبيه و الاستعارة و الكناية و الموازنة و الترصيع و الإشارة و ضرب المثل و الله يمن على من يشاء بما شاء..).

٥- ئەم کۆمەڵە ژنە لەنەتەوەکانی پێش ئیسلام بوون.

## بەبێ فەرمانی مێرد نابێ هاموشۆی ژنی مێرددار بکرێ

١٧٧٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ وَلَا تَأْذَنَ فِي بَيْتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ وَمَا أَنْفَقَتْ مِنْ نَفَقَةٍ عَنْ غَيْرِ أَمْرِهِ فَإِنَّهُ يُؤَدَّى إِلَيْهِ شَطْرُهُ.(الحديث ٥١٥٩- أطرافه في : ٢٠٦٦، ٥٣٦٠،٥١٩٢)[١٧٧٤].

ئەبو هوریرە -رەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر- دروودی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (دروست نییە کەژن رۆژووی سوننەت بگرێ، ئەگەر مێردەکەی لەگەڵیابێ، مەگەر بەرەزای مێردەکەی، هەروەها نابێ کەژن رێگەی کەس بدا کەهاموشۆی بکاو، بچێ بۆ ماڵی مەگەر بەرەزای مێردەکەی هەرکاتێکیش ژن، بەبێ وەرگرتنی فەرمانی روون و ئاشکرا لەمێردەکەی، شتێ

[١٧٧٤] اخرجه مسلم في الزكاة، باب: مالنفق العبد من مال مولاه، رقم:١٠٢٦.

ببەخشێ، یاخەرج بکا بۆ کاری خێر، خێری ئەو بەخشینە نیوەیی یانە).
(تاج/٣ ز:٤٦ ل-١١٢ ژ:١ - ش، د/ت) + (ریاض/١ ل/٢٤٢ ز/٣٥ ژ/٢٨٢).

**راڤەو شیکردنەوە:**

**مەبەست ئەم چەند شتەیە:**

١. واباشە ژن ڕۆژووی سوننەت بەبێ ڕەزامەندیی مێردەکەی نەگرێ، بەمەرجێ مێردەکەی لەماوەی ڕۆژووەکەدا لەگەڵیابێ. مەبەستیش لەڕەزابوون ئەوەیە کەمەنعی نەکا. گریمان ژن بەبێ فەرمانی مێردیش بەڕۆژووبێ ڕۆژووەکەی دروستە بەڵام کارێکی ناباشی کردووە.

٢. پیاوی بیانی نابێ هاموشۆی ژنی بیانی بکا، مەگەر بەرەزای مێردو کەسوکارو بەپێ ی باوی جوانی ناو کۆمەڵ، بەوێنە: ئەگەر چەند پیاوێ هاتن بەمیوانی، دروستە ژن دەرگایان بۆ بکاتەوەوبیانبا لەدیوەخان دانیشنو بەخێرهاتنیان بکاو، چاوەڕوانی بکەن هەتا خاوەن ماڵ دێتەوە، چونکە بەپێ ی نەریتو باوی جوانی ناو کۆمەلگای موسوڵمانان شتی وا گومانی خراپی پێ نابرێ، مەبەست لەڕەزامەندیو فەرمانو ئیزن، ڕەزابوونی ئاساییو باوە، ئیتر بەهەر شێوەیێ ئەو ڕەزامەندی یە سەر بگرێ دەبێ. مەبەستی سەرەکی لەم جۆرە فەرموودەیە، ڕێگیری یە لەهەموو کۆبوونەوەیەکی دوو بە دووی گومان لێکراوی ژنو پیاو.

٣. ژنیش وەکوو پیاو ئەندامێکی ئەو ماڵەیە کەتیایدا دەژی لەبەر ئەوە پێویست ناکا بۆ هەموو شتێ، وەك منالی ساوا، پرس بەمو بەو بکا، وەك ئەوە بڵێ: ئەرێ پیاوەکە ئەوە سواڵکەرێکە لەبەر دەرگا لەتێ نانی بدەمێ؟ ئەرێ پیاوەکە دەچم بۆ نوێژی جومعە لەمزگەوت رازیت دە فلس بدەم بەهەژارێ. بەراستی لەکاتی وادا ژن بەقەد کارەکەرێدەستی ناڕوا. بەبێ گومان ژن دادەنرێ بەئەندامێکی کارا لەماڵەوە، سەربە خۆیی خۆی هەیە، وەماڵی

کوردەواری جارانی خۆمان، جوانترین نموونەی بالابوو بۆ ماڵی موسوڵمانی جوان!

## سەرپێچی ژن:
## هۆی ئەوەیە کەزۆرینەی خەڵکی دۆزەخن

١٧٧٥- عَنْ أُسَامَةَ رَضِي اللّٰه عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَكَانَ عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ وَأَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ غَيْرَ أَنَّ أَصْحَابَ النَّارِ قَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ.(الحديث ٥١٩٦- طرفه في:٦٥٤٧). (رياض/١ ز:٣٢ ل/٢٢٥ ژ:٢٥٨)[١٧٧٥].

ئوسامە -رەزای خودای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە- دروودی خوای لێ بێ- فەرمووی: (لەدەرگای بەهەشتا راوەستام، سەرنجم دا زوربەی بەهەشتیەکان کەچوو بوونە ناوی هەژاران‌و مسکێنەکان بوون، بەلام داراو دەوڵەمەندەکان هێشتا ڕاگیرابوون بۆ حیساب‌و لێپرسینەوە لەسەر سامانەکانیان، گەرچی ئەوەی کەدۆزەخی بوون بەفەرمانی خودا برابوون بۆ ناو دۆزەخ، لەبەردەرگای دۆزەخیشا راوەستام، سەرنجم دا زۆربەی خەڵکەکەی ناوی ژنان بوون!).

## قورعە کردن لەنێوانی چەند ژنێکا لەکاتی سەفەردا

١٧٧٦- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰه عَنْها أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانَ إِذَا خَرَجَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَطَارَتْ الْقُرْعَةُ لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا كَانَ بِاللَّيْلِ سَارَ مَعَ عَائِشَةَ يَتَحَدَّثُ، فَقَالَتْ حَفْصَةُ، أَلَا تَرْكَبِينَ اللَّيْلَةَ

---

[١٧٧٥] اخرجه مسلم في الذكر والدعاء (الرقائق). باب أكثر اهل الجنة..رقم/٢٧٣٦.

بَعِيرِي وَأَرْكَبُ بَعِيرَكِ تَنْظُرِينَ وَأَنْظُرُ؟ فَقَالَتْ: بَلَى. فَرَكِبَتْ فَجَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى جَمَلِ عَائِشَةَ وَعَلَيْهِ حَفْصَةُ فَسَلَّمَ عَلَيْهَا ثُمَّ سَارَ حَتَّى نَزَلُوا وَافْتَقَدَتْهُ عَائِشَةُ، فَلَمَّا نَزَلُوا جَعَلَتْ رِجْلَيْهَا بَيْنَ الْإِذْخِرِ وَتَقُولُ: يَا رَبِّ سَلِّطْ عَلَيَّ عَقْرَبًا أَوْ حَيَّةً تَلْدَغُنِي، وَلَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقُولَ لَهُ شَيْئًا. (الحديث ٥٢١١)[١٧٧٦].

عائیشه -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کەدەیویست بچێ بۆ سەفەرێ، لەنێوانی ژنەکانیدا تیروپشکی دەکرد، پشکی هەرکامێکیان دەربچوایە ئەوەیان لەگەڵی دەچوو بۆ ئەو دەرچوونە، جاپشکی عائیشەو حەفصە دەردەچێ کەلەگەڵی بچن بۆ ئەو سەفەرە، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەشەودا کەدەکەوتنە ڕێ، لەگەڵ عائیشە دەڕۆیی‌و قسەو گفتوگۆیان پێکەوە دەکرد، حەفصە بەعائیشە دەڵێ: بائەم شەو وشترەکانمان بگۆڕینەوە، تۆ سواری وشترەکەی من بە،منیش سواری وشترەکەی تۆ دەبم، دەور دەگۆڕینەوە، ئەوەی تۆ لە شەوانی پێشوودا دیوتە منیش دەیبینم لەئەحواڵی پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر بێ- ومنەوەی منیش لەشەوانی پێشوودا دیومە تۆیش دەیبینی ! عائیشە یش دەڵێ باشە، وەوا دەکەن. جاکە دەکەونە ڕێ، دەق وەك شەوانی پێشوو، پێغەمەر -دروودی لەسەر- دەچێ بۆ لای وشترەکەی عائیشەو سلاوی لێ دەکا، ئیتر دەڕۆن هەتا کاتی لادان‌و دابەزین‌و وچان. جائەو شەوە عائیشە هەست بەبێ پێغەمبەریی دەکا، لەداخی ئەوە کەدادەبەزن، هەردوو قاچی خۆی دەخاتە ناو بنچکێ سوورِ ناتکەوە، کەزۆرینەی کات حەشارگەی جرو جانەوەرەو، نزای خراپ لەخۆی دەکاو دەڵێ: خوایە! لەتۆڵەی ئەم هەڵەیەدا کەکردم کە ئەوەیە ئەمشەو لەهاودەمی پێغەمەر دابڕام، دووپشکێ، یا مارێکم بۆ بڕەخسێنە کە پێمەوە بدات!

---

[١٧٧٦] اخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب فضل عائشة..رقم/٢٤٤٥.

سەبارەت بە پێغەمبەریش لەم بارەیەوە ناتوانم هیچی دەربارە بڵێم، چونکە سووچ سووچی خۆم بوو، سووچی کەسی تری تیادا نەبوو).

## نۆرە شەوی ژنان - القسم بين الزوجات

١٧٧٧- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَلَوْ شِئْتُ أَنْ أَقُولَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: وَلَكِنْ قَالَ السُّنَّةُ إِذَا تَزَوَّجَ الْبِكْرَ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا.(الحديث ٥٢١٣ طرفه في ٥٢١٤)[١٧٧٧].

ئەنەس -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: سوننەت وایە ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژن، حەوت شەو لەلای بێ، ئەوسا بەسەرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێت، بەلام ئەگەر بێوەژنێ هێنا بەسەر کچ سێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك شەویان بۆ دابنێت. ئەبو قیلابە فەرمووی: ئەگەر بمەوێ لەباتی ئەوەی بڵێم ئەنەس فەرمووی: (سوننەت وایە..تاد) دەڵێم: ئەنەس فەرمووی: پێغەمەر - دروودی لەسەر - فەرمووی: (ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر.....تاد). (تاج/٣ ل/١٢٩ ز/٥١ ژ/١ - ش/د/تیرمیزی).

## لافو گەزافو خۆ هەڵکێشانی هەوێ بەسەر هەوێی خۆیدا

١٧٧٨- عَنْ أَسْمَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي ضَرَّةً فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ إِنْ تَشَبَّعْتُ مِنْ زَوْجِي غَيْرَ الَّذِي يُعْطِينِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ.(الحديث ٥٢١٩)[١٧٧٨].

---

[١٧٧٧] أخرجه مسلم في الرضاع، باب: قدر ماتستحقه البكر والثيب من إقامة الزوج...رقم/١٤٦١.

ئەسماء -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنێ پرسیاری لەپێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کرد: گوتی: قوربانێ من هەوێبارم، ئەگەر خۆم هەڵبکێشم‌و لافو گەزاف لێ بدەم، وەك ئەوە بەڕواڵەت خۆم وانیشان بدەم کە مێردەکەم تێرو پڕم دەکاو، ئەوەو ئەوەم بۆ دەکاو لەگەڵ دەکا، لەڕاستیشدا شتەکە وانییە، ئایا ئەمە چۆنە، گوناهم دەگا یانا؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ-: (کەسێ لافو گەزافی ئەوە لێ بدا، کەئەوەو ئەوەی هەیەو نەیبێ، وەبۆ خۆهەڵکێشان وابڵێ، ئەوە گورگە لەپێستی مەڕدا). (تاج/٣ ز/٥٠ ل/١٢٩ ژ/٦).

# مەردایەتی‌و بەتەنگەوە بوونی ناموس زۆر پەسەندە

١٧٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ وَغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ.(الحديث ٥٢٢٣م)[١٧٧٩].

-ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ: (خودا بەتەنگەوە دێ، هەر وەها موسوڵمانیش بەتەنگەوە دێ، لەکاتی ڕوودانی کاری ناشیریندا خودا غیرەت دەیگرێ، موسوڵمان غیرەت دەیگرێ، بەتەنگی شەرەف‌و ئابڕوو ناموسەوە دێن، بەتایبەت خودا لەسەر ئەوە غیرەت دەیگرێ و هەڵ ئەداتێ، کە موسوڵمان شتی ناڕەوا بکاو ئەوەی کە خودا ڕەوای نابینێ ئەو ڕەوای ببینێ). (تاج/٣ ز/٥٧ ل/١٤٢ ژ/١ ت/ب).

---

[١٧٧٨] اخرجه مسلم في اللباس والزينة، باب النهي عن التزوير في اللباس وغيره... رقم/٢١٣٠.

[١٧٧٩] اخرجه مسلم في التوبة، باب: غيرة الله تعالى وتحريم الفواحش ، رقم:٢٧٦٢، ٢٧٦١.

١٧٨٠- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما قَالَتْ تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ وَمَا لَهُ فِي الْأَرْضِ مِنْ مَالٍ وَلَا مَمْلُوكٍ وَلَا شَيْءٍ غَيْرَ فَرَسِهِ فَكُنْتُ أَعْلِفُ فَرَسَهُ نَاضِحٍ وَغَيْرَ وَأَسْتَقِي الْمَاءَ وَأَخْرُزُ غَرْبَهُ وَأَعْجِنُ وَلَمْ أَكُنْ أُحْسِنُ أَخْبِزُ وَكَانَ يَخْبِزُ لِي جَارَاتٌ مِنَ الْأَنْصَارِ وَكُنَّ نِسْوَةَ صِدْقٍ قَالَتْ وَكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى مِنْ أَرْضِ الزُّبَيْرِ الَّتِي أَقْطَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى رَأْسِي وَهِيَ مِنِّي عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ فَجِئْتُ يَوْمًا وَالنَّوَى عَلَى رَأْسِي فَلَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَدَعَانِي ثُمَّ قَالَ إِخْ إِخْ لِيَحْمِلَنِي خَلْفَهُ فَاسْتَحْيَيْتُ أن أسير مع الرجال وذكرت الزبير وَغَيْرَتَهُ وَكَانَ أَغْيَرَ الناسِ فَعَرَفَ رَسُولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أني قَدْ اسْتَحْيَيْت فجئت الزبيرَ فَقلْتُ لَقِيني رَسُولِ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَى رأسي النوس، وَمَعَهُ نَفَرٌ مِنْ أصحابه فَأَنَاخ لأَرْكَبَ فَاسْتَحْيَيْتُ منه وَعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ فَقَالَ وَاللَّهِ لَحَمْلُكِ النَّوَى كان أَشَدُّ عليَّ مِنْ رُكُوبِكِ مَعَهُ قَالَتْ حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ ذَلِكَ بِخَادِمٍ يَكْفِنِي سِيَاسَةَ الْفَرَسِ فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَنِي.(الحديث ٥٢٢٤ طرفه في: ٣١٥١)[١٧٨٠].

ئەسمای کچی ئەبوبەکر، کە خوشکی عائیشەی هاوسەری پێغەمەر بوو، فەرمووی: کاتێ زوبەیرمنی هێنا، ئەوەی پێی بڵێی ماڵو بەندەو شتی تریوا، نەیبوو، تەنیا وشترێکی ئاوکێش و ئەسپەکەی خۆی نەبێ، وەمن خۆم ئالیکم دەدا بە ئەسپەکەی و ئاوم دەکێشا بۆ خۆمانو، سەتڵو دوڵچەکەیم دە دووری یەوە و پینەو پەڕۆیم دەکرد، وە خۆم نانو هەویرم دەکرد، بەڵام نەم دەزانی بەجوانی نان بکەم، چەند ژنێکی دراوسێمان هەبوو، ئەنصاری بوون، ئەوان نانیان بۆ دەکردم، بەڕاستی ژنی راستو دروست خۆیان بوون. لەوپارچە زەویەوە، کە پێغەمەر -دروودی خوای لەسەربێ- بەخەڵاتی دابووی بە زوبەیر، لەوێوە بەسەر سەر ناوکی خورمام دەگواستەوە بۆ ماڵەوە، بۆ

---

[١٧٨٠] اخرجه مسلم في السلام، باب جواز إرداف المرأة الأجنبية إذا اعيت في الطريق. رقم/٢١٨٢.

ئاليكى وشترەكان، زەويەكە نزيكەى دوومیل لەماڵەوە دوور بوو (ميلێ چوار هەزار هەنگاوە)، جا رۆژێ لەسەر ئەم بارودۆخە، كۆڵێ ناوكە خورما بەسەر سەرمەوە بوو، لەرێگە گەیشتم بە پێغەمەر و كۆمەڵێ لەيارانى، لە كۆمەڵەى ياريدەدەران، جا پێغەمەر بانگى كردم، ئەوجا خوڕى لەوشترەكەى كە ييخى بداو فەرمووى: (ييخ ... ييخ) هەتا من لەپاشكۆى خۆيەوە سوار بكا، چونكە من بيانى نەبووم، چونكە خوشكى عائيشەى خێزانى بووم، بەلام من سوارنەبووم، چونكە شەرمم دەكرد كەلەگەڵ پياوانا بڕۆم بەرێگەدا، لەهەمان كاتيشا بيرى ئەوەشم كردەوە كەزوبەيرى مێردم، بۆ شتى واو لەكاتى وادا تەنگە دەيگرێ و پێى ناخۆشە، چونكە بەڕاستى لەهەموو كەسێ زياتر زوبەير بەتەنگى نامووسەوە هەبوو، جاكاتێ پێغەمەر -دروودى خواى لەسەر- بەمەى زانى كەوا من شەرم دەمگرێ، تەشريفى ڕۆيشتو منيان بەجێ هێلا، جا كاتێ زوبەيرم دى حاڵەكەم لەنووكەوە بۆيگێڕايەوە، كەلەسەر حاڵێكى وا بەخزمەت پێغەمەرو كۆمەڵێ لە ياريدەدەران گەيشتم، پێغەمەر -دروودى خواى لەسەر- وشترەكەى ييخ دا كە من لەپشتى خۆيەوە سواربكا، بەلام من شەرمم كردو بيرى غەيرەى تۆم كەوتەوە، ئيتر ئەوان ڕۆيشتن و من مامەوە!.

زوبەير فەرمووى: (سوێندم بەخودا ئەوەم بەلاوە گرانتر بوو، كەلەسەر ئەوحاڵە كۆڵە ناوكە خورما هەڵبگرى، هەتا ئەوەى كەلەپاشكۆى پێغەمەرەوە سواربوويتايە!).

ئەسما فەرمووى: ئيتر لەسەر ئەم شێوەيە مامەوە، خۆم خزمەتى زوبەيرو ولاخەكانيم دەكرد، هەتا ماوەيێ لەوەدوا پێغەمەر -دروودى خواى لەسەر- بەهۆى ئەبوبەكرى باوكمەوە خزمەتكارێكى بۆم نارد، خزمەتى ئەسپەكەى لەكۆڵ خستم، ئەم كارە ئەوەندە گرنگ بوو بەلامەوە، وەك لەبەندەيى و كۆيلەيى ئازادم بكات وابوو.

١٧٨١- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي لَأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً وَإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى قَالَتْ فَقُلْتُ: مِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذَلِكَ فَقَالَ: أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً فَإِنَّكِ تَقُولِينَ لَا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ وَإِذَا كُنْتِ غَضْبَى قُلْتِ لَا وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَهْجُرُ إِلَّا اسْمَكَ.(الحديث ٥٢٢٨، طرفه في: ٦٠٧٨)[١٧٨١].

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- فەرمووی: (من دەزانم کە تۆ ئەی عائیشە لەمن ڕازیت یانا گوتم: چۆن چۆنی و بەچیا دەزانیت؟ فەرمووی: (بەوەدا دەزانم کاتێ تۆ لەمن ڕازیت، لەکاتی گوفتوگۆدا، بەوێنە ئاوا سوێند دەخۆیت:نا، بەخودای موحەمەد، بەڵام کاتی لەمن نیگەران بیت، لەکاتی گفتوگۆدا ئاوا سوێند دەخۆیت: نا، بە پەروەردگاری ئیبراهیم). عائیشە فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: بەڵێ چۆن دەفەرمووی وایە، ئەی پێغەمەری خودا! بەس ناوەکەت تەرك ئەکەم، ئەویش بەدەم و بەس، بەڵام لە دڵەوە هەر دڵم لای تۆیە، لەکاتی ئاشتی و لەکاتی زویریدا، قەت بەدڵ لێت زویر نابم.

## پێکەوە بوونی دوو بە دوویی هەردوو ڕەگەزی ناخۆیی

١٧٨٢- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رَضِي اللهُ عَنهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ قَالَ الْحَمْوُ الْمَوْتُ.(الحديث ٥٢٣٢)[١٧٨٢].

---

[١٧٨١] أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: في فضل عائشة رَضيَ اللهُ عنها، رقم: ٢٤٣٩.

[١٧٨٢] رواه الشيخان، التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول، أخرجه مسلم في السلام، باب تحريم الخلوة بالأجنبية، رقم/٢١٧٢.

عوقبەی کوڕی عامیر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- فەرمووی: (بەتەنیا مەچن بۆلای ژنانی ناخۆیی، واتە: نامەحرەم، پیاوێکی ئەنصاری گوتی: ئەی پێغەمەری خودا: ئەی ئەگەر خزمی مێردەکەی بی؟ فەرمووی: (خزمی مێر مردنە: ئەو لەهەموو خراپتر، ئەگەر نامەحرەم بێ، چونکە دوور نییە کە بەناوی خزمایەتییەوە کاری دوژمنێ بکا). (تاج/٣ ل/١٣٨ ز/٥٦ باسی بەتەنیا کۆبوونەوە لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا ش/ت).

ڕوونکردنەوە:

مەبەست لەم جۆرە فەرموودەیە، کردنی احتیاط و وەرع‌و دووربینیەیە، مەبەست چاندنی تۆوی دوو دڵی و بەدگومانی نییە لەناو کەسوکاردا، جا هەرکاتێ لەناو خێزانا، هەست بەم جۆرە پەیوەندیەیە گومانبارانە کرا، پێویستە پێشگیریی لێ بکرێ، دەنا ئەگەر هیچ هۆیەکی ڕەوانەبوو، بۆ پێکەوە ژیانی خێزانیی ناو کەسوکار، ئەوە پێویست بە وروژانی وا ناکات کە ببێ بەهۆی دڵپیسی و پچڕاندنی شیرازەی ناو خێزان‌و کەسوکار. لەڕاستیدا لەسەردەمی پێغەمەر خۆیەوە هەتا ئێستا خوشك‌و براو مام و خاڵ و برازا و خوشکەزای مێرد یا ژن بەکەسێکی ئەمیندار ناسراوە و ڕێگەی هاموشۆی ئاسایی یان لێ نەگیراوە، مەگەر بەهۆی ئەو هاموشۆیەوە گومان یا کێشەیێ دروست بووبێ.

## گێڕانەوەو باسی جوانی و شێوەی ژنی ناخۆیی بۆ مێرد

١٧٨٣- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللّٰه عَنْه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَا تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ فَتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّهُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا.(الحديث ٥٢٤٠ طرفه في: ٥٢٤١)[1783].

---

[1783] قال في التاج الجامع للأصول: رواه الخمسة إلا مسلماً، -المترجم-.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود —ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست —دروودی خوای لەسەر- دەفەرموێ: (نابێ ژن سەرنجی ژنێکی تر بداو، لەپاشا ورد ورد باسی لەشولاری ئەو ژنەی تر بکا بۆ مێردەکەی خۆی بەشێوەیەکی وا وەك مێردەکەی بەچاوی خۆی تەماشای کردبێ وابێ!). (تاج/٣ ز/٥٦ ل/١٤٠ ژ/٧ — باسی کۆبوونەوەی نادروست لەگەڵ ژنی ناخۆیی —نامەحرەم- دا).

ئەمە بۆ پیاویش هەروەهایە، النساء شقائقُ الرِّجالِ في مُعظمِ الأحكامِ. لە پەنجاکانی سەدەی پێشوودا، بەحوکمی وەزیفە لە حەببانییە بووم کەئەوسەردەمە کوردەکانی خۆمان پێیان دەگوت: سینە دەبان، کەوا دەزانم موکەررەدی (سِنُّ الذّبّان)ە. ئەوکاتە بەهۆی ئینگلیزەکانەوە، تا ڕادەیەکی زۆر، بەر بەرەڵایی ڕەوشتی لەوێ وەك ئێستای کوردستانی خۆمان، بەرە بەرە بڵاو دەبۆوە و پشتگیری لێ دەکر، بەتایبەتی لەگەشتو سەیرانی دەریاچەکەی حەببانیە، ژنو پیاو بەبەرگی مەلەو، مەلەو شەڕەگۆمکێ و شەڕە مەلەیان پێکەوە دەکرد، وە عەشامەتێکی زۆر لەهەموولاوە دەهاتن و لەوێ لەوجۆرە شتانەدا، بەبێ پەروا، بەشداریان دەکرد.

جا کابرایێ ناوی خۆشابە بوو، هەموو ڕۆژێ لەگەل برادەرێکی خۆیدا، کەناوی ئیشۆ بوو، دەچن بۆ مەلەو شتی واو، کە دەگەڕێتەوە خۆشابە، باسی لەشولاری ئیشۆ بۆ ژنەکەی دەکا، کە چۆن لاوێکی شۆخو لاوچاكو جوان خاسێکە، هەتا باسی ئەوەی بۆ دەکا، کە یارۆکەی دەڵێی بڕەدارە!

جا ڕۆژێ کە خۆشابە دێتەوە دەڕوانێ ژنەکەی لەگەڵ ئیشۆ دا دەرپێ تێکەڵن و خەریکی داوێنپیسین. جا خۆشابە زۆر بەخوێن ساردیەوە، لەدیاریان دەوەستێ و دەست خۆشی یان لێ دەکاو، بە ژنەکەی دەڵێ: (ژنەکە وەزع لە خۆتان تێك مەدەن، ئەمە خەتای منە، نەوەك تۆ، چونکە ئەم میلە من بەدەستی خۆم ناومەتە ناو ئەم میکحەلەیەوە).

## دڵپیسی نێوانی هاوسەران هەوێنی رووخانی خێزانە

١٧٨٤- عَنِ جَابِرَ بْنَ عَبْدِاللّٰهِ رضي الله عنهما قال: قال رَسُولِ الله صَلّى اللّٰـه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَطَالَ أَحَدُكُمُ الْغَيْبَةَ فَلَا يَطْرُقْ أَهْلَهُ لَيْلًا.(الحديث ٥٢٤٤ طرفه في: ٥٢٤٦)[١٧٨٤].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا –ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرمویٚ: خۆشەویست – دروودی خوای لەسەر- دەفەرمویٚ: (کاتێ کەسێکتان سەفەرەکەی درێژەی کێشا یا بۆماوەیەکی زۆر، لەبەر هەر هۆیەك بێ، لەخێزانی دابڕا، با بەشەو لەناکاوا نەکا بەماڵاو، لەبارودۆخی ئاوادا نەدابەسەر خێزانیدا). (تاج/٣ ز/٤٧ ل/١٨ ژ/٥ – مافی ژن لەسەر مێرد – ش/د/ت/ن).

١٧٨٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ رضي الله عنهما أَنَّ النبي صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إذا دَخَلْتَ لَيْلًا فَلاَ تَدْخُلْ عَلَى أَهلِكَ، حَتَّى تَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ، وَتَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ.(الحديث ٥٢٤٦، أطرافه في: ٤٤٣، ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠، ٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٢٦٧، ٦٣٨٧)[١٧٨٥].

جابیر کوڕی عەبدوڵلا –ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر – دروودی خوای لەسەر- فەرمووی: (کاتێ لەسەفەرو شتی وا دەگەڕێنەوە، ئەگەر بەشەو دەگەیشتنەجێ، وابکەن کەلەپێشدا ئاگاداریان بکەنەوە، هەتا ژن سەری خۆی شانە بکاو، دەرمانی حەمام بەکاربێنێ بۆ لابردنی مووی زیادەی لەشی). ئەمە دەقی گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولدا. (بڕ: تاج/٣ ل/١٨/

---

[١٧٨٤] و اخرجه مسلم في الجهاد عن بندار، (عيني/٢٠ ص/٢٢١). –المترجم-

[١٧٨٥] اخرجه مسلم في الإمارة، باب: كراهة الطروق وهو الدخول ليلا. رقم/٧١٥.

ز/٤٧ ژ/٧ + ٥ + ٨ + ٦ ش/د/ت/ن = شـــەيخين: بوخـــاری و موســـليم و ئەبوداوود و تيرميزی و نەسائی).

روونكردنەوە:

ئەم فەرموودەيە جۆرێكە لە ئەدەبی نهێنی نێوانی ژن‌و مێرد، نموونەيەكە بۆ ڕێنمايی ژن‌و مێرد، سەبارەت بەو كرداروو رەفتارانەی كەدەبن بەهۆكاری پتەوبوونی نێوانيان.

مامۆستای عەسقەلانی -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: نامەی ژنهێنان دووسەدو بيست‌و هەشت فەرموودەی بەرزەوە بووی واتيادا، بێڕشتەو موتابەعەكانی چل‌و پێنج فەرموودەن، ئەوانی تريان پەيوەستن، واتە: مەوصولن، دووبارەكانيان سەدو شەست‌و دوو فەرموودەن، پوختەكەيان شەست وشەش فەرموودەن، پێشەوا موسليميش وەك پێشەوا بوخاری هەموويانی گێڕاوەتەوە بێجگە لەمانەيان، كەبيست‌و دوو فەرموودەن:

١. فەرموودەی ئيبنو عەباس (خَيرُ هذهِ الأُمَةِ أَكثَرُهَا نِساءً) = ژمارە/٥٠٦٩ فەتح لەتەجريدەكەدا نييە.

٢. فەرموودەی ژمارە/١٧٤٥ تجريد = ٥٠٧٦ فەتح. ئەبوهورەيرە (إنّي شَابٌّ أَخَافُ العنَتَ).

٣. ژ/١٧٤٦ تجريد = ٥٠٧٧ فەتح = عائيشە (لَو نَزَلْتَ وَادِيًا).

٤. ژ/١٧٤٧ تجريد = ٥٠٨١ فەتح = (إنّما أَنَا أَخُوكِ).

٥. ژ/١٧٥٠ تجريد = ٥٠٩٠ فەتح = (تَنكح المرأة لأَربَعَ).

٦. حەديسەكەی سەهل: (هذا حَرِيٌ إنْ خَطَبَ أَنْ ينكح...) ١٧٥١ تجريد = ٥٠٩١ فەتح.

٧. حەديسی ابن عباس (حَرُمَ مِنَ النِّساءِ سَبْعٌ) = ٥١٠٥ فەتح.

٨. حەدیسی (دَفَعَ النَبِيُّ صلى الله عليه وسلم رَبِيبَتَهُ إِلَى مَنْ يَكْفُلُهَا) لەنێوانی ژمارە/٥١٠٥ و ٥١٠٦ فەتح دایە.

٩. حەدیسی جابیر: (أن تنكح المرأة على عمتها أو خالتها) = ١٧٥٧ تجرید = ٥١٠٨ فەتح.

١٠. حەدیسی ابن عەباس (في المتْعَةِ..).

١١. حەدیسی سلمە: (أَيُّمَا رَجُلٍ و إمرأةٍ تَوافَقَا) = ٥١١٩ فەتح.

١٢. فەرموودەکەی ئیبنوعەباس سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی ئایەتی: ﴿فِيما عَرَّضْتُمْ بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ﴾ = ٥١٢٤ فەتح.

١٣. فەرموودەکەی عائیشە: (كَانَ النِكَاحُ عَلَى أربَعَةِ أَنْحَاء) = ٥١٢٧ فتح الباری.

١٤. فەرموودەکەی خەنسائی کچی خدام: (أَنَّ أَبَاهَا زَوَجَهَا وَهِيَ ثَيِبٌ فكرهتْ ذِلِكَ ...فَرَدَّ رسول الله نكاحَهَا) = ٥١٣٨ فەتح = ١٧٦٤ تەجرید.

١٥. فەرموودەکەی ڕەبیعی کوڕی معەوِّذ، سەبارەت بە لێدانی دەف لەشاییدا = ٥١٤٧ فەتح.

١٦. فەرموودەکەی عائیشە: (فَإِنَّ الأنصارَ يعجبهم اللَّهْوُ..) = ١٧٦٧ تەجرید = ٥١٦٢ فەتح.

١٧. فەرموودەکەی ئەنەس: (كان إِذَا مَرَّ بَجَنَبَاتِ أُمّ سَلِيمٍ دَخَلَ عَلَيْهَا...) = ٥١٦٣ فەتح. ئەم فەرموودەیە موعەللەقە، باقیەکەی موتتەفەقوعەلەیهی یە.

١٨. فەرموودەکەی صەفیەی کچی شەیبە لەبارەی نانی شایی = ٥١٧٢ فتح الباری.

١٩. تەعلیقەکەی: (لَمْ يُوَقِّتِ النَبِيّ صلى الله عليه وسلم يعني في الوليمة) لەپێش ژمارە: ٥١٧٣ فەتح.

٢٠. فەرموودەی ئەبوهورەیرە: (مَنْ يؤمِن بِاللهِ و اليوم الآخر فلاَ يُؤذِي جَارَهُ) = ٥١٨٥ فەتح.

٢١. تەعلیقەکەی معاویەی کوڕی حیدە: (لاَهجر إلاَّ فِي البيت) - بابی/٩٣ والەپێش ژمارە/٥٢٠٢ فەتحەوە.

٢٢. فەرموودەی ئیبنوعەبباس لەبارەی داستانی هەجری ژنان - ٥٢٠٣ فتح الباری.

هەروا شێخ دەفەرموێ: لەم نامەیەدا سیی و شەش بیستراو —اثـری صەحابەو تابیعینیشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٧١- نامەی تەڵاق (ژن بەرەڵاکردن)

# كتاب الطلاق

١٧٨٦- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ ثُمَّ تَطْهُرَ ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ.(الحديث ٥٢٥١ أطرافه في: ٤٩٠٨، ٥٢٥٢، ٥٢٥٣، ٥٢٥٨، ٥٢٦٤، ٥٣٣٢، ٥٣٣٣، ٧١٦٠).

ئیبنوعومەر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: بەسەرینی پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- ژنێکم لەبێنوێژی دابوو تەڵاقم دا، عومەر -ڕەزای خوای لێ بێ- بۆئەم مەسەلەیە لەخۆشەویست دەپرسێ -دروودی خودای لەسەر- خۆشەویست -دروودی خودای لەسەر- دەفەرموێ: (پێی بڵێ: با ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر ڕکێفی خۆی، ئەوسا بیهێڵێتەوە لەلای خۆی تا لەبێنوێژی پاك دەبێتەوە و جارێکی تر دەکەوێتەوە سەر بێنوێژی و دیسان پاك دەبێتەوە، ئیتر لەوە دوا ئەگەر ئارەزوودەکا با بەجوانی ڕای بگرێ لای خۆیو ژنی خۆیەتی، وەکی تریش ئەگەر ئارەزووش دەکا بەرلەوەی کە بچێتە لای، با تەڵاقی بدا، ئەمە کەژن لەپاکیەکا تەڵاق بدرێ، کە مێردەکەی لەوپاکییەدا نەچووبێتەلای ئەو حەیەو عیدەیەیە کەخودا لە قورئانا فەرمانی کردووە کەژنی تیادا تەڵاق بدرێ، کە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ (٦٥/١) سورة الطلاق﴾ واتە: ئەی پێغەمەری خۆشەویست: بە موسوڵمانان بفەرموو: هەرکاتی ویستتان ژن

تـەلاق بـدەن بالـە كاتێكـدا تـەلاقیان بـدەن كـەماوەی عیـددەیـە، كـەكاتی پـاكی ژنانـە لە بێنوێژی و زەیستانی، وە ژمارەی رۆژو كاتی عیددەكەیان ڕابگرن، وە بەردەوام لەخودا بترسن). (برِ: تاج/٣ ل/١٥٧ ز/٦٤ ژ/١+٢ س/د/ن).

١٧٨٦م– وَعَنْهُ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: حُسِبَتْ عَلـيَّ بتَطْلِيقَـةٍ.(الحـديث ٥٢٥٣ طرفه في: ١٧٨٦ تجريد)[١٧٨٦]:

له گێڕانەوەیەكی تری ئەم فەرموودەیەدا ئیبنو عومەر -ڕەزای خودایـان لێ بێ- فەرمووی: (ئەو تەلاقەی كە لەكاتی بێنوێژیدا دام، دانـرا بەیـەك تـەلاق و ژنەكەم بەوە یەك تەلاقی كەوت)

## بەكارهێنانی ووشەی تەلاق و لێداتاشراوەكانی مەرجە بۆ كەوتنی تەلاق یانا؟

١٧٨٧– عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّه عَنْهَا أَنَّ ابْنَةَ الْجَوْنِ لَمَّـا أُدْخِلَـتْ عَلَـى رَسُـولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَدَنَا مِنْهَا قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ فَقَالَ لَهَـا: لَقَـدْ عُـذْتِ بِعَظِيمِ الْحَقِي بِأَهْلِكِ.(الحديث ٥٢٥٤)[١٧٨٧]:

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر –دروودی خودای لەسـەر- ژنێكی هێنا، ناسـراوبوو بـە ئیبنەتولجەون، كاتـێ گواسـتیانەوە بـۆ پێغەمـەرو پێغەمـەر ویـستی بەدەستی بگرێ، ژنەكـە گـوتی: پـەنا دەگـرم بـەخوا لـەتۆ. پێغەمەریش –دروودی خودای لەسەر- فەرمووی پێی: (بەڕاستی پەنات گـرت بەكەسێكی گەورەو مەزن، كەخوای گەورەیە، لەبـەر ئـەوە مـن بـەدڵی خۆتـت

---

[١٧٨٦] أخرجه مسلم في الظلاق، باب تحريم طلاق الحائض بغير رضاها، رقم/١٤٧١.

[١٧٨٧] (١٧٨٨+١٧٨٧) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عائشة و حديث ابي أسيد و حديث سهل بن سعد في صته الجونية – خاتمة كتاب الظلاق، فتح/١٠ ص/٦٢٢. –المترجم-

لەگەڵ دەکەمو دەستت بۆنابەم کەواتە بڕۆرەوە بۆ سەر کەسوکارت، چونکە لەم ساتەوە تۆ ژنی من نیت).

١٧٨٨- عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى انْطَلَقْنَا إِلَى حَائِطٍ يُقَالُ لَهُ الشَّوْطُ حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى حَائِطَيْنِ فَجَلَسْنَا بَيْنَهُمَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اجْلِسُوا هَا هُنَا وَدَخَلَ وَقَدْ أُتِيَ بِالْجَوْنِيَّةِ فَأُنْزِلَتْ فِي بَيْتٍ فِي نَخْلٍ فِي بَيْتِ أُمَيْمَةَ بِنْتِ النُّعْمَانِ بْنِ شَرَاحِيلَ وَمَعَهَا دَايَتُهَا حَاضِنَةٌ لَهَا فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ هَبِي نَفْسَكِ لِي قَالَتْ وَهَلْ تَهَبُ الْمَلِكَةُ نَفْسَهَا لِلسُّوقَةِ؟ قَالَ فَأَهْوَى بِيَدِهِ يَضَعُ يَدَهُ عَلَيْهَا لِتَسْكُنَ فَقَالَتْ أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْكَ فَقَالَ: قَدْ عُذْتِ بِمَعَاذٍ ثُمَّ خَرَجَ عَلَيْنَا فَقَالَ يَا أَبَا أُسَيْدٍ اكْسُهَا رَازِقِيَّتَيْنِ وَأَلْحِقْهَا بِأَهْلِهَا.(الحديث ٥٢٥٥ طرفه في: ٥٢٥٧).

ئەبو ئوسەید -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- ژنێکی خواست، ناسرابوو بە بینتولجەون چونکە لەهۆزی بەنی جەون بوو، من چووم بۆ وولاتی خۆی و گواستمەوە بۆ پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- کە هەواڵم بە پێغەمەر دا، کەوا بینتول جەونمان هێناوە بەبووکی بۆت، پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- دەرچوو ڕۆیشت بۆلای، ئێمەیش لەخزمەتیدا چووین، ڕۆیشتین لەخزمەتیدا هەتا گەیشتینە ڕەزە خورمایەکی شوورادار، کەپێی دەگوترێ ڕەزی شەوط، کەناوی باخێکی ناسراوە لەمەدینە، ڕۆیشتن هەتا گەیشتن لە دوو ڕەزە خورما، لەبەینیانا دانیشتین، پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- فەرمووی ئێوە لێرەدا دابنیشن.

پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- ڕۆیشتە ناو هۆدەیێ، لەناو ڕەزە خورمایەکا بوو، بینتول جەونیان بردەناو ئەو هۆدەیەوە، نوعمانی کوڕی شەراحیل بوو، نازناوی بینتول جەون: ئومەیمە بوو، دایەنەکەشی کەلەلەی بوو لەگەڵیا هاتبوو، جا پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- کەچووە ژوورەوە بۆلای پێی گزوت: (خۆتم پێ ببەخشە).

بینتـول جـەون گـوتی: مـن شـازادەم و تـۆ مـسکێنی، چـۆن شـازادە خـۆی دەبەخشێ بەکابرایەکی بازاڕی مسکێنی وەك تـۆ؟ فـەرمووی: جا پێغەمـەر – دروودی خودای لەسەر- دەست دەبا، کـە دەست بخاتـە سەرشـانی هـەتا هـێمن ببێتەوە، ژنەکەش دەڵێ: پـەنا دەگـرم بـەخوا لـەتۆ. پێغەمـەریش دەفـەرموێ: (پەنات گرت بەکەسێ شایەنی پەنا بۆ بردنە).

ئەوجا تەشریفی دێتە دەرەوە و واز لەژنەکەی دێنێ و هـات بـۆلای ئێمـە و فـەرمووی: (ئـەی ئـەبو ئوسـەید! دوو کراسـی ئاودامـەنی بلـووری سـپی، لەجۆری رازقیەی بۆ بکەو، بیبـەرەوە بـۆ خـاوەنی، ئەمـە بـۆ هاوسـەرێتی مـن دەست نادات).

ڕوونکردنەوە:

ئـەبو ئوسـەیدی سـاعیدی نـاوی مـالیکی کـوڕی رەبیعەیـە، خەزرەجیـە، ئەنصارییە، ئامادەی غەزای بەدرو غەزاکانی پاش بـەدر بـووە، لـە ڕۆژی ئـازاد کردنـی مەککـەدا ئـاڵای ئێڵـی بـەنی سـاعدە بـەو بـووە، واقیـدی دەفـەرموێ: پیاوێکی کورتە باڵای سەرو ڕیش سپی بووە، مـووی پڕو زۆر بـوو، لـەئاخری تەمەنیدا نابینا بوو، ساڵی شەستی کۆچی لەتەمـەنی حـەفتاو هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، دواترین کەس بوو لەبەدرییەکان کە مردووە، لەمەدینە مردووە.

جێگـەی داخـە ڕفـەکارانی ئـەم فەرموودەیـە و تەرەفـەکانی، زۆر بـەکاڵی و کرچـی باسـی ئـەم چـیرۆکی شـووکردنی بینتـول جەونـە و جیابوونـەوەی لەپێغەمەر دەکەن، زۆرینەی بـۆ چوونەکانیان لاوازو بـێ تـام و بـێ مەعنایـە، بگرە ئەم چیرۆکە یەك چیرۆکە بەڵام ئەوان وائاڵۆزیان کردووە، لەکەسێ وایـە کە پێغەمەر چەندین ژنی هێناوە لەم بابەتەو، وە بەم جـۆرە مەهانانـە لێیـان جیابۆتەوە، وێنە ناوی ئەم ژنانە لەم چیرۆکە داهاتووە، عەمرەی کچی جـەون و ئەسمای کچی کندەی جونی و ئەسمای کچی نوعمان و ئەسمای کچی ئەسـوەد

و هيندی کچی یزید و فاتیمەی کچی زەحاك و عەمرەی کچی یزیدو کەسانی تریش!!

لەهەمووی سەیرتر قسەو کوفتوگۆ و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە، لە حیواری فیلمو نمایش و شانۆدەکا.

ئێوە تەماشاکەن کچێکی شازادە، باوکی پێشکەشی بکا بە پێغەمەر وە پێغەمەر مارەیەکی باشی پێ بدا، وە کۆمەڵێ پیاو بەسەرۆکایەتی ئەبو ئوسەید بنێرێ، کەبەو پەڕی ڕێزو قەدرەوە لەوڵاتی خۆیەوە بیگوازنەوە بۆ پێغەمەر، کاتی پێغەمەر بچێتە پەردەوە پێی بڵێ: (وەرە بۆ ئێرە) ئەویش بڵێ: تۆ وەرە من نایەم، وە لەسەر ئەمە لێیان ببێ بەکێشەو بەرە، ئەو بڵێ من لەتۆ گرنگترم دەبێ تۆ بێی، ئەو بڵێ بە پێچەوانەوە، وە بەهۆی بارو دۆخێکی ئاوا پەهلەوانانەوە، بەرلەوەی بەیەکتر بگەن لەیەکتر جیابنەوە!!

## تەلاقی سێ بە سێ دروستە یا نا دروستە

١٧٨٩- عَنِ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنها: أَنَّ امْرَأَةَ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ جاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنَّ رِفَاعَةَ طَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلَاقِي وَإِنِّي نَكَحْتُ بَعْدَهُ عَبْدَالرَّحْمَنِ بْنَ الزُّبَيْرِ الْقُرَظِيَّ وَإِنَّمَا مَعَهُ مِثْلُ الْهُدْبَةِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لَا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ وَتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ.(الحديث ٥٢٦٠ أطرافه في: ٢٦٣٩، ٥٢٦١، ٥٢٦٥، ٥٣١٧، ٥٧٩٢، ٥٨٢٥، ٦٠٨٤)[(١٧٨٩)].

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: ژنەکەی ریفاعەی قورەظی هاتە لای پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- گوتی: ئەی پێغەمەری خوا: ریفاعەی قورەزی بە ئێجگاری تەلاقی داومو لەپاش ئەو شووم کردووە بەئەوڕەحمانی

---

[(١٧٨٩)] اخرجه مسلم فى النكاح، باب: لا تحل المطلقه ثلاثا ..رقم/١٤٣٣.

کوڕی زەبێری قوڕەزی بەڵام چووکی ئەوڕەحمان وەك پەتك وایەو، جیماعی پێ ناکرێ؟ پێغەمبەر -درودی خودای لەسەر- فەرمووی پێی: ڕەنگ بێ بتەوێ بگەڕێیتەوە بۆلای ڕیفاعەی مێردی پێشووت، شتی وانابێ، هەتا ئەوڕەحمان چێژ لەخۆشی جووتبوون لەگەڵ تۆدا نەچێژێ و تۆش چێژ لەخۆشی جووتبوون لەگەڵ ئەوڕەحماندا نەچێژی، دانانرێ بەشووی دووەم کە دەبێ بەهۆی دروستبونی شووکردنەوە بەمێردی یەکەم، بەمەرجێ مێردی دووەم ژنەکە تەڵاق بداو عیددەی ژنەکە لەمێردی دووەم تەواو بێ، ئەوسا دروستە ئەوژنە بەگرێدانێکی نوێ شووبکاتەوە بەمێردی پێشووی). (تاج/٣ ل/١٥٩ ز/٦٥ ژ/١ ش/د/ت/ن).

## شتی حەڵاڵ لەخۆحەرامکردن بەوە حەرام نابێ

١٧٩٠- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّه عَنْهَا قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحِبُّ الْعَسَلَ وَالْحَلْوَاءَ وَكَانَ إِذَا انْصَرَفَ مِنَ الْعَصْرِ دَخَلَ عَلَى نِسَائِهِ فَيَدْنُو مِنْ إِحْدَاهُنَّ فَدَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ فَاحْتَبَسَ أَكْثَرَ مَا كَانَ يَحْتَبِسُ فَغِرْتُ فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ فَقِيلَ لِي: أَهْدَتْ لَهَا امْرَأَةٌ مِنْ قَوْمِهَا عُكَّةً مِنْ عَسَلٍ فَسَقَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهُ شَرْبَةً فَقُلْتُ: أَمَا وَاللَّهِ لَنَحْتَالَنَّ لَهُ فَقُلْتُ لِسَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ إِنَّهُ سَيَدْنُو مِنْكِ فَإِذَا دَنَا مِنْكِ فَقُولِي: أَكَلْتَ مَغَافِيرَ فَإِنَّهُ سَيَقُولُ لَكِ: لَا، فَقُولِي لَهُ مَا هَذِهِ الرِّيحُ الَّتِي أَجِدُ مِنْكَ، فَإِنَّهُ سَيَقُولُ لَكِ: سَقَتْنِي حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ، فَقُولِي لَهُ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ، وَسَأَقُولُ ذَلِكِ، وَقُولِي أَنْتِ يَا صَفِيَّةُ ذَاكِ قَالَتْ: تَقُولُ سَوْدَةُ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ قَامَ عَلَى الْبَابِ فَأَرَدْتُ أَنْ أُبَادِيَهُ بِمَا أَمَرْتِنِي بِهِ، فَرَقًا مِنْكِ، فَلَمَّا دَنَا مِنْهَا قَالَتْ لَهُ سَوْدَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ قَالَ: لَا. قَالَتْ: فَمَا هَذِهِ الرِّيحُ الَّتِي أَجِدُ مِنْكَ؟ قَالَ: سَقَتْنِي حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ. فَقَالَتْ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ، فَلَمَّا دَارَ إِلَيَّ قُلْتُ لَهُ نَحْوَ ذَلِكَ، فَلَمَّا دَارَ إِلَى صَفِيَّةَ قَالَتْ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ فَلَمَّا دَارَ إِلَى حَفْصَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا أَسْقِيكَ مِنْهُ؟ قَالَ: لَا حَاجَةَ لِي

فِيهِ. قَالَتْ: تَقُولُ سَوْدَةُ: وَاللَّهِ لَقَدْ حَرَمْنَاهُ، قُلْتُ لَهَا: اسْكُتِي.(الحديث ٥٢٦٨ طرفه في: ١٧٠٩ تجريد = ٤٩١٢ = بەرگی چوارەم ل/٥٠٨ ).

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- حەزی لەهەنگوین و حەلوا بوو، گەلێ جار لەپاش کردنی نوێژی عەسر دەچوو بۆلای هاوسەرەکانی، یەکە یەکە هەواڵی دەپرسین و سلاوی لێ دەکردن، ئەوجا دەچوو بۆلای یەکێکیانن وچتنێکی دەگرت لەلای و خۆی لێ نزیک دەکردەوە، ماچو مۆچ و شتی وای لەگەڵ دا دەکرد، بەلام بەبێ جووتبوون و دروستبوون لەگەڵی. جا جارێ چووە هۆدەکەی حەفصەی هاوسەری، کە کچی عومەری کوڕی خەتاب بوو، زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا لەلای گلی خواردەوە، منیش دەماری هەوێباری گرتمی، کە پرسیم هۆی ئەم زیادەمانەوەی پێغەمەر لەلای حەپسە چیە، پێیان گوتم: ژنێکی خزمی دوو بەرمێی هەنگوینی بە دیاری بۆ هێناوە، ئەویش شەربەتی لێ دروست دەکاو دەیدا بە پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- بەو هۆیەوە کەمێ لەلای دەمێنێتەوە، منیش گوتم: بەخوا دەبێ فێلێکی وای لێ بکەین کەوازبێنێ لەم مانەوەی لای حەپسەیە، جا بە سەودەی کچی زەمعەم گوت: کەیەکەم ژنی پێغەمەر بوو لەپاش مردنی خەدیجەی یەکەم هاوسەری، پێم گوت: دیارە کە پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- تەشریف دێنێ بۆلای تۆیش، لەنۆرە ڕۆژی خۆتا. کە تەشریفی هات بۆلات، پێی بڵێ: من بێنی مەغافیرت لێ دەکەم، دەڵێی مەغافیرت خواردووە؟ ئەویش پێت دەفەرموێ: (نا، مەغافیرم نەخواردووە! تۆیش پێی بڵێ: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چیە کەلێت دێ، ئەویش دەفەرموێ: (ئەوە لای حەفسە شەربەتی هەنگوینم خاردۆتەوە) تۆیش پێی بڵێ: (ئای: ئەوە هەنگەکەی جەویی داری عورفوطی هەلمژیوە، کەپێی دەگوترێ مەغافیر) کاتێ هاتیش بۆلای من، منیش هەمان شتی پێ دەڵێم، وە تۆیش ئەی صەفییە، کاتی پێغەمەر لەسەرەی خۆتا تەشریفی هات

بۆلات هەمان قسەو پرسیارو گفتوگۆی لەگەل بکە، سەودە فەرمووی: (بەخوا لەترسی تۆ ئەی عائیشە! هەر کەپێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- لەدەرگاکەوە هاتە ژوورەوە، ویستم یەکسەر قسەکەی تۆ پێت گوتم پیَی بلّێم، جاکە هاتە پێشەوە و لێم نزیکبۆوە گوتم پیَی: ئەی پێغەمەری خودا: مەغافیرت خواردووە؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیم کرد: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە کە لێت دێ؟ فەرمووی: (حەفسەی خێزانم شەربەتی هەنگوینی دەرخوارد داوم) گوتم: دیارە کە هەنگەکەی مەغافیری هەلّمژیوە و کردوویەتی بەهەنگوین، کە جەویی دارێکی دڕکاویە حوشتر دەیخوات، بە عەرەبی پیَی دەگوترێ: عورفوط، رەنگ بێ بە داری عورفوط، بەکوردی، بلّێن: مارگرە. عائیشە فەرمووی: کاتێ لەسەرەی خۆما هات بۆلام منیش هەروام پێ گوت، کاتی لەسەرەی سەفێش دا دەچێ بۆلای سەفیەش هەروای پێ دەلّێ، کاتێ لەسەرەی حەفسەدا دەچێ بۆلای، حەفسە پێی دەلّێ: ئەی پێغەمەری خوا! با شەربەتێکی هەنگوینت بۆ بکەم. دەفەرموێ: (کارم پیَی نییە) عائیشە فەرمووی: جا سەودە بەمنی گوت: کارێکی باشمان نەکرد، هەنگوینمان لە پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- قەدەغە کرد، منیش پێم گوت: وسبە، فێلّەکەمان با ئاشکرا نەبێ. (بڕوانە: ژ/١٧٠٩ تجريد = ٤٩١٢ فەتحولباری= بەرگی چوارەم ل/٥٠٨) + (تاج/٧ ل/٢٠٥ ز/٤٩ ژ/١ سورەتی تەحریم).

روونکردنەوە:

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگرین:

١. لەسەر فەرمایشتی گەلێ لەزانایانی پایەبەرز، کەسێ بەژنی خۆی بلّێ: (ئەوا تۆم لەخۆم حەرام کرد) بەوە تەلاقی ناکەوێ و لێشی حەرام نابێ، بڕوانە فەرموودەی ژمارە/٥٢٦٦ لەفەتحولباریدا.

٢. دەمارگیری و هەوێبازی بۆ ژنان کارێکی سروشتییە، هەتا ڕادەیێ، چاوپۆشی لێ دەکرێ و بەگوناه دانانرێ.

٣. واباشە هەندێ کاروباری ژن و مێرد کەشەرماوی بێ، لەژێر پەردەوە قسەی لێ بکرێ، نەوەکوو بەڕاشکاوی و بە زەقی و کوتو مەترەقی، هەتا لەنێوان ژن و مێرد یشا هەروا، کەواتە: هەندێ نامیلکەو شتی وا پەیدا بوون، کەسانێ بازرگانییان پێوە دەکەن، هەتا هەیانە وێنەی ئەندامەکانی نێرو مێی تیا روونکراوەتەوە. ئەو نامیلکانە زۆر خراپن، منالو لاو دەوروژێنن پێش کات.

## باسی (خولع): ڕێکەوتنی ژن و مێرد لەسەر جیابوونەوە بەرامبەر بەماڵ

١٧٩١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُما أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ مَا أَعْتِبُ عَلَيْهِ فِي خُلُقٍ وَلَا دِينٍ وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: اقْبَلِ الْحَدِيقَةَ وَطَلِّقْهَا تَطْلِيقَةً.(الحديث ٥٢٧٣ أطرافه في: ٥٢٧٤، ٥٢٧٥، ٥٢٧٦، ٥٢٧٧).

ئیبنوعەباس -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیس هاتەلای پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- گوتی: ئەی پێغەمەری خودا! گلەییم لەڕەووت و بەدینیی سابیت نییە، لەم رووەوە کەمو کوڕی نییە، بەلام زۆر ناشیرینە، لەبەرئەوە مەترسی ئەوەم هەیە ئەگەر بەشێوەیەکی ڕەوا دەستم لەدەستی نەبێتەوە خۆم کافربکەم، بەو شێوەیە نیکاحی خۆم لێی هەڵ بوەشێنمەوە، پێغەمەریش -دروودی خودای لەسەر- فەرمووی: (ئەو باخەی کە لەباتی مارەیی داوێتی پێت دەیدەیتەوە پێی؟) گوتی: بەڵێ،

فەرمووی بەسابیت: (باخەکەی لێ وەربگرەوە و تاقەیەك تەلاقی بدە). (تاج/٣ ل/١٦٤ ز/٦٧ ژ/١ ب/ن).

## کەنیز خۆی سەرپشکە لەپاش ئازادبوونی، کەبمێنێتەوە لەلای مێردی کۆیلەی

١٧٩٢- وَ عَنهُ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ زَوْجَ بَرِيرَةَ كَانَ عَبْدًا يُقَالُ لَهُ مُغِيثٌ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَطُوفُ خَلْفَهَا يَبْكِي وَدُمُوعُهُ تَسِيلُ عَلَى لِحْيَتِهِ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعبَّاسٍ: يَا عَبَّاسُ أَلَا تَعْجَبُ مِنْ حُبِّ مُغِيثٍ بَرِيرَةَ وَمِنْ بُغْضِ بَرِيرَةَ مُغِيثًا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَوْ رَاجَعْتِهِ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللّٰهِ تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: إِنَّمَا أَنَا أَشْفَعُ. قَالَتْ: لَا حَاجَةَ لِي فِيهِ.(الحديث ٥٢٨٣، أطرافه في: ٥٢٨٠، ٥٢٨٢).

ئیبنو عەبباس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: مێردەکەی بەریرە کۆیلە بوو، ناوی موغیث بوو، کاتێ بەریرە ئازاد بوو خۆی هەلگرتەوەو نیکاحی خۆیی لە موغیثی مێردی هەڵوەشاندەوە، جابەم بۆنەیەوە موغیث شوێن بەریرە کەوتبوو، دەگریاو لێی دەپاڕایەوە کە نیکاحەکەی هەڵنەوەشێنێتەوە، فرمێسکی هۆن هۆن بەسەر ریشی دا دەهاتە خوارەوە پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- بەمنی فەرموو: (ئەی عەباس: تەعەجوب ناکەی لە خۆشەویستی موغیث بۆ بەریرەو لەڕقی بەریرە لە موغیث؟!). پێغەمەر -درودی خودای لەسەر- بە بەریرەی فەرموو: (بۆچی ناچێتەوە بۆلای؟). بەریرە گوتی: ئەی پێغەمەری خودا ئەمە فەرمانەو پێم دەکەی، دیارە کە فەرمانی تۆ دەبێ جێ بەجێ بکرێ، یا فەرمان نییەو شتێ ترە؟) پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- فەرمووی: نا، ئەمە فەرمان نییە، بەڵکو تکایە و بۆی دەکەم لەلای تۆ، زۆری تیادا نییە). بەریرە گوتی: کەواتە کارم پێی نییەو تازە ژنێتیی ئەوم قەبووڵ نییە). (بڕ: ژمارە/١٠٩٤ تجرید = ٢٥٦٠

فـەتح=بـەرگى/٣ ل/١٨٣) + (تـاج/٣ ل/٣٨ ز/١٨ ف/١ + تـاج/٢ ل/٣١٠ ف/٣ ز/١٤٩) + (ژمارە:٧١٨ تجريد = ١٤٩٥ فتح البارى = بەرگى/٢ تەجريد ل/١٤١).

## ئاماژە بڕيار و حوكمى پێدادەمەزرێ

١٧٩٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ رَضِـيَ اللّـهُ عَنْـهُ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولَ اللهِ صَلَّى اللّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنا وَ كَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هكذا. وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شَيْئاً.(الحديث ٥٣٠٤، طرفه في: ٦٠٠٥).

سـەهلى كـوڕى سـەعدى ئـەل‌سـاعيدى -ڕەزاى خـواى لێ بـێ- فـەرمووى: پێغەمەر -دروودى خوداى لەسەر- فـەرمووى: (مـن‌و دەسـتەبەرو بـەخێوكارى هـەتيو لەبەهەشـتا ئـاوا وەك ئـەم دوو پەنجەيـە لـەنزيك يـەكترەوە دەبـين). پێغەمـەر -دروودى خـوداى لەسـەر- بـە پەنجـەى شـايەتمانى و بەپەنجـەى ناوەڕاسـتى ئامـاژەى كـردو تۆزێـك لەيـەكترى بڵاوى كردنـەوە). (تـاج/٩ ل/٢١ ز/٥ ژ/١+٢ ش/د/ت+م).

**ڕوونكردنەوە:**

وەك لەكۆمـەڵێ فـەرموودەى پێغەمـەرەوە، كەئـەم فـەرموودەى سـەهلە يەكێكيانە دەردەكەوێ، بـەئاماژە كـردن بڕيـار دادەمـەزرێ، بەتايبـەتى ئەگـەر واتاكەى ڕوون‌و تێگەيەنەربێ، يا قسەشى لەگـەڵدابێ، كەواتـە: ئەگـەر كەسـێ تەڵاقى خواردو لەهەمان كاتدا بەيەك پەنجەى ئامازەى كرد كەمەبەستم يەك تەڵاقە، ئەوە تەڵاقدانەكەى دادەمەزرێ و يەك تەڵاقى دەكەوێ.

## حوكمى تەعريض بۆ حاشاكردن لەمناڵى خۆى چييە

١٧٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلاً أَتَى إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ وَلِدَ لِي غُلَامٌ أَسْوَدَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّـه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ:

هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ: قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: مَا أَلْوَانُهَا؟ قَالَ: حُمْرٌ قَالَ هَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَأَنَّى ذلك؟ قَالَ لَعَلَّهُ نَزَعَهُ عِرْقٌ. فَلَعَلَّ إِبْنَكَ نَزَعَهُ عِرْقٌ.(الحديث ٥٣٠٥ طرفاه في: ٦٨٤٧، ٧٣١٤).

ئـەبو هـورەیرە -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: پیـاوێکی هـۆزی بـەنی فەزارەیی هاتە خزمەتی پێغەمەر –دروودی خودای لەسەر- عەرزی کرد: ئەی پێغەمـەری خـودا! مـن خـۆم سـپیم کەچـی ژنەکـەم کـوڕێکی ڕەشـی بـووە؟ فەرمووی: هیچ وشترت هەیە؟ گوتی: بەڵێ هەمە. فەرمووی: ڕەنگیـان چۆنە؟ گوتی: سـوورن. فـەرمووی: وشـتری تاڵـەیان تیـادا هەیـە؟ گـوتی: بـەڵێ وشـتری تاڵەیان واتیادا، فەرمووی: ئەو وشترە تالانەیان لەکوێوە تـێ کـەوتووە؟ گـوتی: ڕەنگ بێ ڕەگـێ لەڕەگـەزیان ڕەنگـی وابـوو بـێ، ئەمانـەی ئێـستا چووبنەتەوە سـەر ڕەنگـی ئـەو ڕەگـەزە کۆنـەی خۆیـان! فـەرمووی: دە کوڕەکـەی تـۆیش هەروەها. (تاج/٣ ل/١٧٢ ز/٧١ ژ/١ - ش/د/ت/ن).

ڕوونکردنەوە:

واتـە: خانـە گومـانی و بـەدگومانی بـاش نییـە، شـت بـەگومانی بـێ بناغـە سـەرناگرێ، تـەعریـض لـەکاتی وادا کاریگـەریی نییـە ئـەوەتا ئـەم پیـاوە کەلەژنەکـەی خـۆی خانـەگومان بـووە، لەسـەر ئـەم تـەعریزەی هـیچ حوکمـێ دانەمـەزراوە، نەتـەڵاقی ژنەکـەی کـەوتووە، نەکوڕەکـەی لـەکوڕێتی ئـەو دەرچووە.

## مارەیی ژنی شەڕەنەفرین لەگەڵ کراو

١٧٩٥– عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُما في حديث الْمُتَلَاعِنَيْنِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لِلْمُتَلَاعِنَيْنِ حِسَابُكُمَا عَلَى اللّٰهِ أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ لَا سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا. قَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَالِي؟ قَالَ: لَا مَالَ لَكَ إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ.(الحديث ٥٣١٢

اطرافـه في: ٥٣١١، ٥٣٤٩، ٥٣٥٠). بڕوانـه: (ژمـاره/١٦٧٥تجريـد + ١٦٧٦ = ٤٧٤٥ فتح + ٤٧٤٧ فتح = بەرگی/٤ ل/٤٦٣ + ٤٦٦)

لـەم گێڕانـەوەدا دەفـەرموێ: ئیبنـو عومـەر -ڕەزای خودیـان لێ بـێ- دەفـەرموێ: پێغەمـەر -دروودی خـودای لەسـەر- بـەو ژن‌و مێـردەی فـەرمو، کەلـەناو مزگەوتەکـەی پێغەمـەردا شـەڕە نـەفرینیان کـرد: حیـساب‌و پرسینەوەتان لەسەر خودایە، دیارە کەئێوە یەکێکتان درۆ دەکەن، ئیتر ئەم ژنە لەژنی تۆ دەرچوو، وە مافت نەما بەسەریەوە و فرت پێیەوە نەماوە). پیاوەکەی مێردی ژنەکەیش گوتی: ئەی ماڵەکەم، ئەی ئەوماڵەی کەلەجیاتی مارەیی داومە پێی؟ فەرمووی -دروودی خودای لەسەر- : ماڵت ناکەوێ، ئەو مارەیەی داوتە پێی بووە بەهی خۆی، چونکە ئەگەر قسەکەت راستبێ ئەوە ماڵەکەی دەکەوێ و ئەومارەییە دەبێ بەهی ئەو لەباتی ئەوە کەلەمەوپێش ژنت بووەو لەباخەڵت گرتووە، خۆ ئەگەر بوختانیشت کردبێ بۆی ئەمەیانت خراپتر).

## کل بۆ ژنی ڕەشپۆش

١٧٩٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنَّ امْرَأَةً تُوُفِّيَ زَوْجُهَا فَخَشُوا عَلَى عَيْنَيْهَا فَأَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَأْذَنُوهُ فِي الْكُحْلِ فَقَالَ لَا تَكْتَحِلْ قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَمْكُثُ فِي شَرِّ أَحْلَاسِهَا أَوْ شَرِّ بَيْتِهَا فَإِذَا كَانَ حَوْلٌ فَمَرَّ كَلْبٌ رَمَتْ بِبَعَرَةٍ فَلَا حَتَّى تَمْضِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ.(الحديث ٥٣٣٨، طرفاه في: ٥٣٣٨، ٥٧٠٦)[١٧٦٩].

زەینەبی ئەبو سەلەمە -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- فەرمووی: بیستم لەدایکم لە ئوم سەلەمە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنێ هاتە خزمەتی پێغەمەر -دروودی خودای لەسەر- گوتی: قوربان: کچەکەم مێردەکەی مردووە، هێشتا

[١٧٦٩] اخرجه مسلم في الطلاق، باب: وجوب الإحداد في عده الوفاه رقم/١٤٨٨.

عیددەی تەواو نەبووە، چاویشی دێشێ ئایا چاوی بڕێژێ؟ فەرمووی: (نەء) ئەوسا فەرمووی: (ۆی تەنیا چوار مانگ و دەشەوە، ئەویش لەبارو دۆخێکی لەبارو ئەوپەڕی پاكو خاوێنیدا، کەچی ئێوە هێشتا پەلە پەلی لێ دەکەن و دەتانەوێ لێی بدزنەوە، بەڵام جاران لەسەردەمی نەزانیدا، لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ ئەوسا پشقلەکەتان فڕێ دەدا).

حومەید -ڕەحمەتی خودای لێبێ- کەئەم فەرموودەیە لەزەینەبەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەزەینەبم گوت: لەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ ئەوسا پشقلەکەتان فڕێ دەدا، واتەی چی؟ فەرمووی: جاران ژن کە مێردەکەی دەمرد دەچووە ناو کولبەیەکەوە و جلێکی زۆر خراپی لەبەر دەکرد، وە بۆنی خۆش و گوڵاوو شتی وای لەخۆی قەدەغە دەکرد، جا تاساڵێ دەڕۆیی ئەمە حاڵی ئەم ژنە بوو، ئەوجا وڵاخێکیان بۆ دەهێنا، ئیتر ئەو وڵاخە کەربوایە، یا مەڕ بوایە، یا باڵندە بوایە، ئەوژنە خۆی پێ پاك دەکردەوە، بەڵام بەدەگمەن ڕێ دەکەوت کەئەو ژنە خۆی بەشتێ پاك بکاتەوە و ئەوشتە لەبەرئەو پیسی و پۆخڵییە نەمرێ!

ئەوسا ژنەکە لەکوڵبەکەی دەهاتە دەرەوە و پشقلێکیان دەدایە دەستی، ئەویش پشقلەکەی تووڕدەدا، نیشانەی ئەوە بوو کەئیتر عیددەی تەواو بووە. ئیتر لەوە دوا تازێی دەشکاند و ئەوسا ئەگەر ئارەزووی بکردایە، وەك جارانی، جل و بەرگی ئاسایی لەبەر دەکردو، بۆن و گوڵاو و شتی وای بەکاردەهێنایەوە!!. (تاج/٣ ل/١٨٦ ز/٧٩ ژ/٤ ش/د/ت/ن).

ڕوونکردنەوە:

گێڕانەوەکەی حومەید، کەوا لەتاج دا، دەقی فەرموودەی ژمارە/٥٣٣٧، لەفەتحولباریدا، بۆیە منیش کردم بەتەفسیری فەرموودەی ژمارە/٥٣٣٨، ئەمێرە کە فەرموودەی ژمارە/١٧٩٦ی تەجریدەکەیە، لەبەر ڕۆشنایی ئەم دانایی و حیکمەتەی کەوا لەم شیعرەدا:

**نووسەر نوێنەری چەرخی خۆیەتی**

**بەزمانی ڕۆژ گوفتوگۆیەتی!**

لەبەر ڕۆشنایی ئەم حیکمەتە دەڵێم:

(لەپێش هاتنی ئیسلاما، لەسەراسەری جیهانا، بەکۆی ڕا، ژن لەوپەڕی کەساسیو داماوی و چەوساوەییو بەشخوراویدا بوو، کۆمەڵێ نەریتو رەفتاری ناهەموار، باڵی کێشابوو بەسەر جیهانی ژناندا، بگرە حاڵی کۆیلەو بەندەی زەڕخرِیدە لەحاڵی ژن گەلێ باشتر بوو، تەنانەت ژنان خۆشیان دیلو بەیدەستی ئەو هەموو کۆتو زنجیرو بەندو باوانە بوون، کە کۆمەڵگاو نەریتو باوی ڕۆژگار سەپاندبووی بەسەریانا، وەئەم دەستوور و باوو نەریتو تەقالیدانە گەرچی هەیان بوو پاشماوەی حوکم و بڕیارەکانی ئایینە پێشینەکان بوو، بەڵام ئەوەندە پواو و سوابوون، لەکەڵك کەوتبوون وەك کراسە کۆنێکی دڕاوی پینە پینە کراو، کە لە قوماشێکی چاك دروستکرابێ، ئاوا بەرباد بوو بوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وا لە قوڵایی و ناخی دڵو دەروونی جەماوەردا دەڤیان بەستبوو، وە ڕەگ و ڕیشەیان داکوتا بوو، هەموو هەوڵو تەقەلایێ بۆ گۆڕین و باشکردن و نوێژەنکردنەوەیان، بەشێتی و لەرێ دەرچوون لە قەڵەم دەدرا. لەچین، لەهیند، لە خۆرهەڵات بەگشتی ژن لەپایەیەکی هەرە نزمدا ریز بەندی دەکرا، ژن خۆی دەسووتاند لەدوا مردنی مێردی، بەپێی فەرمانی ئایین، لە تیبت قەومەکەی دەلا لایما، هەتا ئەمڕۆش نەك فرە مێردی باو بوو لەناویانا، بەڵکوو بەرەبابێ، دوو برابن، یا زیاتر، یەك ژن دێنن!! جاری واهەیە ژنەکەو برای یەکەم تەمەنیان پەنجا ساڵە، ئاخر برا کە بەئۆتۆماتیکی دەبێ بەمێردی براژنەکەی تەمەنی دەساڵە!!

لە دوورگەی عەرەب ئەمە حاڵی ژن بوو: (بەمنداڵی زیندە بەچاڵ دەکرا، بە گەورەیی وەك ئاژەل دەفرۆشرا، ژن برێتی بوو لەبەشێ لەسامان و ماڵو دارایی کەسوکاری، یا مێردی، لەپاش مردنی مێردەکەی ژن دەبوو بە

کەلەپووری میراتبەرانی مێردەکەی، گەلێ جار کوڕی مردووە کە مارەی دەکردەوە بۆ خۆی، فرە مێردی هەر زۆر باو بوو، ژن هەبوو دەمێردی هەبوو، ئەگەر منالی ببوایە ڕەگەزناس (قائف) دەیلکان بەیەکێ لەو دەمێردەوە!)

لە ئایینی دەسکاریکراوی زەردەشتیشدا، کە ئایینی ڕەسمی دەوڵەتی ئێران بوو، کەیەکێك بوو لەگەورەترین سەرچاوەی ژیارو حەزارەی کۆن و بگرە ئێستایش، کچ مەگەر زۆر ناشیرین بوایە یا پەککەوتە بوایە، دەنا باوکی بۆ خۆی مارەی دەکرد، هەتا لەبەر باوکی نەمایەتەوە بەر برای نەدەکەوت، دەی دەبێ چی لەوە ناخۆشتر و دزێوتربێ، دایك کاتێ کچێکی دەبێ، سوور بزانێ، وەختێ کە خۆی پیر دەبێ و ئەم کچەی گەورە دەبێو خاڵو میل دەڕێژێ، ببێ بەهەوێی، ئەمەیە دەڵێن: بەچکە مار گەورەکردن! لە یۆنان و میسر حاڵی ژن لەمە باشتر نەبوو، لە ئەوروپا گومانیان هەبوو لەوەدا کەژن مرۆڤە یا ئاژەڵە!! بەکۆی دەنگ، ژن لەهەموو جیهانا هەتا کاتی هاتنی ئایینی ئیسلام: (بەناو ئازاد بوو، بەڵام بەمەعنا بەندە وکۆیلە بوو. ئەمە کورتەیەکی پوختە لەڕاستیی حاڵی ژن. بەڵام کاتێ ئیسلام هات، ئەم ڕاستییەی جاڕدا، وە بەرکردەوە پیادەی کرد، دەرووی ڕەحمەتی بۆ ژنان خستە سەرپشت ﴿النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ : ژنان لەماف و ڕێزا، مانەندی پیاوانن. هاوکەرتی یەکترین، وەك چۆن سێوێ بیکەیت بەدوو لەتی یەکسانەوە ئاوا!!﴾.

ئیتر ئەم بانگەوازەی ئیسلام بەجیهاندا، وەك ئاگرو پووش بڵاو بۆوە، وەهەتا ئەمڕۆیش ژن هەر لەپێشکەوتن دایە. تاقە پێوەرێ بۆ ئەم پێشکەوتنە، یا لەمپەرێ لەبەردەم ئەم پێشکەوتنەدا، تەنیا دوو شتە، لەئاینی پیرۆزی ئیسلام دا:

**یەکەم**: کاروباری پەرستش و خواپەرستی، چ بۆ ژن، چ بۆ پیاو، شیاوی دەسکاری و دەست تێوەردان نییە.

**دووەم**: گەشە کردنی مافی ژن و بەرەو پێش چوونی، نابێ لەسەر حیسابی شەرەف و نامووس و حەیسیەت بێ، چونکە ئافەرت بەبێ خووی بەرزو بەبێ ئابڕوو مەندی، لەگوڵی ژاکاو دەچێ، کە نەبۆی هەبێ و نەڕەنگ، ئەمە حەقیقەتەکەیە جا ئەوەی کەپێی رازیە ئەوە حەقی قەبووڵە، ئەوەیشی کەشتێ تر دەڵێ بە دەم ئیسلامەوە لەم لاینەوە، ئەوە یا درۆزن و بوختانچی و نیاز پیسە، یا گێلۆکەو نەفامە و دوژمنەو لەبەرگی دۆستا. وەلە راستیشدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام کوشتەی دەستی ئەم دوو کۆمەڵەیەیە.

بسم الله الرحمن الرحيم

مامۆستای عەسقەلانی -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: نامەی تەڵاق و پاشکۆکانی، لەلیعان و ظهار و شتی تریش، سەدو هەژدە فەرموودەی بەرزەوە کراوی لەخۆ گرتووە، بێڕشتە (تعليق)ەکانی بیست و شەش فەرموودەن، ئەوانی تریان پەیوەست –موصول-ن، دووبارەکانیان نەوەدو دوو فەرموودەن، پوختەکەیان: (١١٨ – ٩٢ = ٢٦) بیست و شەش فەرموودەن پێشەوا موسلیمیش ئەم پوختەیەی وەك پێشەوا بوخاری گێڕاوەتەوە، بێجگە لەمانەیان:

١. فەرموودەکەی عائیشە، لەبارەی داستانی بنت لجونە وە = ١٧٨٧ تجريد = ٥٢٥٤ فەتح.

٢. فەموودەکەی ئەبو ئوسەیدیش لەم بارەیەوە = ١٧٨٨ تجريد = ٥٢٥٥ فەتحول باری.

٣. فەرمودەکەی سەهلی کوڕی سەعد لەم بارەیەوە = ٥٢٥٦ فتح الباري.

٤. تەعلیقەکەی ئیمامی عەلی کەدەفەرموێ: (أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ القَلَمَ رُفِعَ عَنْ ثَلاَثَةٍ...) کەوا لەبابی (١١)دا، لە بابەکانی کیتابی تەڵاق، لەپێش ژمارە: ٥٢٦٩ فەتح.

٥. فەموودەکەی ئیبنوعەباس، لەبارەی خولعی ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیس = ١٧٩١ تجرید = ٥٢٧٣ فتح الباری.

٦. حەدیسەکەی ئیبنوعەباس سەبارەت بە مێردەکەی بەریرە = ١٧٩٢ تجرید = ٥٢٨٣ فتح الباری.

٧. فەرموودەکەی ئیبنو عەباس (كَانَ الْمُشْرِكُونَ عَلَى مَنْزِلَتَيْنِ..) = ٥٢٨٦ فتح الباری.

٨. فەرموودەکەی ئیبنو عومەر لەبارەی مارەکردنی ژنە زمیەوە = ٥٢٨٥ فتح الباری. عەینی دەفەرموێ: (وهذا الحديث من أَفْرَادِهِ..).

٩. فەرموودەکەی لەبارەی روونکردنەوەی ئایەتی ئیلائەوە = ٥٢٩٠ فەتح.

١٠. فەرموودەکەی میسوەر لەبارەی سوبەیعەوی ئەسلەمیەوە = ٥٣٢٠ فتح الباری شەرحی صەحیحی بوخاری.

١١. فەرموودەکەی عائیشە: (كانت فاطمة بنتُ قيسٍ في مكانٍ وحشٍ) = ٥٣٢٥، ٥٣٢٦ فتح الباری.

هەروا مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ ئەم کتابە سەد بیستراو —أثر— یشی واتیادا. کە ریوایەت کراون لەصەحابەکانو لەچینەکانی دوا ئەوانەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٧٢- نامەی ژێوار و نەفەقە - كتاب النَّفَقَاتِ

١٧٩٧- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا أَنْفَقَ الْمُسْلِمُ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً.(الحديث ٥٣٥١ طرفه في: ٥٥ فەتح/٥١ تجريد. لەوێ وەرگەڕاوەكەی ڕۆیشت = بەرگی یەكەم ل/٧٧)[١٧٩٧].

١٧٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ أَوِ الْقَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ.( الحديث ٥٣٥٣، طرفاه في: ٦٠٠٦، ٦٠٠٧)[١٧٨٩].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر- فەرمووی: (كەسێ تێبكۆشێ لەپێناوی ژنی بێ مێردو مرۆڤی هەژارداو، ساغ بۆ ڕەزای خودای گەورە بەخێویان بكاو خزمەتیان بكا، ژێوار و گوزەرانی ئاسوودەیان بۆ فەراهەم بهێنێ، ئەوە بەقەد ئەو كەسە خێرو پاداشی بۆ هەیە: كەساغ لەبەر ڕەزای خودا خەبات دەگێڕێ و غەزادەكاو ناودەردەكات بەغەزاكار لەڕێگەی خوادا، یا بەقەد ئەو كەسە خێرو پاداشی باشی بۆهەیە كەبەشو هەرشەو نوێژبكا و لێی سارد نەبێتەوەو، بە ڕۆژیش هەمیشە بەرۆژو بێو ساڵ دوانزە مانگە بەرۆژوو بێ یەك ڕۆژی لێنەشكێنێ). (ریاض/١ ل/٢٣٢ = ژمارە/٦/٢٦٥-١).

---

[١٧٩٧] اخرجه مسلم في الزكاة، باب: فضل النفقة، على الأقربين، رقم:١٠٠٢.

[١٧٨٩] اخرجه مسلم في الزهد و الرقائق، باب الأحسان إلى الأرملة... رقم/٢٩٨٢.

١٧٩٩- عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَبِيعُ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ، وَ يَحْبِسُ لِأَهْلِهِ قُوتَ سَنَتِهِمْ.(الحديث ٥٣٥٧)[1799].

**عومەر —ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر —دروودی خوای لەسەر- کەبەری باخە خورماکانی بەنی نەزیری دەفرۆشت، کە لەفەیئی غەزای خەیبەر دەستی کەوتبوو، هەموو ساڵێ بەشی نانی ساڵی خێزانەکەیی لێدائەناو، ئەوەی لەوە دەمایەوە، دەیدا بەچەك و تفاقی غەزا). (تاج/٣ ل/١٩٦ ژ/٧).**

**ماموستای گەورەو مەزن عەسقەلانی دەفەرموێ: نامەی ژێوار و نەفەقات بیستو پێنج فەرموودەی بەرزەوەکراوی لەخۆگرتووە، سیانیان بێ ڕشتن، هەموویان دووبارەن سیانیان نەبێ، ئەو سیانەیش ئەمانەن، فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە (السّاعي على الأرْمَلَةِ والمِسْكِينِ) = ١٧٩٨ تجريد = ٥٣٥٣ فتح البارى موسليم گێڕاویەتیەوە. تەعلیقەکەی ئیبنوعەباس و تەعلیقەکەی موعاویە لەبارەی ژنانی قورەیشەوە = ٥٣٦٥ فەتح لەموسلیم دا تەخریج نەکراون.**

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٧٣- نامەی خواردەمەنییەکان ٭ كِتَابُ الأطعِمَةِ

١٨٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قال: أَصَابَنِي جَهْدٌ شَدِيدٌ فَلَقِيتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ فَاسْتَقْرَأْتُهُ آيَةً مِنْ كِتَابِ اللّٰهِ فَدَخَلَ دَارَهُ وَفَتَحَهَا عَلَيَّ فَمَشَيْتُ غَيْرَ بَعِيدٍ فَخَرَرْتُ لِوَجْهِي مِنَ الْجَهْدِ وَالْجُوعِ فَإِذَا رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِي فَقَالَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ فَقُلْتُ لَبَّيْكَ رَسُولَ اللّٰهِ وَسَعْدَيْكَ فَأَخَذَ بِيَدِي

---

[1799] سبق في: ١٢٥٨ تجريد = ٣٠٩٤ فەتح = بەرگی/٣ ل/٣٨١. -المترجم-

فَأَقَامَنِي وَعَرَفَ الَّذِي بِي فَانْطَلَقَ بِي إِلَى رَحْلِهِ فَأَمَرَ لِي بِعُسٍّ مِنْ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ ثُمَّ قَالَ عُدْ يَا أَبَا هِرٍّ فَعُدْتُ فَشَرِبْتُ ثُمَّ قَالَ عُدْ فَعُدْتُ فَشَرِبْتُ حَتَّى اسْتَوَى بَطْنِي فَصَارَ كَالْقِدْحِ قَالَ فَلَقِيتُ عُمَرَ وَذَكَرْتُ لَهُ الَّذِي كَانَ مِنْ أَمْرِي وَقُلْتُ لَهُ: فَوَلَّى اللَّهُ ذَلِكَ مَنْ كَانَ أَحَقَّ بِهِ مِنْكَ يَا عُمَرُ وَاللَّهِ لَقَدِ اسْتَقْرَأْتُكَ الْآيَةَ وَلَأَنَا أَقْرَأُ لَهَا مِنْكَ قَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ لَأَنْ أَكُونَ أَدْخَلْتُكَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي مِثْلُ حُمْرِ النَّعَمِ .(الحديث ٥٣٧٥ طرفاه في: ٦٢٤٦، ٦٤٥٢)[١٨٠٠].

ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: جارێ لەتاوبرسێتی ووزەم تیادا نەمابوو، ویستم بەبیانوویەك كەسێ لەگەڵ خۆی بمباتەوە و تێرنانم و ئاوم بكا، دەرچووم بەم نیازە گەیشتم بەعومەری كوڕی خەتتاب، داوام لێكرد كە فلانە ئایەتم لەقورئانی پیرۆز پێ بڵێ، لە دڵەوە مەبەستم ئەوە بوو كەبەم بۆنەیەوە هەست بكا كەمن برسیمو نانو ئاوێكم پێ بدا، بەلام عومەر ئایەتەكەی پێ گوتمو لەمەبەستەكەم حاڵی نەبوو، بەجێی هێشتمو ڕۆیشتەوە بۆماڵەوەی.

جا تۆزێ ڕۆیشتم و لەبەر شەكەتیو برسێتی لەپەڕووكەوتمو بوورامەوە و لەسەر خۆ چووم، كاتێكم زانی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەدیارم ڕاوەستاوە، فەرمووی: (ئەبو هیڕ!). گوتم: بفەرموو ئەی سەروەر، فەرموودەت لەسەر سەرە. جادەستی گرتمو هەڵی ساندمە سەر پێ و لەگەل خۆی بردمیەوە بۆ ماڵەوە، هەستی كرد كە لەبەرچی وام بەسەرهاتووە فەرمانی كرد پڕجامێ شیریان بۆم هێنا، لێم خواردەوە، بەلام فەرمووی: (دووبارەی بكەرەوە ئەی ئەبو هورەیرە!) منیش دووبارە شیرم خواردەوە، دیسان فەرموویەوە: (دیسانەوە دووبارەی بكەرەوە). منیش بۆجاری سێهەم تەواو تەواو تێرم لە شیرەكە خواردەوە، هەتا سكم وەك دووخ ڕێك بۆوە.

---

[١٨٠٠] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي هريرة، في استقرائه عمر الآية (فتح/١٠ ص/٧٣٤ -خاتمة كتاب الأطعمة) -المترجم-.

ئەبو هورەیرە فەرمووی: لەوە دوا کە گەیشتم بە عومەر، حاڵیم کرد، لەحاڵەکەو چیرۆکەکەم لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە، وەپێم گوت: ئەی عومەر! خوای گەورە ئەم ئەرکەی سپارد بەپێغەمەری خودا، کەدیارە ئەو لەتۆ لەپێشترە بۆکاری خێری وا. عەرزیشم کرد: بەخوا کەئەو ئایەتەم لەتۆ پرسییەوە مەبەستم ئەوە بوو کەلەو شەکەتیو برسێتییە ڕزگارم بکەی، دەنا خۆم لەتۆ ئایەتەکەم باشتر دەزانی!!

عومەر، کە لەحاڵەکە حاڵی بوو فەرمووی: تازە ئەوەم لەکیس چوو، بەوخوایە تۆم ببردایەتەوە بۆماڵەوە لەگەڵ خۆما و ئاوو نانم بۆدانایتایە، ئەوەم بەلاوە باشترە لەڕانەوشتری سوور، کە باشترین سامانی عەرەبن.

١٨٠١- عَنْ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْه يَقُولُ: كُنْتُ غُلَامًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا غُلَامُ سَمِّ اللّٰهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ. فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ.(الحديث ٥٣٧٦، طرفه في: ٥٣٧٧، ٥٣٧٨)[١٨٠١].

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: مناڵ بووم، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی بەخێوی دەکردم، چونکە زڕکوڕی بووم، کوڕی ئومموسەلەمە بووم، کە هاوسەری پێغەمەر بوو، -دروودی خوا لەسەر پێغەمەرو ڕەزای خوا لەهەموو هاوسەرە بەڕێزەکانی-، کەنانم دەخوارد دەستم دەگێڕا بەناو لەگەنەکەدا، بەئارەزووی خۆم، جا حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- تەمێی کردمو فەرمووی پێم: (ڕۆڵە: کەنان دەخۆی لەسەرتاوە ناوی خوابێنەو بیسمیلا بکەو، بەدەستی ڕاستت بخۆو لەبەردەمی خۆتەوە بخۆو دەست مەگێڕە بەم لاولادا، مەگەر لەبەر عوزر).

---

[١٨٠١] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: آداب الطعام و الشراب وأحكامهما، رقم/٢٠٢٢.

عومەر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ئیتر لەوساوە هەتا ئێستا هەربەم شێوەیە نان دەخۆم کەپێغەمەر فێری کردووم. (تاج/٤ ز/١٦ ل/٤٦ ژ/٢ — سەرباسی دەستووری نانخواردن —ش/د/ت + ریاض/١ ز/٣٨ ل/٢٥٠ ژ/٢٩٩ + ریاض/٢ ل/٢٤٨ ز/١٠٠ ژ/٧٢٨).

ڕوونکردنەوە:

سوننەتە شت بەدەستی ڕاست شت بخورێ، مەگەر لەبەرناچاری و مەهانەی ڕەوا، وەك نەخۆشیو برینو شتی وا، بەزەینم کەسێ چەپەوانە نەبێ واباشە، کەهەوڵ بدا بە دەستی ڕاست بخوا، بەڵام ئەگەر بۆی زەحمەت بوو، دروستە دەستی چەپی بەکاربهێنێ.

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە -ڕەزای خوای لێ بێ- هەنەزای پێغەمەر بووە، لەساڵی دووی کۆچی دا، کاتێ باوكو دایکی کۆچکار بوون، لەخاکی حەبەشە لەدایك بووە، لە ڕۆژەکەی خەندەقا لەگەڵ ئیبنو زوبەیرا، لەناو خەندەقەکەدا بوون، لەگەڵ سوپای ئیمامی عەلیدا ئامادەی جەنگی ئەل-جەمەل بوو، کەلەدژی لەشکری عائیشە بوو، هەلی کردی بە بەرپرسی سەر وڵاتی فارسو بەحرەین، کۆمەڵێ فەرموودە دەگێڕێتەوە، لەریجالی صەحیەینە، هەروا لەکتێبە شایستەکانی تری فەرموودەدا فەرموودەی تری هەیە، ئەم زاتانە ڕاوی فەرموودەکانی بوون: محمدی کوڕی، سەعیدی کوڕی مسیّب، عوروە، ئەبو ئومامە، وەهبی کوڕی کیسان و کەسانی تریش، لەسەردەمی جێنشینی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانا، لەمەدینە ساڵی هەشتاو سێی کۆچی، بەمەرگی خوا مردووە، نزیکەی هەشتا ساڵێ ژیاوە، دوو فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، یەکێکە لەهاوڕێ بچوکەکانی پێغەمەر -درودی خوای لەسەر بێ- تەمەن درێژ بووە، بڕوانە بەرگی یەکەم، لاپەڕە/١١٨ فەرموودەی ژمارە/٩٤ بۆ زانینی ژیاننامەی ئوم سەلەمەی دایکی.

١٨٠٢- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنها: تُوفِّيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِين شَبِعْنَا مِنْ الأَسْوَدَيْنِ: التمرِ وَ المَاءِ. (الحديث ٥٣٨٣ طرفه في: ٥٤٤٢)[١٨٠٢].

عائيشه -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: هەل لەگەڵ تێرسکی خۆمان لەخورماو ئاو خوارد، ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وەفاتی کرد. (تاج/٩ ل/٣١٦ ژ/٥ + ٦ ) + (رياض صالحين/٢ ل/٦٤ ز/٦٥ ژ/٤٩٢).

١٨٠٣- عَنْ أَنسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: مَا أَكَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُبْزاً مُرَقَّقاً، وَلاَ شَاةً مَسْمُوطَةً حَتَّى لَقِيَ اللهِ. (الحديث ٥٣٨٥ طرفاه في: ٥٤٢١، ٦٤٥٧)[١٨٠٣].

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- عەتا چووە دیوانی خودا، نەنای تێریو نەمەڕی بریانی نەخوارد).

١٨٠٣-م- وَعَنْهُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فِي رِوايَةٍ، قَالَ: مَا عَلِمْتُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكَلَ عَلَى سُكْرُجَّةٍ قَطٌّ، وَلاَ خُبْزٍ لَهُ مُرَقَّقٍ قَطٌّ، وَلاَ أَكَلَ عَلَى خُوَانٍ قَطٌّ. (الحديث ٥٣٨٦ طرفاه في: ٥٤١٥، ٦٤٥٠)[١٨٠٣-م].

دیسان ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: من ئاگام لێ بێ پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەسەر قەرەوانەی ڕازاوە هەرگیز نانی نەخواردووە، یالەسەر خوان (مێز) نانی نەخواردووە، یانانی تیری بۆ نەکراوە. بەقەتادەیان گوت: ئەی لەسەرچی نانیان دەخوارد؟ فەرمووی: لەسەر سفرە. (تاج/٤ ز/١٩ ل/٦٥ ژ/٥).

---

[١٨٠٢] اخرجه مسلم في الزهد و ارقاق، رقم: ٢٩٧٥.

[١٨٠٣] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث انس (ما رأى شاة سَميطا). فتح/١٠ ص/٧٣٤ - خاتمة كتاب الأطعمة. -المترجم-

[١٨٠٣-م] الظاهر لم يوافقه مسلم على تخريجه -المترجم-

١٨٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰه عَنْه أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: طَعَامُ الِاثْنَيْنِ كَافِي الثَّلَاثَةِ وَطَعَامُ الثَّلَاثَةِ كَافِي الْأَرْبَعَةِ.(الحديث ٥٣٩٢)[١٨٠٤].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (نانی دووکەس بەشی سێ کەس دەکا، وەنانی سێ کەس بەشی چوار کەس دەکا). (تاج/٤ ل/٦٧ ز/٢٠ ژ/١ ش/ت) + (ریاض/٢ ل/٢٦٢ ز/١١٠ ژ/٧٥٥ + ژ/٧٥٦).

١٨٠٥- عَنْ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما أَنَّهُ لَا يَأْكُلُ حَتَّى يُؤْتَى بِمِسْكِينٍ يَأْكُلُ مَعَهُ، قَالَ نَافِعُ الرَاوِي عَنْهُ: فَأَدْخَلْتُ رَجُلًا يَأْكُلُ مَعَهُ فَأَكَلَ كَثِيرًا فَقَالَ يَا نَافِعُ لَا تُدْخِلْ هَذَا عَلَيَّ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ.(الحديث ٥٣٩٤ – طرفاه في: ٥٣٩٣، ٥٣٩٥)[١٨٠٥].

نافیع –ڕەحمەتی خودای لێبێ- فەرمووی: دەستووری ئیبنوعومەر -ڕەزای خوای لێ بێ- وابوو نانی بەتەنیا نەدەخوارد، هەمیشە نانی لەگەڵ هەژاراندا دەخوارد، ئەگەر کەس نەبوایە، هەژارێکیان بۆ پەیدا دەکرد، هەتا نانی لەگەڵدا بخوات، جا جارێ هەژارێکم برد بۆلای، نانی لەگەڵیدا خوارد، بەڵام زۆر زۆری خوارد. فەرمووی: ئەی نافیع! جارێ تر ئەمە مەهێنە بۆم کەنانم لەگەڵدا بخوات، چونکە من لەپێغەمەرم ژنەوتووە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (موسوڵمان کەمخۆرە و بەقنیاتە و خواردنی بەپیتو فەڕە، دەڵێی لەچاو کافردا یەك گەدەی هەیە، بەڵام بێبڕوا چاو برسیەو سکە ڕۆو سکدڕاوە و خواردنی بێ پیت و فەڕە، بۆیە هەردەخواو تێرناخوا و تێر نابێ،

---

[١٨٠٤] اخرجه مسلم في الأشربة، باب فضيلة المواساة في الطعام: رقم/٢٠٨٥.

[١٨٠٥] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: المؤمن ياكل في نعيّ واحد رقم/٢٠٦٠-٢٠٦١.

وەك لەچاو پیاوی موسوڵماندا حەوت ورگی هەبێ وایە). (تاج/٤ ل/٥٣ ز/١٦ ژ/١٩ + ٢٠ ش/ت + م/ت).

١٨٠٦– عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رَضِي اللَّهُ عَنه قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لِرَجُلٍ عِنْدَهُ: (لاَ آكُلُ وَ أَنَا مُتَّكِيءٌ.(الحديث ٥٣٩٩ طرفه في: ٥٣٩٨)[١٨٠٦].

ئەبو جوحەیفە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمەردا بووم -دروودی خوای لەسەر بێ- پیاوێکی لەلابوو، پێی فەرموو: من بەپاڵ کەوتنەوە شت ناخۆم. (تاج/٤ ل/٥١ ز/١٦ ژ/١٢ ب/د/ت/ن) + (ریاض الصالحین/٢ ل/٢٥٨ ز/١٠٨ ژ/٧٤٦).

١٨٠٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنه قَالَ: مَا عَابَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا قَطُّ إِنِ اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِنْ كَرِهَهُ تَرَكَهُ.(الحديث ٥٤٠٩ طرفه في: ٣٥٦٣ = بەرگی/٤ ل/١٠٩)[١٨٠٧].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هەرگیز خراپەی لەخواردن و نان و ئاو نەدەگرت، ئەگەر حەزی لێی بوایە دەیخوارد، دەنا ئەگەر بەدڵی نەبوایە وازی لێ دەهێنا). (تاج/٤ ل/٥١ ز/١٦ ژ/١١) + (ریاض الصالحین/٢ ل/٢٥٣ ز/١٠١ ژ/٧٣٦).

١٨٠٨– عَنْ سَهلٍ رَضِي اللَّهُ عَنه أنه قيل له: هَلْ رئيتُمْ في زمان النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّقِيَّ؟ قَالَ: لاَ، قيل: كنتم تنخلون الشّعير؟ قَال:لاَ ولكن كنّا ننفخُهُ. (حديث ٥٤١٠، طرفه في: ٥٤١٣)[١٨٠٨].

---

[١٨٠٦] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي جحيفة، (لا آكلُ متكئا) (فتح/١٠ ص/٧٣٤ خاتمة كتاب الأطعمة) –المترجم.

[١٨٠٧] اخرجه مسلم في الأشربة: باب: لا يعيب الطعام، رقم/٢٠٦٤. راجع رقم/١٤٣٦ تجريد.

[١٨٠٨] لم يوافقه مسلم على تخريجه (فتح/١٠ ص/٧٣٤ - خاتمة كتاب الأطعمة) -المترجم.

گـوترا بەسـەهل -ڕەزای خـوای لێ بـێ- ئایـا پێغەمـەر -دروودو سـڵاو و صەلاوات و ڕەحمەت و بەرەکات و سۆزو پیرۆزی خوای گەورەو سەروەری لەسەر بێ- ئایا پێغەمەر نانی تیری ئاردە سپی خواردووە؟ فەرمووی: نـە ئێمـەو نـە پێغەمەر، تا ئەو ڕۆژەی کە پێغەمەر چووە دیداری خودا چاومان بەنانی سپی نەکـەوت. گوتیـان پێـی: ئـەی چـۆن چۆنی ئـاردی جۆتـان چـار دەکـرد؟ ئایـا دەتانبێژایەوە؟ فەرمووی: نـەء، بـەڵام فوومـان لێـی دەکـرد، ئـیتر ئـەو سۆس و شتەی کەبادەیبرد ئـەوا دەیـبرد و ئەوەیشی دەمایـەوە دەمـان گرتـەوەو دەمـان شێلاو دەمان کرد بەهەویر. (تاج/٩ ل/٣٢٤ ژ/١٧ ز/٩٩ ت/ب).

١٨٠٩– عَنْ أبي هريرة رَضِي اللَّهُ عَنْه قَال: قَسَمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَوْماً، بَيْنَ أَصحَابِهِ تَمْراً فَأعطَى كُلَّ إنْسَانٍ سَبْعَ تَمَـرَاتٍ، فَأعْطَـانِي سَـبْعَ تَمَـراتٍ، إحداهُنَّ حَشَفَةَ، فَلَمْ يَكُنْ فِيهِنَّ تَمرةٌ أعجَبَ مِنْهَـا شَـدَّتْ فِـي مَـضَاغِي. (الحـديث ٥٤١١، طرفاه في: ٥٤٤١، ٥٤١١م)[١٨٠٩].

ئـەبو هـورەیرە -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: جارێ پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- لەبەرکـەمی خـۆراك، خورمـای دابـەش دەکـرد بەسـەر هاوڕێیانیدا، هەرکەسەی بەژمارە حەوت دەنکی دەداپێمـان، حـەوت دەنکـی دا بەمنیش، دەنکێکیان پووچەڵ بوو، جێـڕەوە بوو بوو، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەیـشا لـەلام لەهـەموویان خۆشـتربوو، چـونکە نووسـا بەمەلاشـوومەوە و بـەگران دەجوورا، وەك بنێشت و ماجووم هەتا تـاوێ جوویم، لەبـەر ئـەوە زۆر خـۆش بوو لەلام. (تاج/٤ ل/٦٨ ز/٢٠ ژ/٤ ب/ت).

[١٨٠٩] لم يَستثنِهِ الشيخ العسقلاني من المتفق عليه. -المترجم-

١٨١٠– و عنه صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ أنه فَرَّ بِقَوْمٍ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ شَاةٌ مَصْلِيَّةٌ، فَدَعَوهُ، فأَبَى أَنْ يَأْكُلَ، وَ قَال: خَرَجَ رَسُولُ اللّهِ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ من الدنيا و لم يَشْبَعْ من خبز الشعيرِ.(الحديث ٥٤١٤)[١٨١٠].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- جارێ لەلای کۆمەڵێ پیاوەوە ڕەت بوون مەڕێکی بریانی یان بۆ دانرابوو، خەریکی خواردنی بوون، خولکی ئەبوهورەیرەیان کرد کەلەگەڵیان دا لەگۆشتی ئەو مەڕە برژاوە بخوات، بەلام ئەبو هورەیرە قاییل نەبوو، لێی نەخوارد، وە فەرمووی: (پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هەتا لەدنیادەرچوو، تێری لەنانی جۆ نەخوارد، ئیتر من چۆن دلم بەرایی بدا، کەقاورمەو گۆشتی بریانی بخۆم).

١٨١١– عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْها قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ مِنْ طَعَامِ بُرٍّ ثَلاثَ لَيَالٍ تِبَاعًا حَتَّى قُبِضَ.(الحديث/٥٤١١ طرفه في: ٦٤٥٤)[١٨١١].

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: لەوکاتەوە کە پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کۆچی کرد بۆ مەدینە، تا ئەو ڕۆژەی کەخودا بەڕەحمەت بردیەوە بۆلای خۆی، خۆیو خێزانەکەی سێ شەو لەسەر یەك تێر سکی خۆیانیان لەنانی گەنم نەخواردووە!. (تاج/٩ ل/٣١٥ ز/٩٦ ز/١ ش/ت).

١٨١٢– عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْها زَوْجِ النَّبِيِّ صَلّى اللّه عَلَيْهِ وَسَلّمَ: أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا فَاجْتَمَعَ لِذَلِكَ النِّسَاءُ ثُمَّ تَفَرَّقْنَ إِلَّا أَهْلَهَا وَخَاصَّتَهَا أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ فَطُبِخَتْ ثُمَّ صُنِعَ ثَرِيدٌ فَصُبَّتِ التَّلْبِينَةُ عَلَيْهَا ثُمَّ قَالَتْ: كُلْنَ مِنْهَا فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ صَلّى اللّه عَلَيْهِ وَسَلّمَ يَقُولُ: التَّلْبِينَةُ مُجِمَّةٌ لِفُؤَادِ

---

[١٨١٠] قال العيني: (والحديث من افراده) (العمدة/٢١ ص/٥٣) -المترجم-.

[١٨١١] اخرجه مسلم في أوائل الزهد و الرقاق، رقم: ٢٩٧٠.

الْمَرِيضِ تُذْهِبُ بَعْضَ الْحُزْنِ.(الحديث ٥٤١٧ طرفاه في: ٥٦٨٩ – ٥٦٩٠)[1812].

عائیشه -ڕەزای خوای لێ بێ- کەهاوسەری پێغەمەرە -دروودی خوای لەسەر بێ- کاتێ کەسێکی دەمرد، ژنان کەلێی کۆ دەبوونەوە، کاتێ کەبڵاومیان لێ دەکردو دەمانەوە بەس کەس و کارو دەست و پێوەندەکەی خۆی، دەستووری دەدا پڕ دیزەیەك پەڵووڵەیان دەکردو دەیان کرد بەسەر تریتدا، ئەوسا عائیشە بەژنەکانی دەگوت: لەمە بخۆن، چونکە من خۆم ژنەوتوومە لە پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (پەڵووڵە بەری دڵی نەخۆش دەگرێ و ناوسکی دەحەوێنێتەوەو خەم و خەفەتیش هەنێ دەڕەوێنێتەوە!).

(تاج/٤ ل/٢٠٨ ز/٦٧ ژ/١+٢+٣).

١٨١٣– عَنْ حُذَيْفَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قال: سَمِعْتُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقول: لَا تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ وَ لَا الدِّيبَاجَ وَ لَا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلَا تأكُلُوا فِي صِحافِها، فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَنَا فِي الآخِرَةِ.(الحديث ٥٤٢٦ أطرافه في: ٥٦٣٢، ٥٦٣٣، ٥٨٣١، ٥٨٣٧)[1813].

حوزەیفە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لەپێغەمەری خۆشەیست و نازدار -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (ئاوریشم و دیباج لەبەرمەکەن، لەحاجەت و قاپ و قاپاغی زێڕو زیویشا، نەشت بخۆن و نەشت بخۆنەوە، چونکە ئەمانە لەجیهانا بۆ ئەوانن و لەدواڕۆژدا بۆ خۆمانن).

(تاج/٤ ل/٦٤ ز/١٩ ژ/١ ش/د/ت/ن).

---

[1812] اخرجه مسلم في السلام، باب: التلبينة مجمة لفؤاد المريض رقم/٢٢١٦.

[1813] اخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: تحريم استعمال إناء الذهب و الفضة، رقم/٢٠٦٧.

لەگێڕانەوەکی تاجول ئوصولدا: هەرکەسێ لەحاجەتی زێڕدا، یا لەحاجەتی زیودا شت بخوا، پاشت بخواتەوە ئەوە قلپە قلپ ئاگری دۆزەخ دەڕژێنێتە ناوسکی خۆیەوە).

ڕوونکردنەوە:

مەبەست لەخۆمان موسوڵمانانە، مەبەستیش لەوان ناموسوڵمانانە، لێرەدا دوو خاڵی سەرەکی هەیە:

**یەکەم**: بڕیاری ژن لەم چوارشتەدا لەپیاو جیایە، زێڕو زیوو ئاوریشم و دێباج بۆ ژن ڕەواو دروستە، تەنیا وەك حاجەتو قاپو قاجاخ ئەم چوارشتە بۆ ژنیش نادروستە. بەڵام بەشێوەی گشتی کڕینو فرۆشتن و بازرگانی کردن بەم چوارشتەوە بۆ هەموو موسوڵمانێ، نێر بێ، یا مێ بێ، دروستە، لەگەڵ هەندێ مەرجی تایبەت کەئێستا شوێنی ئەو وردەکاریە نییە، لەبەر ئەوە دروست کردنی پارچەو خشڵ و کەلوپەل و شتی وا لەم شتانە دروستە، وەدادەنرێ بەکەسابەتی حەڵاڵ، هەمووشمان دەزانین کەکاسب خۆشەویستی خوایە. (بڕ: فیقهی ئاسان/١ ل/٢١ ز/٦).

**دووەم**: ئەو ڕستەیەی لەفەرموودەکە کەدەفەرموێ: (ئەم چوار شتە بۆ بێ بڕوایانە لەجیهانا) ئەوە بۆ بەیانی واقع و ڕووداوە، نەوەك بۆ بەیانی ئەوەبێ کەئەمانە لەدنیادا بۆ ئەوان حەڵاڵ و ڕەوان.

تەنیا ئەوەندە هەیە دەسەڵاتی وڵاتی ئیسلام دەتوانێ ئەم شتانە لەموسوڵمان قەدەغە بکا، مەگەر لەسنووری ڕەوای خۆیانا، بەڵام بۆی نییە ئەم چوارشتە لەناو موسوڵمان قەدەغە بکات!!.

١٨١٤- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ أَبُو شُعَيْبٍ وَكَانَ لَهُ غُلَامٌ لَحَّامٌ فَقَالَ: اصْنَعْ لِي طَعَامًا أَدْعُوَ رسول الله صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَامِسَ خَمْسَةٍ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَامِسَ خَمْسَةٍ، فَتَبِعَهُمْ رَجُلٌ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّكَ دَعَوْتَنَا خَامِسَ خَمْسَةٍ،

وَهذَا رَجُلٌ قَدْ تَبِعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَذِنْتَ لَهُ وَإِنْ شِئْتَ تَرَكْتَهُ. قَالَ: بَلْ أَذِنْتُ لَهُ.(الحديث ٥٤٣٤ أطرافه في: ٢٠٨١، ٢٤٥٦، ٥٤٦١ )[١٨١٤].

ئـەبو مەسـعوودی ئەنـصاری -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: پیـاوێکی ئەنصاری نـاوی ئـەبو شوعەیب بـوو، خـوڵامێکی گۆشتفرۆشـی هـەبوو، پـێی گوت: نانێ دروست بکە، پێغەمەرو چوار کەسی تر خەڵك دەکەم، جا پێغەمەر و چوارکەسـی تـری بـانگ کـرد، پیـاوێکیش شـوێنیان کـەوت، کـە گەیـشتنە بەردەرگای ماڵەکە، پێغەمـەر -دروودی خوای لەسـەر بێ- بـەخاوەن ماڵەکـەی فەرمووی: (ئەم پیاوە شوێنمان کەوتووە، کە تۆخوڵکت کردین ئـەومان لەگـەڵ نەبوو، جا ئەگـەر ڕێی ئـەدەی ئـەوا دێـە ژوورەوە، ئەگـەر حـەزیش ئەکـەیت ئـەوا دەگەڕێتـەوە؟ خانـە خوێکـەیش گـوتی: قوربـان! ڕێگـەی پـێ ئـەدەم، بـا بفەرموێ لەگەڵ ئێوەدا). (ریاض/٢ ز/١٠٣ ل/٢٥٤ ژ/٧٣٩ چاپی دووەم).

١٨١٥- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّاءِ.(الحديث ٥٤٤٠، طرفاه في ٥٤٤٧، ٥٤٤٩)[١٨١٥].

عەبدوڵڵای کوڕی جەعەفـەری کوڕی ئـەبو تالیب -ڕەزای خوا لـە خۆیی‌و بابی بێ- فەرمووی: پێغەمەرم دی -دروودی خوای لەسەر بێ- فەریکە خورما (روتـاب)ی دەخـوارد بـە ترۆزییـەوە. وە فـەرمووی: (فێنکیـی ترۆزیەکـە گەرمیی خورماکە دەشکێنێ). (تاج/٤ ز/٢١ ل/٧٣ ژ/٢+٣).

روونکردنەوە:

ڕشـتەی ئـەم فەرموودەیـە لـە ڕشـتە چـوارینەکانی بوخاریـیـە، پیـاوانی ڕشتەکە ئەمانەن (بڕوانە: ژمارە/٦٩٤ = بەرگی دووەم لاپەڕە/١١٦):

---

[١٨١٤] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: ما يفعل الضيف إذا تبعه غير من دعاه... رقم/٢٠٣٦.

[١٨١٥] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: أكل القثاء بالرطب، الرقم/٢٠٤٣.

١. مامۆستای بوخاری، کە بوخاری ئەم فەرموودەیەی لەوەوە گێڕاوەتەوە، کەناوی عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵلایە.

٢. شێخی شێخەکەی بوخاری، کەناوی: ئیبراهیمی کوڕی سەعدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفە (بڕوانە: ژمارە: ٩٩٣ تەجرید = ٢٠٤٨ فتح الباری - بەرگی/٣ ل/٥). مامۆستای مامۆستاکەی بوخاری ئەم فەرموودەیە لەباوکی خۆیەوە دەگێڕێتەوە کە:

٣. سەعدی کوڕی ئیبراهیم، کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف، ئەویش ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە لە:

٤. عەبدوڵلای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب -ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێ- (بڕوانە: ژمارە: ٧٦١ تەجرید = ب/١ ل/١٨٨). پیاوی سێیەم لەم فەرموودەیەدا، کەسەعدە لە گچکەی پەیڕەوانە، واتە: لە صغاری تابعینە، کەناسراون بەچینی دووەمی موسوڵمانان، پیاوی چوارەمیش کە عەبدوڵلای کوڕی جەعفەرە لەگچکەی هاوڕێیانە، واتە: صغاری صەحابەیە، کە پێغەمەر مردووە ئەو مناڵکار بووە. دوو فەرموودەی لەبوخاری‌دا هەیە، لەخاکی حەبەشە، کاتێ باوك‌و دایکی لەوێ کۆچکار بوون عەبدوڵلا لەدایك بووە، دایکی ناوی ئەسمائی کچی عومەیە، یەکەم منالی موسوڵمانە کە لەحەبەشەدا لەدایك بووە، کاتێ باوك‌و دایکی لەحەبەشەوە هاتن بۆ مەدینە ئەویش لەگەڵیانا هات، دووبرای باوك‌و دایکی تریشی هەبوو، کەناویان موحەمەد و عەون بوو، ئەوانیش لەپاپۆڕەکەدا لەگەڵ ئەوانا کۆچیان کرد بۆلای پێغەمەر، لەمەدینە، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەستی هێنا بەسەریداو، فەرمووی: (خودایە: جێگەی جەعفەر بەمناڵەکانی پڕبکەرەوە). کاتێ پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- مرد، عەبدوڵلا تەمەنی دە ساڵ بوو، لەجەنگی صفین دا عەبدوڵلا یەکێ بوو لەفەرماندەکانی ئیمامی عەلی، عەبدوڵلا زۆر سەخی بوو، تەنانەت ناسراو بوو بە: بەحری جوود، واتە:

دەریای سەخێتی، پیاوێکی پیاوانەی ڕەوشت بەرزی زمان پاكو ڕەوشت پاك بوو، ڕای وابوو کە گوێ گرتن لە گۆرانی و لەدەنگی خۆش قەیدی نییە، فەرموودەی لەپێغەمەرەوە لەبەرکردووە، ئەم زاتانە لەوەوە، لەپێغەمەرەوە، فەرموودەکانی ئەویانگێڕاوەتەوە: دووکوڕەکەی خۆی: ئیسماعیلو موعاویە، هەروا ئەبوجەعفەر محەمەدی کوڕی عەلیو قاسمی کوڕی موحەمەد و عوروەی کوڕی زوبەیر و سەعدی کوڕی ئیبراهیمی ئەکبەر و شەعبی و مورق العجلی و عەبدوڵلای کوڕی شدادو حەسەنی کوڕی سەعدو عەباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدو کەسانی تریش. لەمەدینە مرد، ساڵی هەشتای کۆچی، لەتەمەنی نەوەد ساڵیدا، (بڕوانە: فەرموودەی ژمارە/١٥٧٦ تەجرید = ٤٢٣٠، ٤٢٣١، فتح الباری + ١٥٨٠ تەجرید = ٤٢٦١ فتح الباری = بەرگی چوارەم ل/٣٢١) + (تاج/٤ ژ/١٠٢ ل/٣٢٧ ژ/١).

١٨١٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ رَضِيَ اللَّه عَنهمَا قَالَ: كَانَ بِالْمَدِينَةِ يَهُودِيٌّ وَكَانَ يُسْلِفُنِي فِي تَمْرِي إِلَى الْجِدَادِ وَكَانَتْ لِجَابِرٍ الْأَرْضُ الَّتِي بِطَرِيقِ رُومَةَ فَجَلَسَتْ فَخَلَا عَامًا فَجَاءَنِي الْيَهُودِيُّ عِنْدَ الْجَدَادِ وَلَمْ أَجُدَّ مِنْهَا شَيْئًا فَجَعَلْتُ أَسْتَنْظِرُهُ إِلَى قَابِلٍ فَيَأْبَى فَأُخْبِرَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لِأَصْحَابِهِ امْشُوا نَسْتَنْظِرْ لِجَابِرٍ مِنَ الْيَهُودِيِّ فَجَاءُونِي فِي نَخْلِي فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكَلِّمُ الْيَهُودِيَّ فَيَقُولُ أَبَا الْقَاسِمِ لَا أُنْظِرُهُ فَلَمَّا رَأَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ فَطَافَ فِي النَّخْلِ ثُمَّ جَاءَهُ فَكَلَّمَهُ فَأَبَى فَقُمْتُ فَجِئْتُ بِقَلِيلِ رُطَبٍ فَوَضَعْتُهُ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَكَلَ ثُمَّ قَالَ أَيْنَ عَرِيشُكَ يَا جَابِرُ فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ افْرُشْ لِي فِيهِ فَفَرَشْتُهُ فَدَخَلَ فَرَقَدَ ثُمَّ اسْتَيْقَظَ فَجِئْتُهُ بِقَبْضَةٍ أُخْرَى فَأَكَلَ مِنْهَا ثُمَّ قَامَ فَكَلَّمَ الْيَهُودِيَّ فَأَبَى عَلَيْهِ فَقَامَ فِي الرِّطَابِ فِي النَّخْلِ الثَّانِيَةَ ثُمَّ قَالَ يَا جَابِرُ جُدَّ وَاقْضِ فَوَقَفَ فِي الْجَدَادِ فَجَدَدْتُ مِنْهَا مَا قَضَيْتُهُ وَفَضَلَ مِثْلُهُ فَخَرَجْتُ حَتَّى

جِئْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهِ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَشَّرْتُهُ فَقَالَ أَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ. (الحديث ٥٤٤٣)[١٨١٦].

جابيرى كورى عەبدوللا -ڕەزاى خواى لێ بێ- فەرمووى: جوولەكەيێ لەمەدينە هەبوو، پێشەكى پارەم لێى وەردەگرت بەسەلەم بەسەر خورما هەتا كاتى ڕنينى، باخە خورمايەكم هەبوو، لەرێگەكەى بيرى ڕۆمە بوو، ئەو ساڵە ڕەزە خورماكە بەرى نەگرت، مەگەر زۆر كەم، ئەوەيش دەبوو بەهۆى دواكەوتنى دانەوەى سەلەمەكەى سەرم، جا كاتى خورماڕنين، كابراى جوولەكە هات بۆلامن داواى خورماكەى لێم كرد، منيش هيچم لێ نەڕنى بوو، لەبەر ئەوە داوام لێ كرد كە هەتا ساڵى ئايندە مۆڵەتم بدات، بەڵام قاييل نەبوو مۆڵەتى نەدام. ئەمە ئەگێڕنەوە بۆ پێغەمەر -دروودى خواى لەسەر بێ- ئەويش بەهاورێكانى لاى خۆى دەفەرموێ: (بابڕۆين داواى مۆڵەتى دواخستن لەو جوولەكەيە بكەين، كە مۆڵەتى جابير بدا تاساڵێ). جا لەناو ڕەزە خورماكە مابووم هاتن بۆلام، وە پێغەمەر -دروودى خواى لەسەر بێ- لەم بارەيەوە زۆرى لەگەڵ كابراى جووە فەرموو، سوودى نەبوو، هەموو جارێ كابراى جوولەكە بەپێغەمەرى دەگوت: ئەى ئەبو قاسم! مۆڵەتى جابير نادەم، جا كاتێ پێغەمەر -دروودى خواى لەسەر بێ- ڕوانى حاڵەكە وايە، هەڵسا خولێكى خوارد بەناو باخە خورماكەدا، ديسان هاتەوە بۆلاى كابراى جوولەكەو لەم بارەيەوە قسەى لەگەل كردەوە، ديسان جووە ملى نەدا و قاييل نەبوو مۆڵەتى جابير بدات، جا منيش هەڵسام چووم هەنێ فەريكە خورماى تازەم هێنا و لەبەردەم پێغەمەردا دامنا بۆى، ئەويش لێى نۆش كرد، ئەوجا فەرمووى: (ئەى جابير! ساباتەكەت، كەلەناو ئەم باخەدا، ستارى تيا دەگريت لەكوێ يە؟) منيش نيشانم دا و جێگەكەيم پێ گوت. فەرمووى شتێكم لەبنيا

---

[١٨١٦] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث جابر في وفاء دينه (فتح/١٠ ص/٧٣٤ –خاتمة كتاب الأطعمة-) –المترجم-.

بۆ ڕاخه، ئەوجا تەشریفی چووە ناو ساباتەکەو سەرخەوێکی تیا شکاند و ئەوسا خەبەری بۆوە، جا چەپکێ فەریکە خورمای ترم بۆیهێنا و لێی خوارد، ئەوسا هەڵساو قسەی لەگەڵ جوولەکەکە لەم بارەیەوە کردەوە، بەڵام جووە ڕازی نەبوو، ئەنجا بەناو بەری تازەی باخەکەدا، کە هێشتا بەدارەوە بوو. جارێ تر سووڕایەوە و نزای پیرۆزی و پیتو فەڕی دیسان بەسەردا خوێندەوە، ئەوسا بەپشتی پیتو فەڕی خودا فەرمووی: (دەست بکە بەڕنینی خورمای باخەکەو بە تەواوی قەرزی سەلەمەکەی جوولەکەکە بدەرەوە ئەی جابیر!).

جا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی لەناو مشتاخی خورما ڕزنراوەکەدا بۆ موفەڕکی وەستا، منیش دەستم کرد بە ڕنینی خورمای باخەکە، هەتا بەتەواوی سەلەمی جولەکەکەم دایەوە، وە ئەوەندەی تریشی لێ زیاد بوو، جا لەخۆشی ئەوەی کە ئێمە بەتەمای ئەوەیش نەبووین کەبەری باخەکە بەشی قەرزی جوولەکەکە بکا، کەچی لەپیتو فەڕی پێغەمەرەوە دوو ئەوەندەی تیا بوو ڕۆیشتم بۆلای پێغەمەر، وە موژدەی ئەم پیتو فەڕو پیرۆزییەم پێدا، ئەویش بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم موعجیزە گەورەیە، کە بەلگەیە لەسەر پێغەمەرایەتی ئەوکەسەی کەلەسەر دەستیدا ڕووی داوە فەرمووی: (شایەتی دەدەم کەمن پێغەمەری ڕەوانەکراوی خودام، دەنا خودا موعجیزەی وا گەورەی لەسەر دەستی مندا پیشان نەئەدا). (بڕوانە: تاج/٤ ز/١٠٨ ل/٣٤٦ ژ/١).

١٨١٧- عَنْ سَعْدِ بن أَبِي وَقَّاص رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ تَصَبَّحَ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرُّهُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ سُمٌّ وَلَا سِحْرٌ. (الحديث ٥٤٤٥ أطرافه في: ٥٧٦٨، ٥٧٦٩، ٥٧٧٩)[١٨١٧].

---

[١٨١٧] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: فضل تمر المدينة، رقم: ٢٠٤٧.

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەركەسێ بەیانیان لەسەر خوڕێنی، حەوت دەنك خومای (عەجوە) بخوات، ئیتر ئەو ڕۆژە نە زەهرو نە جادوو زیانیان نابێ بۆی). (تاج/٤ ز/٦٥ ل/٢٠٣ ژ/١).

١٨١٨- عَنِ إبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما أَنَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إذا أَكَلَ أَحَدَكُمْ فَلَا يَمْسَحَ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَو يُلْعِقَهَا. (الحديث ٥٤٥٦)[١٨١٨].

ئیبنو عەباس -ڕەزای خوایان لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (كەنان دەخۆن دەستی خۆتان مەسڕن، هەتا خۆتان دەیلێسنەوە، یا یەكێ تر بۆتانی دەلێسێتەوە!). (تاج/٤ ز/١٦ ل/٥٦ ژ/٢٤).

ڕوونكردنەوە:

هۆی ئەم لستنەوەیە ئەوەیە كەلەفەرمودەیەكی تردا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (ئێوە نازانن كەپیتو فەڕی خواردەمەنیەكەتان لەكامەی دایە). (بڕوانە: ریاض الصالحین بەرگی/٢ ل/٢٦٠ ز/١٠٩ ژ/٧٥٢).

وەكی تریش مەبەست لەوەی كەكەسێ تر لەپاش نانخواردن دەستی بۆ بلێسێتەوە ئەگەر خۆی نەیلێسایەوە، كەسێكە كە قێزو بێز لەوەنەكاتەوە، وەك منالی خۆی و فەقێی كە بۆ پیرۆزی دەستی بلێسێتەوە، بەهەر حاڵ، بەهیچ شێوەیەك مەبەست ئەوە نییە كە موسوڵمان كاری ناشایستە و باری نالەبار برەو پێ بدا، ئەم جۆرە كارە سوننەتە، كردنی سوننەتیش هەركاتێ كێشەیەكی بۆ موسوڵمانان دروست دەكرد، ئەوە نەكردنی لەكردنی باشترە، وەك زۆر لە سوننەتەكانی حەج، ئەگەر هەموو حاجیەك لەكاتی حەج كردنا حەجەرو لئەسوەد ماچ بكا، یا ئیسلامیی ڕوكنی یەمانی بكا، یا دووڕكات

---

[١٨١٨] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: استحباب لعق الأصابع و القصعة ... رقم: ٢٠٣١.

نوێژی سوننەت لەمەقامی ئیبراهیما بکا، ئەوە هەموو حەجەکەیان دەفەوتیٚ، یا هەزاران کەس دەبن بەژێر پێوە، هەتا زۆر لەزانایانی خاوەن تەقوای ئەمڕۆ قسە لەوە دەکەن، کە دروستە بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان تەرکی هەندێ واجبیش بکرێ، وەك کچی موسوڵمان بەبەرگی مۆدەوە لەزانکۆ دەوام بکا، ئەگەر دەوڵەت ڕێگەی نەدەدا بەبەرگی موسوڵمانانەوە دەوام بکا، هەموومان دەزانین رۆژ گۆڕاوە، خەڵك خراپ بوون، صەلیبیەت و صەهیۆنیەتیش قەت وەك ئەمڕۆ، بەنەرمە بڕە، لەدژی ئیسلام سەنگەریان نەگرتووە، لەهەمووی بڤەتر لەوڵاتی ئێمەدا بەداخەوە، مزگەوتەکان چۆڵن، مەیدان خاڵیە، زانای دانای کارا کەم بووە، ئەوەیشی هەیە کەنارخراوە! بەتایبەتی لەوڵاتی ئێمەدا، کەسانێ پەیدابوون، پەروەردەی ناو زێرابن، کەخۆیان پێی دەڵێن: خەباتی ژێرزەمینی، ئێستا هەڵیان بۆ ڕەخساوە، دەغەزو کینەی پەنگەوە خواردووی چەند ساڵەی ناو دەروونی پیسیان بەو پەڕی سەربەستیەوە، وەبێ پەروا لەدژی ئیسلام، وەك ئاودەستخانە دەردەی هەڵ دەڕێژن، وە بۆ نەگبەتی هەل و مەرجێکی واش ڕەخساوە کەخەڵك گوێیان لێ دەگرێ و بگرە باوەڕیشیان پێدەکا، بەتایبەتی لە کوردستانی ئازاددا، بەناوی ئازادییەوە، کۆمەڵێ نیمچە میرزا و بەناو ڕۆشنبیر، بە کرێگیراون، بۆ ڕەفکردن و تانەوتەشەردان لەئیسلام، هەتا شێوەی جوانی گەلی کورد ناشیرین بکەن و هەل بۆ دوژمن بسازێننەوە کەگوایە کورد کافر بونەتەوە تا ئەنفالمان بکەنەوە.

١٨١٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَدْ كُنَّا زَمَانَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكُنْ لَنَا مَنَادِيلُ إِلَّا أَكُفُّنَا وَسَوَاعِدُنَا وَأَقْدَامُنَا ثُمَّ نُصَلِّي وَلَا نَتَوَضَّأُ. (الحديث ٥٤٥٧)[١٨١٩].

---

[١٨١٩] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث جابر في المناديل (فتح/١٠ ص/٧٣٤ خاتمة كتاب الأطعمة طبعة جديدة)-المترجم.

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: (جاران ئێمە لەسەردەمی حەزرەتدا -دروودی خوای لەسەر بێ- بێجگە لەلەپو قوڵو ژێرپێی خۆمان دەستەسڕی ترمان نەبوو، واتە: كاتێ شتێكیان دەخوارد كەدەستیان چەور دەبوو، یا تەڕدەبوو، لەبەرئەوەی خاولیو دەسماڵو دەستەسڕیان نەبوو دەستیان بەدەستەكەی تریان، یان بەقۆڵی خۆیان یا بەبن پێو پشتی پێی خۆیان دەسڕی). مەبەست روونكردنەوەی پلەی هەژاریو كەم دەستی‌یانە، لەوسەردەمەدا، چونكە ئەمە بابەتی (رەقائیقە = ناسككاریە دڵهەژێنەكان) دەنا مەبەست ئەوە نییە كەشتی وا سوننەت بێ.

١٨٢٠- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِي اللَّهُ عَنه أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا رَفَعَ مَائِدَتَهُ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلَا مُوَدَّعٍ وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا. (الحديث ٥٤٥٨ طرفه في: ٥٤٥٩)[١٨٢٠].

ئەبو ئومامە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: لەپاش نانخواردن كە سفرەكەی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هەڵدەگیرا، دەیفەرموو (الْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلَا مُوَدَّعٍ وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا: سوپاس و ستایش و حەمدێكی زۆری پاكو پیرۆز بۆخودای پەروەردگارمان، نەكەس جێگەی ئەو دەگرێتەوە و نەوازی لێ ئەهێنرێ و نەئەوزاتە پشت گوێ دەخرێ، وەكەس نییە كەلەخوا بێ نیازبێ، ئەو خودای ئێمەیە). (ریاض الصالحين/٢ ز/١٠٠ ل/٢٥١ ژ/٧٣٣) + (تاج/٤ ل/٦٢ ز/١٨-١).

١٨٢٠-م- و عنه في ريواية: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ، قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَفَانَا وَأَرْوَانَا غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلَا مَكْفُورٍ.[١٨٢٠-م-]

---

[١٨٢٠] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي أمامة في الدعاء بعد الأكل -المصدر السابق- -المترجم-.

[١٨٢٠-م] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي أمامة في الدعاء بعد الأكل -المصدر السابق- -المترجم-.

دیسان لەئەبوئومامەوە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەگێڕانەوەیەکی تردا: حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- لەدوای نانخواردن دەیفەرموو: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَفَانَا وَأَرْوَانَا غَيْرَ مَكْفِيٍّ وَلَا مَكْفُورٍ: سوپاسو ستایش بۆ خودا کەهەر خۆی بەسو بەشمان دەکاو، هەرخۆی تێراومان دەکا، نەکەس دەتوانێ جێگەی ئەوبگرێتەوە، نەکەس ڕادەی دەکەوێ کەناسوپاسی ئەو زاتەبکا). (تاج/٤ ز/١٨ ل/٦٢ ژ/٢).

١٨٢١- عَنْ أَنَس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أَنَا أَعْلَمُ النَّاسِ بِالْحِجَابِ كَانَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ يَسْأَلُنِي عَنْهُ أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَرُوسًا بِزَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ وَكَانَ تَزَوَّجَهَا بِالْمَدِينَةِ فَدَعَا النَّاسَ لِلطَّعَامِ بَعْدَ ارْتِفَاعِ النَّهَارِ فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَلَسَ مَعَهُ رِجَالٌ بَعْدَ مَا قَامَ الْقَوْمُ حَتَّى قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَشَى وَمَشَيْتُ مَعَهُ حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، ثُمَّ ظَنَّ أَنَّهُمْ خَرَجُوا فَرَجَعَ فَرَجَعْتُ مَعَهُ فَإِذَا هُمْ جُلُوسٌ مَكَانَهُمْ فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ بَابَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ فَإِذَا هُمْ قَدْ قَامُوا فَضَرَبَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ سِتْرًا وَأُنْزِلَ الْحِجَابُ. (الحديث ٥٤٦٦ أطرافه في: ٤٧٩١، ٤٧٩٢، ٤٧٩٣، ٤٧٩٤، ٥١٥٤، ٥١٦٣، ٥١٦٦، ٥١٦٨، ٥١٧٠، ٥١٧١، ٥٤٦٦، ٦٢٣٨، ٦٢٢٦، ٦٢٧١، ٧٤٢١)[١٨٢١].

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: من لەهەموو کەسێ باشتر لەبارەی حیجابەوە شارەزامو ئاگام لێیەتی، ئوبەیی کوڕی کەعبیش لەبارەی ئایەتی حیجابەوە پرسیاری لێم کرد، هۆی هاتنی ئایەتی حیجاب ئاوا بوو: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەمەدینە زەینەبی کچی جەحشی هێنا، جا شەوی زاوایی بۆ بەیانی کەخۆر بەرزەوە بوو، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نانی شایی دروست کردو بانگهێشتی لەخەڵك کرد بۆ نانخواردن بەم

---

[١٨٢١] اخرجه مسلم في النكاح، باب: زواج زينب بنت جحش و نزول الحجاب رقم: ١٤٢٨.

فارسی باوکی کاوەیت؟ گوتم: بەڵێ بۆچی؟ گوتی: دەبڕۆ دەمانچەیێ بێنەو بمکوژەو ڕزگارم بکە، من یەکێکم لەوکۆمەڵەی کە کوڕەکەی تۆمان کوشتووە، گوتم: بابچینە ژووری لە ژووری حافظەکان، لەوێ گوتی: ناڕۆم هەتا نەمکوژی، ژیانم لێ تاڵ بووە، شەوتا بەیانی نەقیبێکی عەسکەری دێتە گیانم، ئازارم دەدا دەست دەخاتە بەربینم، هەتا بەیانی دەمتاسێنێ، هەموو شەوێ پێم دەڵێ: ڕۆژ لە ڕۆژ خراپترت لێ دەکەم، ئەگەر نەچی بۆلای باوکی کاوەو ئەم تاوانە ئاشکرا نەکەیت!! گوتی: ئێوە نازانن هەرشەوێکم مردنێکە، منیش لەگەڵ خزمەکەما هەرچی گوت لەبارەی تاوانەکەوە لەکورتە کاغەزێ بەپەلە نوسیمان، ئەوجا پێم گوت: من لێرەدا، لەپەنا قەبری کاك ئەحمەدی شێخا — غەرقی ڕەحمەتی خودابێ- پیاو ناکوژم، بەڵام تۆ بڕۆ با ئەو پۆلیسو ئینزیباتانە پێت نەزانن، ڕێزی مزگەوتەکە نەشکێ، بەیانی سەعات نۆ وەرەوە بۆ فلان دوکان، گوتی باشە. بەڵام ئێستا بێ یان بەیانی نەمکوژی ناڕۆم، کەچوومەوە بۆ ماڵەوە هەموو گوتیان: چۆن هەڵەی وات کردووە تازە نایەتەوە، بەڵام من دڵنیابووم کە قورئان کەمەندکێشی کردووەو بەدەست خۆی نییە دێتەوە، چونکە کابرا زۆر پەرێشان و لەحاڵێکی سەیرابوو.

کەبەیانی چووین بۆ دوکانەکە، لەوێ گوتی: من لەسەعات هەشتەوە لێرەم، ئەمشەوم لەهەموو شەوێ ناخۆشتربوو، نەقیبەکە هاتەوە سەرم، پێی گوتم: ئەو پیاوە لەخۆت ڕازی نەکەیت خراپترت لێدەکەم.

جا گوتم بابچین بۆلای مدیری شورتە، کەئەوکاتە: کاك سەلاح چاوشین بوو، وەکاك سەلاح عەقیدێکی شورتەی پسپۆڕی بانگ کرد، بە حزووری ئێمەو کاك سەلاح و چەند پسپۆڕێکی تری پۆلیس لەنووکەوە تاوانەکەی روون کردەوە، ومیەکە یەکە تاوانبارەکانی ناونووس کرد، وەهۆی ئەم خۆتەسلیم کردنو اعتراف کردنەی وەك پێشوو روونکردەوە، کەژیانی لێ تاڵ بووەو خەوو خواردنی لێ هەراسان بووە. کە ئیفادەکەی تەواو بوو، ئەوجا

بەمنی گوت: دە درەنگە کەی دەمکوژیتو رزگارم دەکەیت؟ منیش پێم گوت: من لەم لەحزەیەوە تۆم بەخشی، وە داواشم لەکاك سەلاّح و شورتەکانی تر کرد، کە رێزی ئەو کابرایە بگرنو ئازاری نەدەن، وە ئەوانیش وایان کرد، هەتا ئەنجامی دادگایی، لەپاش هەمووشتێ، لەگەڵ باوکەکەیدا زۆر هەوڵمان دا هەتا بەردرا، لەماوەی حەپسەکەیدا مناڵەکان خزمەتێکی زۆریان کرد. ئەوەی کەلێرەدا دەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم ئەم خاڵانەیە:

١. لەپاش خۆ تەسلیم کردنو زەبتی ئیفادەکەی و کەشفی تاوانەکەی لەئازارەکەی ڕزگاری بوو.

٢. لەتاوانبارە ناو تۆمارکراوەکان لەدادگا، هەشتیان لەشەڕەسەگی شەڕە خۆریدا کوژران و بەر شەقی قورئان کەوتنو دەستی ئێمەیان پێوە خوێناوی نەبوو.

٣. مەلای ئەو گوندەی کە دووپیاوەکەی هاتن بۆ بوارتاقی کردنەوە بۆ ماڵی ئێمە، بۆیگێڕامەوە، گوتی: رۆژێ باوکی یەکێ لەوتاوانبارانەی کە کوڕەکەی تۆیان کوشتووە، هات بۆ مزگەوت، کتێبێکی بەدەستەوە بوو، گوتی: مەلا ئەم کتێبە چی لێبکەم ئەمە ماڵی منی وێران کرد، کەتەماشام کرد: کتێبەکە بەرگێکی تاج بوو بەکوردی، تۆ بەدیاری دابووت بەباوکی ئەو تاوانبارەکە کوڕەکەی لەجەردەییدا، لەڕێگەی پێنجوێن کوژرابوو.

٤. لەڕێگەی خزمێکمانەوە، رۆژێ کابرایێ هات، گوتی: بە ئوتومبیلێکی بەڕازیلی (ع)ت بۆ دەکوژم، کە (ع) یەکێ بوو لە بکوژەکان، منیش دەرم کردو بەخزمەکەمانم گوت: من بەگولله کەس ناکوژم، قورئانەکەمم نیشانداو گوتم: من ئەمە چەکی دەستمەو بەس. دەوری مانگێکی پێ چوو، عومەر چاوشین ئەوکابرایەی کوشتو لەکوردوستانا دەنگی دایەوە و بوو بەیەکێ لەپێنج پاڵەوانەکان!.

سەعیدی کوڕی جوبەیر -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- چل ساڵ لەڕیزی یەکەمی جەماعەتا بووە، جەماعەتی نەفەوتاوە، لەوماوەیەدا پشت ملی مەئموومی نەدیوە، لەتەدریبی ڕاوی دا دەفەرموێ: فەرمووده زانی گەورە یەحیای کوڕی سەعید -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (مورسەلاتی کوڕی جوبەیر لەلام باشترە لە مورسەلاتی عەطاء). وە هەروەها لە تەدریبی ڕاوی ئیمامی سیووطیدا -ڕەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (کۆمەڵێ لەزانا گەورەکان، کەیەکێ لەوان سەعیدی کوڕی جوبەیرە -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- ڕێگەی نوسینەوەی فەرموودەیان دەدا، وە خۆشیان دەیانکرد، هەروەك ڕێگەی زەبتی فەرموودەیان ئەدا، وە خۆشیان دەیانکرد). (ظبط) بریتیە لەنوختە و سەر و بۆرو ژێر و زەنەکردن بۆ وشە، لەگەڵ نوسینی اعراب بۆی، هەتا وشەو ڕستە بەپێی ڕێنووس‌و ڕێزمان کۆنترۆڵ بکرێن‌و دوایی بەجوانی و بەڕەوانی، بەبێ هەڵە لەبەربکرێ، یا بنوسرێ.

١٨٣٣م- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما فِي رِوَايَةٍ: أَنَّهُ قَالَ: لَعَنَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ مَثَّلَ بِالْحَيَوَانِ.

لەگێڕانەوەیەکا ئیبنوعومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەفرین‌و لەعنەتی کردووە لەوکەسەی کەلاشەی گیانلەبەر، بەزیندویی، یا بەمردویی بشێوێنێ، وەك ئەوە لچ‌و لێو و لووت‌و گوێچکەی ببڕێ، یا کلك‌و پەلەکانی بقرتێنێ).

١٨٣٤- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللَّه عَنْه قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ دَجَاجًا. (الحديث ٥٥١٧ أطرافه في: ٣١٣٣، ٤٣٨٥، ٤٤١٥، ٥٥١٢، ٥٥١٨، ٦٦٢٣، ٦٦٤٩، ٦٦٧٨، ٦٦٨٠، ٦٧١٨، ٦٧١٩، ٦٧٢١، ٧٥٥٥)[١٨٣٤].

---

[١٨٣٤] راجع: ١٦١١ تجريد = ٤٣٨٥ فەتح - بەرگی/٤ ل/٣٦٨. -المترجم-

ئەبوموسای ئەشعەری -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەرم دی -دروودی خوای لەسەر بێ- گۆشتی مریشکی دەخوارد. (تاج/٤ ز/١ ل/٣ ژ/١ ب/ت/ن).

١٨٣٥- عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ.(الحديث ٥٥٣٠ طرفاه في: ٥٧٨٠، ٥٧٨١)[١٨٣٥].

ئەبو سەعلەبەی خوشەنی -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: هەر دڕندەیێ کە کەڵبەی هەبێ، پێغەمەر خواردنی گۆشتەکەی قەدەغە کردووە. (تاجی کوردی/٤ ل/١٤ ز/٣ ژ/٩) + (فیقهی ئاسان/٣ ل/٩١٤).

١٨٣٦- عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِي اللَّه عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالسَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً.(الحديث ٥٥٣٤ طرفه في: ٢١٠١)[١٨٣٦].

ئەبوموسا -ڕەزای خوای لێ بێ- لەپێغەمەرەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: نمونەی هاوڕێ و هاونشینی باش، وەك میسك فرۆش وایە، وێنەی هاودەمو هاوڕێی خراپیش وەك مووشە دەمەچی وایە، میسك فرۆش یا خوت لێی دەکڕی، یا خۆی بەشت دەدا، یا هەرهیچ نەبێ بۆ نەخۆشەکەی دەچێ بەسەرتا، بەڵام مووشە دەمەچی واتە: ئاسنگەر یا جلەکانت دەسوتێنێ، یاهەر هیچ نەبێ بۆ چڕوکێکی پیس دێت بەسەرتا. (تاجی کوردی/٩ ز/٥٥ ل/١٢٤ ژ/٦ ش/د —ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ-).

---

[١٨٣٥] اخرجه مسلم في الصيد و الذبائح، باب: تحريم اكل كل ذي ناب..رقم:١٩٣٢.

[١٨٣٦] اخرجه مسلم في الأدب — (العيني/١١ ص/٢٢٠) قال النووي في رياض الصالحين: متفق عليه، رقم تخريجه في مسلم (٢٦٢٨) هامش الحديث الرقم ٣٦٣/٤ ص/١٩٠. — المترجم.

١٨٣٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما قال: نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُضْرَبَ الصُّورَةُ. (الحديث ٥٥٤١)[١٨٣٧].

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەیی کردووە لەوە کە لەدەموچاوی ئاژەڵو گیانلەبەر بدرێ.

روونکردنەوە:

مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: پێشەوا بوخاری بەم فەرموودەیە ئاماژە دەکا بۆ ئەو فەرمودەی تر کەپێشەوا موسلیم دەری هێناوە کەبەدەق دەفەرموێ: (جابیر -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- قەدەغەی کردووە کەبدرێ لەڕوخساری گیاندار، یا روخساری گیاندار داخ بکرێ بۆ نیشان کردن). (تاجی کوردی/٤ ل/١٥٢ ز/٤٨ ژ/١).

# پـایـانێ - الخَـاتِمَةُ

مامۆستا شێخی عەسقەلانی -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: نامەی نەچیرو سەربڕاوەکان نەوەدو سێ فەرموودەی بەرزەوەکراوی واتیادا، بیستو یەك فەرموودەیان بێڕشتەن، واتە: تەعلیقن، هەڵسپێراون، ئەوانی تریان پەیوەستو مەوصولن، حەفتاو نۆیان دووبارەن، پوختەکەیان: (٩٣-٧٩ = ١٤). چواردە فەرموودەیە، کە بۆیەکەم جار لەم باسەدا دەرهێنراون. ئەم چواردە فەرموودەیە موسلیمیش وەك بوخاری هەموویانی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەمانەیان:

١. فەرمودەکەی ئیبنوعومەر: (....أنْ تُصْبِرَ البَهِيمَةُ = ٥٥١٤ فەتح) لەتەجریدەکەدا لێرەدا نییە.

---

[١٨٣٧] لم يخرجه مسلم (خاتمة كتاب الذبائح و الصيد ج/١١ ص/١١٣) -المترجم-.

٢. فەرموودەکەی ئیبنوعەباس سەبارەت بە (أنْ تصبر البهيمة للقتل) بڕوانە: کۆتایی فەرموودەی ژمارە: ٥٥١٥ فتح الباري.

٣. فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی یەزید: (في النهي عن المثلة = ٥٥١٦ فتح).

٤. فەرموودەی ژمارە: ٥٥٢٩ فتح = حديث ابن عباس و الحكم بن عمر و في الحمر الانسية. لێرەدا نییە.

٥. ژمارە ١٨٣٧ تجريد = ٥٥٤١ فەتح = حديث ابن عمر في النهي عن الصورة. هەروەها عەسقەلانی دەفەرموێ: ئەم نامەیە چل‌و چوار بیسراو (اثر)یشی واتیادا، کەهی سەحابەو کەسانی دواترە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٧٦- نامەی قوربانی - كتاب الأضاحي

(باسی قوربانی لە فیقهی ئاسانا وا لەبەرگی سێیەمدا، ز: ٣٦٦ لاپەڕە/٩٢٠).

١٨٣٨- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ ضَحَّى مِنْكُمْ فَلَا يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثَالِثَةٍ فِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ نَفْعَلُ كَمَا فَعَلْنَا عَامَ الْمَاضِي؟ قَالَ: كُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا فَإِنَّ ذَلِكَ الْعَامَ كَانَ بِالنَّاسِ جَهْدٌ فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا فِيهَا.(الحديث ٥٥٦٩)[١٨٣٨].

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع -ڕەزای خوای لێ بێ- فەمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەركەسێ لە ئێوە قوربانی دەكا، بابیكا، بەڵام نابێ لەپاش سێ شەو لەگۆشتی ئەو قوربانیە لەماڵیا بمێنێ، جالە ساڵی ئایندەدا عەرزیان كرد: ئەی پێغەمەری خودا! ئەمساڵیش وەك پار بكەینەوە؟ فەرمووی: نەء، هەم خۆشتان لێی بخۆنو هەم بەشی خەڵكی تریشی لێ بدەن و هەم قایمە (إدخار)یشی لێ بكەن، پار بۆیەكا وام گوت، چونكە پار ساڵەكەی نەهاتیو گرانی بوو، خەڵكەكە پەرۆش بوونو حاڵیان پەرێشان بوو، ویستم ئێوەیش یاریدەیان بدەنو دستگیرۆیی خەڵك بكەن). (تاج/٤ ل-٤٥ ش/د/ت/ن).

روونكردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كەبڕیار بەهۆی كاتو هۆكار دەگۆڕێ، هۆی حەرامبوونی قایمەكاریو إدخار، زیاتر لەسێ شەو، لەساڵی

---

[١٨٣٨] اخرجه مسلم في باب الأضاحي، باب: بيان ماكان من النهي عن اكل لحوم الأضاحي ...رقم:١٩٧٤.

پێشوودا بەهۆی گرانیەوە بوو، کاتێ ساڵی ئایینده دێ هۆکارەکە کە گرانیە نامێنێ بڕیاری حەرامبوونیش دەگۆڕێ بە بڕیارێ کە بگونجێ لەگەڵ کاتو سەردەمی نوێدا، کە قایمەکاری دروستە.

١٨٣٩- عَنِ الزُّهْرِيِّ رحمه الله قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ أَنَّهُ شَهِدَ الْعِيدَ يَوْمَ الْأَضْحَى مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَصَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ نَهَاكُمْ عَنْ صِيَامِ هَذَيْنِ الْعِيدَيْنِ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَيَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ وَأَمَّا الْآخَرُ فَيَوْمٌ تَأْكُلُونَ نُسُكَكُمْ.(الحديث- ٥٥٧١ طرفه في: ١٩٩٠)[١٨٣٩].

زوهری -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ئەبو عوبەیدی ئازادکراوی ئەزهەر، بۆیگێڕاومەتەوە، فەرمووی: لەکاتی جێنشینی ئیمامی عومەردا، لەخزمەتیدا ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان بووم، نوێژی جەژنی قوربانی لەپێش وتارخوێندنەوەدا کرد ئەوجا وتاری داو فەرمووی: ئەی خەڵکینە! پێغەمەری خودا -درودی خوای لەسەر بێ- نەهی کردووە لەگرتنی ڕۆژووی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربان، چونکە یەکەمیان ڕۆژی جەژنی ڕۆژوو شکاندنە، ئەوی تریشیان ڕۆژی خواردنی قوربانیەکانتانە.

---

[١٨٣٩] اخرجه مسلم في الصيام، باب: النهي عن الصوم يوم الفطر و يوم الأضحى، رقم: ١١٣٧.

# پـايـانێ - الخَاتِمَةُ

**یەکەم:** بڕوانە ئەم شوێنانە، کە پەیوەندیان هەیە بەبابەتی قوربانیەوە:

١. فـەرموودەی ژمـارە: ٥٠١ تجریـد/٩٥٥ فـتح البـاری = مختـصر صـحیح البخـاری، بـەرگی یەکـەم لاپـەڕە/٤٧٨. بڕوانـە ژمارەکـانی دوایـش کـە بـۆرە پەیوەندیەکیان بەقوربانیو ڕۆژی جەژنی قوربانەوە هەیە.

٢. بڕوانـــە ژ/٧٧٩ تجریـــد/١٦٢٢ فـــتح/بـــەرگی ٢ ل/١٩٩ + ژمـــارە/٧٩٧ ل/٢١٤. ژمارەکـانی پاشـی هـەتا ژمـارە/٨١٠ بەتایبـەتی ژمـارە: ٨٠١ = ١٧٠٧ فـتح ل/٢١٧ وە ژمـارە/٨٠٢ تەجریـد/١٧٠٩ فـەتح. وە ژمـارە/٨٠٤ تەجریـد/١٧١٣ فەتح. وە ژمارە/٨٠٦ تەجرید/١٧١٩ فەتح.

٣. بڕ: ژمارە/١٠١٢ تەجرید/٢٣٠٠ فەتح بەرگی/٣ ل/٩٣.

**دووەم:** عەسـقەلانی –ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: (نامـەی قوربانی چلو چوار فەرمووەدەی لەخۆی گرتووە، پازدەیـان بێڕشـتن، ئەوانـەی تریـان پەیوەسـتن و مەوسـوولن، سیـیو نۆیـان دووبـارەن، پوختەکـەیان: (٤٤-٣٩=٥) پێنج فەرمووودەیە، موسلیمیش وەك شێخی بوخـاری –ڕەزاو ڕەحمـەتی خوایان لێ بێ- ئەم پێنج فـەرمووودەیان گێڕاوەتـەوە بێجگـە لـە فەرمووودەکـەی قەتادەی کوڕی نوعمان = ٥٥٦٤ فەتح لەگەڵ زیادەیی لەتەجریدەکەدا نییە وە هەروەها دەفەرموێ حەوت بیستراویشی واتیادا.

**سێیەم:** پوختەیەکی کورتی بڕیارەکانی قوربانی:

١. قوربـانی سـونەتێکی گەورەیـە، سـوننەتە هـەموو موسـوڵمانێك، هـەموو جـەژنی قوربانـێ، ئەگـەر هـەیبوو قوربـانی بکـا، ژمـارە بـۆکردنی قوربـانی دانەنراوە.

٢. قوربانی دوو جۆری هەیە: قوربانی سوننەت، قوربـانی واجب. قوربـانی سوننەت بـۆ هـەموو کەسـێ هەیـە کەلێی بخوات، یابەشـی بـدرێ لێـی. بـەڵام قوربانی پێویست، کەتەنیا بەنەزر پێویست ئەبێ، کەپێشی ئەگوترێ قوربـانی

نەزرکراو دەبێ گشت گۆشتەکەی بکا بەخێرو بیبەخشێتەوە، بەسەر هەژارانا، نابێ نەخۆیو نەکەسێ ژێواری لەسەری بێ لێی بخوات، نابێ بەشی دەوڵەمەندیشی لێبدا، مەبەست لەهەژار کەسێکە، زەکاتی پێ بشی.

٣. لەبەرئەوەی گوتەی نەزرکردن جۆری زۆرە و بۆهەموو کەسێ بەباشی کۆنترۆڵ ناکرێ، واباشە لەکاتی قوربانی کردنو مەولوودیدا، قوربانیکەر، یا مەولوودیکار ئاوا بڵێ: (ئەم ئاژەڵەم کرد بەقوربانی سوننەت، کە بۆهەموو کەسێ هەبێ لێی بخوات، یا ئەم ئاژەڵەم کرد بە مەولوودیی سوننەت، کەهەم خۆمو هەم هەموو کەسێ بۆی هەبێ کەلێی بخوات وە ئەگەر لەکاتی سەربڕیندا ئەم نییەتە دووبارە بکاتەوە زۆرباشە).

٤. کاتی قوربانی سەربڕین دەست پێ دەکا بە تێپەڕبوونی ماوەی دوو ڕکات نوێژو دوو وتار لەپاش هەتاوکەوتنی ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان، وە دەمێنێ هەتا ڕۆژ ئاوا بوونی ڕۆژی سێیەمی پاش ڕۆژی یەکەمی جەژن، کە تێکڕا دەکاتە چوار ڕۆژ، ڕۆژی جەژنو سێ ڕۆژەی پاش جەژن.

٥. ئەو ئاژەڵانەی کە بۆقوربانی دەست دەدەن ئەمانەن: وشترو ڕەشەوڵاخو مەڕو بزن. بەهەموو جۆرەکانیانەوە، گامێشیش لەزاراوی شەرعا بەڕەشەوڵاخ دادەنرێ.

٦. تەمەنی ئاژەڵی قوربانی: بزن دووساڵی تەواوکردبێ و پێی نابێتە ساڵی سێیەمەوە، مەڕ ساڵێکی تەواوکردبێو پێی نابێتە ساڵی دووەم. ڕەشەوڵاخ دەبێ دووساڵی تەواو کردبێو پێی نابێتە ساڵی سێیەمەوە. وشتر دەبێ پێنج ساڵی تەواوکردبێو پێی نابێتە شەشەوە.

٧. قوربانی بۆ مردوو دەکرێ، ئەگەر خۆی ڕایسپاردبێ کە قوربانی بۆ بکەن، هەندێ زانایان دەفەرموون: مردووەکە ڕاسپێریشی نەکردبێ بۆی دەکرێ، دروستە تەقلیدی ئەو زانایانە بکرێ.

٨. زۆر لەبڕیارەکانی قوربانی لەباسی حەوتەمدا ڕابوورد لەم بەرگەدا، لەکۆتایی ژمارە/١٨٢٥ = ڕونکردنەوەیێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٧٧- نامەی خواردنەوەکان: كتاب الأشربة

## باسی نادروستیی مەی

١٨٤٠- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا حُرِمَهَا فِي الْآخِرَةِ.(الحديث ٥٥٧٥)[١٨٤٠].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەموێ: (هەموو سەرخۆشکەرێ ئارەقە، وە هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە، وەهەر کەسێ لەجیهانا ئارەق بخواتەوەو فێری ببێو تادەمرێ تەرکی نەکاو وازی لێ نەهێنێ و تەوبەی لێنەکا، ئەوە لەبەهەشتا چەشکەی ناکات). (تاج/٤ ل/٩٠ ز/٢٦ ژ/١ ش/د/ت/ن). (بڕ: ریاض/٢ ز/١١١ ل/٢٦٢ – ٢٧٢ ز/١١٦).

١٨٤١- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه قَال: إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَ عنه في رِوَايَةٍ: (وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ أَبْصَارَهُمْ فِيهَا حِينَ يَنْتَهِبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ.(الحديث: ٥٥٧٨ أطرافه في: ٢٤٧٥، ٦٧٧٢، ٦٨١٠)[١٨٤١].

ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (داوێنپیس لەکاتی ئەنجامدانی داوێنپیسیدا بە

---

[١٨٤٠] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: بيان أن كل مسكر خمر: رقم: ٢٠٠٣.

[١٨٤١] اخرجه مسلم في الإيمان باب: نقص الإيمان بالمعاصي.. رقم/٥٧.

موسولمان دانانرێ، وههەروەها ئارەق خۆر لەکاتی خواردنەوەی ئارەقدا، وە هەروەها دزیش لەکاتی دزیکردندا). لە گێڕانەوەیەکا ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: هەروەها پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (وەهەروەها تالانیکەر لەوکاتەدا کە بەبەرچاوی خەڵکەوە تالانی بەهادارو بەنرخ تالان دەکا دانانرێ بەموسوڵمان). (تاج/٣ ز/٨١ ل/٢٠٥ ژ/١٠ ش/د/ت/ن).

١٨٤٢- عَنْ أَبِي عَامِرٍ الْأَشْعَرِيُّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الْحِرَ وَالْحَرِيرَ وَالْخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ وَلَيَنْزِلَنَّ أَقْوَامٌ إِلَى جَنْبِ عَلَمٍ يَرُوحُ عَلَيْهِمْ بِسَارِحَةٍ لَهُمْ يَأْتِيهِمْ يَعْنِي الْفَقِيرَ لِحَاجَةٍ فَيَقُولُونَ ارْجِعْ إِلَيْنَا غَدًا فَيُبَيِّتُهُمُ اللَّهُ وَيَضَعُ الْعَلَمَ وَيَمْسَخُ آخَرِينَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. (الحديث ٥٥٩٠)[١٨٤٢].

ئەبوعامیری ئەشعەری -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لەپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (کۆمەڵانێ لەگەڵی موسوڵمانی من پەیدا دەبن، داوێنپیسی بەحەڵاڵ دەزانن، هەروا ئاوریشم بۆ پیاو بەحەڵاڵ دەزانن، وە ئارەق و مەی و بادەو نەی و سازو سەمتوورو تفاقی بەزم و ڕەزم بەحەڵاڵ دەزانن، هۆز گەلێکیش لەپاڵ کێوێکا هەڵ دەدەن و دادەبەزن و باروبنەی لێ دەخەن، شوانەکەیان ئێواران ڕانەکەیان دەباتەوە بۆیان، لەپاش لەوەڕانی ڕۆژ، بۆ دۆشین و حەوانەوە و شتی وا، کە هەژارێ دێت داوای یارمەتییەکیان لێ دەکا بۆ پێویستی خۆی بەشی نادەن و بەبڕو بیانووی ئاوا دەستی پێوە دەنێن و دەڵێن: سبەینێ وەرەوە بۆلامان، ئێستا هیچمان بەدەستەوە نییە. جالەبەر ئەم جۆرە تاوانە ناشیرینانەیان، شەوێ خودا تۆڵە و سزای سەختیان بۆ دەنێرێ و کێوەکە تەبگ دەکا بەسەریاناو هەموو خۆیان

---

[١٨٤٢] لم يوافقه مسلم على حديث أبي عامر في المعازف (خاتمة كتاب الأشربة ج/١١ ص/٢٣٨ -فتح- طبعة جديدة مصححة). -المترجم-

و ماڵو منداڵیان دەبن بەژێر هەرەسی کێوەکەوە، وە ئەوانەشیان کەنەبووبن بەژێر هەرەسی کێوەکەوە، خودا بیچمیان دەگۆڕێو دەیانکات بەمەیموون و بەراز، هەتا ڕۆژی قیامەت ئەم جۆرە سزایە لەناو ئەم گەلی ئیسلامەدا هەردەمێنێ، ناو بەناو بۆ پەندو ئامۆژگاری، لێیان ڕۆدەچێ بەناو ناخی زەویداو، لێیان دەبێ بەژێر هەرەسەوەو لێیان دەبێ بەمەیموون و بەراز).
(تاج/٤ ل/٩٢ ز/٢٦).

ڕوونکردنەوە:

١. ئەوەی کەلەم فەرموودەیە وەردەگیرێ: (بڕیاری شەرع پەیوەندی بەمەعناو واتای شتەکەوە هەیە، نەوەك بەناوو بە لفظ و لەقەبەوە، بادە لەبەرئەوە نادروستە، کەسەر خۆشکەرە، ئیتر پێی دەڵێیت: مەری، یا ئارەق، یا خەمر، یا بیرە، یا وێسکی، هیچ لەکارەکە ناگۆڕێ). بەمە لەزاراوی ئوصولا دەگوترێ: (بڕیاری شەرع لەگەڵ هۆکەیا دەسوورێ، هۆکە ما بڕیارەکە دەمێنێ، هۆکە نەما بڕیارەکە نامێنێ) بۆنموونە: (مەی پیسە، نادروستە، چونکە سەرخۆشکەرە، بەڵام کاتێ کەلەخۆیەوە، بەبێ دەسکاریی کەسێ بوو بەسرکە، پاكو حەڵاڵە، چونکە لەم کاتەدا سەرخۆشکەر نییە).

٢. لەم سەردەمەی ئێمەدا ئەو پێشبینییەی لەم فەرموودەدا هەیە، هەمووی هاتۆتەدی. تەنانەت زۆرینەی دەوڵەمەندو داراکانی ئەمڕۆ، گەرچی هێشتا لە سوورەت و شەکڵی مرۆڤا بەدیمەن ماون، بەڵام لەڕاستیدا بەسیرەت و ڕەفتار گەلێ لەئاژەڵو مەیموون و بەراز خراپترن.

٣. ئەبوعامیر ئەشعەرییە، هاوڕێی پێغەمەرە، دەڵێن: ناوی عوبەیدی کوڕی وەهبە، لەشام نیشتەجێ بوو، لەبنەڕەتا، لەهۆزەکانی یەمەن بوو لەسەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانا فەرمانی هەقی بەجێ هێنا، دیارە کەئەبوعامیری مامی ئەبو موسای ئەشعەری نییە، چونکە ئەم لەسەردەمی پێغەمەر خۆیدا،

لەغەزای حونەیندا شەهید بووە. درودی خودای گەورە لەسەر پێغەمەربێ‌و ڕەزاو ڕەحمەتی خوایش لەسەری هەموو یارو هاوڕێیانی بێت. لەموقەدیمەی فەتحولباریدا، باسی ئەوە ناکات کەئەبو عامیر چەند فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە.

## خۆشاو دروستە نا دروست نییە

١٨٤٣- عَنْ سَهْل بِنْ سعدٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قال:أَتَى أَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ فَدَعَا رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي عُرْسِهِ فَكَانَتِ امْرَأَتُهُ خَادِمَهُمْ وَهِيَ الْعَرُوسُ قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا سَقَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْقَعْتُ لَهُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ فِي تَوْرٍ.(الحديث ٥٥٩١ طرفه في: ٥١٧٦)[١٨٤٣].

سەهلی کوڕی سەعد -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ئەبو ئوسەیدی سەعیدی پێغەمەر بانگ دەکا بۆ سەرزەماوەنەکەی، ژنەکەی واتە بووکەکەی ژنی ئەو خزمەتی دەکردن، سەهل فەرمووی: ئایا دەزانن کە بووکێ چی خواردنەوەیەك پێشکەش دەکا بە پێغەمەر؟ هەر لەوەشەوە چەند دەنکێ خورما لە تەشپییەکی بەردینەدا دەخوسێنێ، وەلەپاش نان خواردن، ئەو خۆشاوی خورمایە دەدا بەپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نۆشی گیانی دەکات). (تاج/٣ ز/٤٠ ل/٩٢ ژ/٢ + تاج/٤ ل/٩٥ ز/٢٧ ژ/١ ش) + (ریاض/٢ ل/ ).

---

[١٨٤٣] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: اباحة النبيذ الذي لم يشتد ولم يصر مسكرا، رقم: ٢٠٠٦.

## رێدان بەبەکارهێنانی هەندێ دەفرو قاپو حاجەت

١٨٤٤- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ ابْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللّٰه عَنْهما قَالَ: لَمَّا نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْأَسْقِيَةِ قِيلَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَيْسَ كُلُّ النَّاسِ يَجِدُ سِقَاءً فَرَخَّصَ لَهُمْ فِي الْجَرِّ غَيْرِ الْمُزَفَّتِ.(الحديث ٥٥٩٣)[١٨٤٤].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- دەفەرموێ: لەوسەردەمەدا کەپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەیی کرد، لەدروست کردنی خۆشاو (نەبیز) لەهەندێ حاجەتی تایبەتا، وەك: کووپەی دارینو کوو لەکەو شتی وا، چونکە خۆشاوی ئەم جۆرە دەفرە، زوو دەبێ بەمەی.

عەرزیان کرد: قوربان! خۆ هەموو کەسێ جەوەندەو کوندەی دەست ناکەوێ، هەتا بەس لەوانا خۆشاو (نەبیز) بکا، وەك تۆ دەفەرمووی ئەی چار چییە؟ جا بەهۆی ئەم پرسیارە جوانەوە، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگەی خۆشاو کردنی لەکووپەڵەدا دا، بەمەرجێ بەزفت ڕووکەش نەکرابێ).

ڕوونکردنەوە:

مەبەستی سەرەکی لە نەهیەکەی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەوەبوو، کەهەتا دەتوانن لەمەی و هەرچی سەردەکێشێ بۆمەی دووربن، ئیتر دەفرو قاپ لەزاتی خۆیانا حەلاڵن و نەهی ڕووناکاتە ئەوان.

---

[١٨٤٤] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: النهي عن الأنتباذ بالمزفت..، رقم: ٢٠٠٠.

## خۆشاو دەبێ لەیەك جۆرە میوە بێت

١٨٤٥- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَ التَّمْرِ وَالزَّهْوِ وَالتَّمْرِ وَالزَّبِيبِ وَلْيُنْبَذْ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَةٍ.(الحديث ٥٦٠٢)[1845]

ئەبو قەتادە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەهی کردووە لەوە کەدووشت پێکەوە لەیەك دەفرا بکرێن بەخۆشاو، وەك خورماو بەرسیلەی ئاڵو بۆڵی خورما، یا وەك خورماو مێوژ، با هەریەکێ لەم دووە سەربەخۆ خۆی بەتەنها بخووسێنرێ و بکرێ بەخۆشاو).

## خواردنەوەی شیرو سەرداپۆشینی خۆراك

١٨٤٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: جَاءَ أَبُو حُمَيْدٍ بِقَدَحٍ مِنْ لَبَنٍ مِنَ النَّقِيعِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلَّا خَمَّرْتَهُ: وَلَوْ أَنْ تَعْرُضَ عَلَيْهِ عُودًا.(الحديث ٥٦٠٥ طرفه في: ٥٦٠٦)[1846]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ئەبو حومەید لەنەقیع، کە شوێنێکە وا لەشێوی عەقیق، کەبیست فەرسەخ لەشاری مەدینەوە دوورە، جامێ شیری هێنا بۆ پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- سەری دانەپۆشرابوو، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرموو: (ئەوە بۆچی سەریت دانەپۆشیوە، دەبوو ئەگەر هەر هیچت دەست نەکەوتایە کەبیکەی بەقەباغ بۆی، تەڵەدارێکت بەسەردا ڕایەڵ بکردایە).

---

[1845] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: كراهة انتباذ التمر و الزبيب مخلوطين، رقم/١٩٨٨.

[1846] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: شرب النبيذ و تخمير الإناء، رقم: ٢٠١١.

١٨٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: نِعْمَ الصَّدَقَةُ اللِّقْحَةُ الصَّفِيُّ مِنْحَةً وَالشَّاةُ الصَّفِيُّ مِنْحَةً تَغْدُو بِإِنَاءٍ وَتَرُوحُ بِآخَرَ.(الحديث ٥٦٠٨ طرفه في: ٢٦٢٩)[١٨٤٧].

ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (وشتری شیرداری بەشیرو مەڕو بزنی شیرداری بەشیر، خێرێکی گەلێ چاکن، بۆ کەسێ بەدۆخە بیاندا بەخێزانێ، کە بۆخۆیان شیرەکەی بخۆن، بەیانی قاپێ شیرو ئێوارە قاپێ شیر، دەسەنەیەکی گەلێ چاکە).

دۆخە ئاژەڵێکە مەڕ بێ، یا بزن بێ، یا مانگابێ، یا وشتربێ، کە خاوەنەکەی بەپیاوەتی، بەخۆڕایی، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، دەیدا بەماڵێکی ڕەشایی کە ئاژەڵی دۆشەنی یان نەبێ، کەهەتا وشك دەکا بۆ خۆیان شیروماست و دۆکەی بخۆن‌و داویی بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی. فەرموودەکە بۆنی ئەوەی لێ دێ، کە واپەسەندە ئەو ئاژەڵەی دەدرێ بەدۆخە لەسەرگوان بێ و بەرلەزایین بدرێ بەماڵە ڕەشاییەکەو لەهەمان کاتدا شیردەرێکی باش بێ، ئەوەك خاوەنەکەی ئاژەڵێکی ئایەخ هەڵبژێرێ.

١٨٤٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ رَضِيَ اللَّه عَنهمَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ وَمَعَهُ صَاحِبٌ لَهُ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنْ كَانَ عِنْدَكَ مَاءٌ بَاتَ هَذِهِ اللَّيْلَةَ فِي شَنَّةٍ وَإِلَّا كَرَعْنَا قَالَ وَالرَّجُلُ يُحَوِّلُ الْمَاءَ فِي حَائِطِهِ قَالَ: فَقَالَ الرَّجُلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ عِنْدِي مَاءٌ بَائِتٌ فَانْطَلِقْ إِلَى الْعَرِيشِ قَالَ: فَانْطَلَقَ بِهِمَا فَسَكَبَ فِي قَدَحٍ ثُمَّ حَلَبَ عَلَيْهِ مِنْ دَاجِنٍ لَهُ قَالَ فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ شَرِبَ الرَّجُلُ الَّذِي جَاءَ مَعَهُ.(الحديث ٥٦١٣ طرفه في: ٥٦٢١) + (رياض/٢ ل/٢٧١)[١٨٤٨].

---

[١٨٤٧] اخرجه مسلم في الزكاة، باب: فضل المنيحة، رقم: ١٠١٩، ١٠٢٠.

[١٨٤٨] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث جابر في الكرع (خاتمة كتاب الأشربة ج/١١ ص/٢٣٨) -المترجم-.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر بێ- لەگەڵ پیاوێ لەهاوڕێیانی، کە حەزرەتی ئەبوبەکری صەدیق بوو -ڕەزای خوای لێ بێ- چوون بۆلای پیاوێ لەیاردەدەران، کە لەزاراوی خەڵکی فەرموودەدا ناودارن بە (ئەنصار)، کە ئەوپیاوە ناوی ئەبو هەیسەمی کوڕی تەیهانی ئەنصاری بوو، پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر بێ- بەپیاوەکەی فەرموو: (ئەگەر ئاوی شەویی کوندەت هەیە، بیهێنە بۆمان، تا بیخۆینەوە، ئەگینا خۆمان دەمی تی دەنێین و بەدەم لەجۆگەکە دەخۆینەوە).

پیاوەکە بەبێڵێ ئاوەکەی لەدێراوەکەوە دەگواستەوە بۆ دێراوێکی تر. هەتا هەموو درەختەکان ئاو بخۆنەوە، فەرمووی: پیاوەکە عەرزی کرد: قوربان: ئاوی شەویم هەیە، کەئەم شەو لەکوندەدا بووە، کەئاوی وا هەم سارده و هەم سافە، ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموون بابڕۆین بۆلای ساباتەکە. فەرمووی: جا هەردووکیان دەبا بۆلای کەپرەکە، لەوێ لەکوندەکە ئاوی کردە جامێک و ئاژەڵێکی دەستە مۆیان هەبوو دۆشیو شیرەکەی کرد بەسەر ئاوەکەداو کردی بەشیراو، ئەوجا پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- لێی خواردەوە، ئەوجا ئەبوبەکریش لێی خواردەوە، کەلەگەڵیا بوو). (تاج/٤ ز/١٧ ل/٦٠ ژ/١٣).

## ئاوخواردنەوە بەپێوە دروستە

١٨٤٩- عَنْ عَلِيٍّ رَضِي اللَّه عَنه أَنَّهُ أَتَى عَلَى بَابِ الرَّحَبَةِ فَشَرِبَ قَائِمًا فَقَالَ إِنَّ نَاسًا يَكْرَهُ أَحَدُهُمْ أَنْ يَشْرَبَ وَهُوَ قَائِمٌ وَإِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ كَمَا رَأَيْتُمُونِي فَعَلْتُ.(الحديث ٥٦١٥ طرفه في: ٥٦١٦)[١٨٤٩].

---

[١٨٤٩] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث علي في الشرب قائما (خاتمة كتاب الأشربة ج/١١ ص/٢٣٨).

—المترجم

نەززال -ڕەحمەتو ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: لەبەردەرگای حەوشەی مزگەوتی کووفەدا، ئاویان هێنا بۆ ئیمامی عەلی -ڕەزای خوای لێ بێ- عەلی بەڕاوەستانەوە ئاوەکەی خواردەوە و فەرمووی: (هەندێ کەس حەز ناکەن بەڕاوەستانەوە شت بخۆنەوە، بەڵام من بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە -درودی خوای لەسەر بێ- ئاوا وەك ئێستای من بەڕاوەستانەوە شتی خواردەوە!). (تاج/٤ ل/٥٧ ز/٧ ژ/٢) + (ریاض/٢ ل/٢٦٧ ژ/٢/٧٦٨ ز/١١٤).

١٨٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما قال: شَرِبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قائِماً مِنْ زَمْزَمَ.(الحديث ٥٦١٧ طرفه في: ١٦٣٧ فتح = ٧٨٣ تجريد = بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٢٠١) لەپێشەوە بەتەواوی ڕابوورد (ریاض/٢ ل/٢٦٧ ژ/٧٦٧)[١٨٥٠].

## دەمو هەنگڵی کوندەو مەشکە هەڵپێچ کردن

١٨٥١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: نَهَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ اخْتِنَاثِ الْأَسْقِيَةِ يَعْنِي الشُّرْبَ مِنْ أَفْوَاهِهَا.(الحديث ٥٦٢٥ طرفه في: ٥٦٢٦)[١٨٥١]

ئەبوسەعیدی خودری -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- نەهی دەکرد لەوە کەدەم و هەنگڵی کوندەو جەوەندەو مەشکە هەڵێنج بکرێو ئەنجا دەمی پێوە بنرێ و ئاوی لێ بخورێتەوە). (تاج/٤ ز/١٧ ل/٦٠ ژ/١١ ش/د/ت) + (ریاض/٢ ل/٢٦٢ ژ/٧٦٢ ز/١١١).

---

[١٨٥٠] سبق تخريجه في رقم: ٧٨٣. -المترجم-

[١٨٥١] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: آداب الطعام و الشراب و احكامها، رقم: ٢٠٢٣.

## خواردنەوە لەدەمی کوندەو مەشکە

١٨٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الشُّرْبِ مِنْ فَمِ الْقِرْبَةِ أَوِ السِّقَاءِ وَأَنْ يَمْنَعَ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَهُ فِي دَارِهِ. (الحديث ٥٦٢٧ سبق طرفه في: ١٠٦٩ تجريد = بەرگی/٣ ل/١٦١)[١٨٥٢].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگری دەکرد لەوە، کەدەم بنرێ بەدەمو هەنگڵی دەفری چەرمینی ئاوو شتی واوە، وەك کوندەو مەشکەو شتی تری وا. مەندەی فەرموودەکە لەژمارە: ١٠٦٩ تەجرید = ٢٤٦٣ فەتح = بەرگی/٣ ل/١٦١) لەوێ ڕابورد (ریاض/١ ل/٢٥٣).

## هەناسەدان لەکاتی شت خواردنەوەدا

١٨٥٣- عَنْ أَنَسٌ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَتَنَفَّسُ فِي الإِنَاءِ ثلاثاً.(الحديث ٥٦٣١). (بڕ: ریاض/٢ ز/١١١ ل/٢٦٢ ژ/٧٥٧)[١٨٥٣].

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- دەیفەرموو: دەستووری پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وابوو: بەسێ بین شتی دەخواردەوە، لەدەرەوەی جامەکە سێ هەناسەی دەدا). (بڕ: ژمارە: ١٢١=بەرگی/١ ل/١٤٥).

**ڕوونکردنەوە:**

واتە: زۆرینەی کات پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کاتێ کەئاو و شتی وای دەخواردەوە، پەلەپەلی نەدەکرد، بەڵکوو لەسەرەخۆ، بەشێنەیی، بەسێ جار شتەکەی نۆش دەکرد، هەموو جارێ جامەکەی لەدەمی دوور دەخستەوە

---

[١٨٥٢] سبق في رقم: ١٠٦٩ - ج/٣ ص/١٦١. —المترجم

[١٨٥٣] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: كراهة التنفس في نفس الإناء ..رقم: ٢٠٢٨.

هەناسەیەكی پشوودانی دەدا)، ئەوجا هەندێكی تری دەخواردەوە هەتا تێراو دەبوو، زۆرینەی كات بەسێ هەناسە شتەكەی دەخواردەوە. (بڕوانە: ژ/١٢١ ت/١٥٣ فەتح).

١٨٥٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الَّذِي يَشْرَبُ فِي إِنَاءِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ.(الحديث ٥٦٣٤)[1854].

ئوم سەلەمە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەركەسێ لە حاجەتی زیودا شت بخواتەوە، ئەوە قڵپە قڵپ ئاگری سووری دۆزەخ دەڕژێنێتە ناو سكی خۆیەوە). (ریاض/٢ ژ/١١٦ ل/٢٧٢ ژ/٧٧٨ ش).

١٨٥٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ:جَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ فَقَالَ: اسْقِنَا ياسَهْلُ. قَالَ: فَخرَجْتُ لَهُمْ هَذَا الْقَدَحَ فَأَسْقَيْتُهُمْ فِيهِ. قَالَ الراوي: فَأَخْرَجَ لَنَا سَهْلٌ ذَلِكَ الْقَدَحَ فَشَرِبْنَا مِنْهُ قَالَ: ثُمَّ اسْتَوْهَبَهُ بَعْدَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ فَوَهَبَهُ لَهُ. (الحديث ٥٦٣٧)[1855].

سەهلی كوڕی سەعد -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: جارێ حەزرەتی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەبۆنەیەكا، تەشریفی هات لەساباتەكەی بەنی سەعیدە، لەوێ دانیشتو بوو بەمیوانمان، ئەوجا فەرمووی (ئەی سەهل! خواردنەوەیەكی پاكمان بۆ بێنە). منیش ئالەم جامەدا، كەجامی پێغەمەر خۆی بوو، خواردنەوەیەكی پاكو حەلاڵم دەخوارد دان، پێغەمەر خۆی و هاوڕێكانی دەمی پیرۆزیان نا بەلێوی ئەم جامەوەو لەخواردنەوەكەیان

---

[1854] اخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: تحريم استعمال أواني الذهب و الفضة في الشرب، رقم: ٢٠٦٥.

[1855] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: عقوبة من شرب الخمر..رقم: ٢٠٠٧.

خـواردەوە. ئـەبو حـازم كەئـەم فەرموودەيـە لـەزاری سـەهلەوە دەگێڕێتـەوە فەرمووی: (جاله سەرداوای خۆمان، سەهل ئەوجامەی بۆمان هێنا، وە ئاومان لێی خواردەوە بۆ موفەڕكی).

فـەرمووی: لـەدواتر عومـەری كـوڕی عەبدولعـەزیز، كاتـێ فـەرمانڕەوای سەرشـاری مەدینـەبوو، داوای لەسـەهل كـرد كەئـەو جامـەی پـێ ببەخـشێ، ئەویش بەخشی پێی).

١٨٥٦- عَنْ عَاصِمٍ الْأَحْوَلِ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالى قَالَ: رَأَيْتُ قَدَحَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللَّهُ عَنْه قَالَ: قَالَ أَنَسٌ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي هَذَا الْقَدَحِ أَكْثَرَ مِنْ كَذَا وَكَذَا قَالَ: كَانَ فِيهِ حَلْقَةٌ مِنْ حَدِيدٍ فَأَرَادَ أَنَسٌ أَنْ يَجْعَلَ مَكَانَهَا حَلْقَةً مِنْ ذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ فَقَالَ لَهُ أَبُو طَلْحَةَ: لَا تُغَيِّرَنَّ شَيْئًا صَنَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَرَكَهُ.(الحديث ٥٦٣٨ طرفه في: ٣١٠٩)[١٨٥٦].

عاصیمی ئـەحوەل –ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: جامی ئـاو خواردنەوەكـەی پێغەمـەرم لـەلای ئەنـەس دی. ئەنـەس -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فەرمووی: (چەندەهاو بارەها جار بەدەستی خۆم ئالەم جامەدا ئاوو شتی تری خواردنـەوەم داوە بەپێغەمـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- خواردوويەتيـەوە عاصم فەرمووی: ئیبنو سیرین فەرمووی: ئەڵقەیەكی ئاسنی پێ بوو، ئەنـەس ویستی بیگۆڕێ بەئەڵقەیەكی زێڕ، یا گوتی: بیگۆڕێ بەئەڵقەیەكی زیـو، ئـەبو تەڵحـەی زڕبـابی ئەنـەس بەئەنەسـی فـەرموو: (شـتێ كـە پێغەمـەر خـۆی -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- كـرد بێتـی تـۆ دەسـتكاری مەكـەو مـەیگۆڕە) ئـیتر ئەنەسیش دەستكاری ئەڵقەكەی نەكرد.

---

[١٨٥٦] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي طلحة في قدح النبي صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ (خاتمة كتاب الأشربة ج/١١ ص/٢٣٨ - الفتح). -المترجم

روونكردنەوە:

١. ئەم جامە لەداری نایاب، وەك داری ئابە نووس دروست كرابوو، پانكۆڵە بوو، پانیەكەی زیاتر بوو لەقووڵیەكەی، ئەڵقەیەكی ئاسنینی پێوە بوو، بەو ئەڵقەیە هەڵ دەواسرا، لەنیو مودد زیاتری دەگرت، بەڵام كەمتر لەموددێكی دەگرت.

٢. ئەنەس دەیفەرموو: بەدەستی خۆم لەم جامۆڵكەیەدا جۆرەها خواردنەوەم پێشكەش كردووە بەپێغەمەرو نۆشی كردووە، وەك شەرابی هەنگوین‌و خۆشاو و ئاو و شیرو شتی تر.

٣. بوخاری –ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرمویَ: (لە بەصرە بەخزمەت ئەم جامەی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- گەیشتووم، وە بەچاوی خۆم دیومە ئاوم پێ خواردۆتەوە، بەر نەضری كوڕی ئەنەس كەوتبوو، لەكەلەپوورەكەی نەضر كڕیبوویان بەهەشت سەدهەزار درەمی زیو).

٤. چەند جامێكی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەپاش مەرگی، لەلای ئەم زاتانە بوو، وە هەموویان لەداربوون، جامێ یادوان لەلای ئەنەس بوو، جامێ لەلای سەهل بوو، جامێ لەلای عەبدوڵڵای كوڕی سەلام بوو. جامێكیان ناوی رەییان بوو، جامێكیان ناوی موغیث بوو، جامێ تری هەبوو، سێ پینەی زیوی پێوە بوو.

٥. كۆمەڵێ شتی تر، لەئاكاری پێغەمەر، لەپاش مەرگی خۆی، بەجێمابوو، وەك: جبەو مێزەرو شانەیەكی عاج‌و مەقەست‌و سیواك‌و ئاوێنەو ئەموستیلەو قەرەوانەیەكی شووشە و چەندین شتی تری لەم بابەتە، لەپاش خۆی، موسوڵمانان بۆ تەبەروك بەكاریان دەهێنا.

# پایانی - الخَاتِمَةُ

شێخی عەسقەلانی -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: نامەی خواردنەوەکان نەوەدو یەك فەرموودەی لەخۆ گرتووە، نۆزدە ڕێگە (طريق)یان بێ ڕشتەن، واتە: تەعلیقن، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: موصولن، حەفتا ڕێگەیان دووبارەن، پوختەکەیان برێتییە لە (٩١ — ٧٠ = ٢١) بیستو یەك فەرموودە، ئیمامی موسلیمیش وەکوو ئیمامی بوخاری ئەم پوختەیەی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەمانەیان:

١. فەرموودەی ژمارە: ١٨٤٢ تەجرید=٥٥٩٠ فەتح= حدیث ابي مالك و ابي عامر في المعارف.

٢. فەرموودەی ژمارە: ٥٥٩٦ فەتح = حدیث إبن ابي اوفى في الجر الأخضر.

٣. ژمارە: ٥٦١٠ فەتح = حدیث انس في الأقداح ليلة الإسراء وهو معلق.

٤. ژمارە: ١٨٤٨ تەجرید = ٥٦١٣ فەتح = حدیث جابر في الكرع.

٥. ژمارە: ١٨٤٩ تەجرید = حدیث علي في الشرب قائما = ٥٦١٥ فەتح.

٦. ژمارە: ٥٦٢٨ فەتح = حدیث ابى هريرة في النهي عن الشرب من فم السقاء. بەڵام ئەم فەرموودەیە کەتەرەفی ژمارە: ٢٤٦٣ فەتحە. لەوێ دەفەرموێ: موسلیم تەخریجی کردووە. (بڕ: ژ/١٠٦٩ تجريد = بەرگی/٣ ل/١٦١).

٧. ژمارە: ١٨٥٦ تەجرید = ٥٦٣٨ فەتح= حدیث ابي طلحة في قدح النبي صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ.

دەیش فەرموێ: چوارده بیسراوی صەحابە و چینانی دواسەحابەیشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٧٨- نامەی نەخۆشەکان - كتاب المرضى

١٨٥٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ وَلَا وَصَبٍ وَلَا هَمٍّ وَلَا حُزْنٍ وَلَا أَذًى وَلَا غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ.(الحديث ٥٦٤١ و الحديث ٥٦٤٢)[١٨٥٧].

ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوایان لێ بێ- دەفەرموون: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هەرشەکەتی‌و کفتی‌و نەخۆشی‌و پەژارەو خەم‌و خەفەت و ئێش‌و ئازارێ کەتووشی موسوڵمان دەبێ، خودا دەیانکات بەسەرپۆش‌و پەردە (کەفارەت) و برێتی گوناهەکانی، وەیەکە یەکە گوناهەکانی ئەو موسوڵمانە دەسڕنەوە، تەنانەت دڕکێکیش کەلە شوێنێکی هەڵچەقێ هەروا -ش). (تاج/٤ ز/٥٢ ژ/١ ل/١٧١).

١٨٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ مِنَ الزَّرْعِ مِنْ حَيْثُ أَتَتْهَا الرِّيحُ كَفَأَتْهَا فَإِذَا اعْتَدَلَتْ تَكَفَّأُ بِالْبَلَاءِ وَالْفَاجِرُ كَالْأَرْزَةِ صَمَّاءَ مُعْتَدِلَةً حَتَّى يَقْصِمَهَا اللَّهُ مَتَى شَاءَ.(الحديث ٥٦٤٤ طرفه في: ٧٤٦٦)[١٨٥٨]

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (موسوڵمان وەك قەرسیلی سەوزیی نەرم‌و نۆڵ وایە،

---

[١٨٥٧] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب ..رقم: ٢٥٧٣.

[١٨٥٨] اخرجه مسلم في صفات المنافقين و احكامهم.. باب: مثل المؤمن كالزرع و مثل الكافر..رقم: ٢٨٠٩.

هەروەك چۆن قەرسیل بەدەم باوە هەژارەدەكا، بەلام بایەكە قەرسیلەكەی بۆ هەڵناكەنرێ، هەركە باكەی خست قەرسیلەكە قیتو قنجو ڕەپ و ڕاست ڕادەوەستێت، موسوڵمانیش ئاوا دەردوبەلا، لەهەموو جۆرێ، لەهەر چوارلاوە، دەیهێنێو دەیبات، بەلام موسوڵمانەكە خۆگرە، هەركە ڕزگاری بوو دەست دەكا بەژیانێكی ئاساییو سوپاسگوزاری خوا دەكا و هەمیشە سەركەوتوو دەبێ. بەلام مرۆی بەدكار (فاجر) وەك شێخەڵی دار كاژ وایە، قەوی و پتەوەو ڕەپو ڕێك ڕادەوەستێت، كەمتر تووشی دەردو بەلا دەبێ، هەتا لەناكاوێكا، بای ئاكام لەڕەگ و ڕیشە هەڵی دەكەنێو خوا لەكاتو ساتی خۆیدا پشتی دەشكێنێ).

١٨٥٩- وَعَنْهُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: قال رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ يُرِدِ الله بِهِ خَيْرَاً يُصِبْ مِنْهُ.(الحديث ٥٦٤٥)[١٨٥٩].

دیسان ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هەركەسێ كەخودا خواستی خێری پێ هەبێ، تووشی ئێشو ئازارو دەردو بەلای دەكا). (ریاض/١ ل/٥٨ ژ/٣٩ ز/٣) + (تاج/٤ ز/٥٢ ل/١٧١ ژ/٣).

١٨٦٠- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْهَا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَشَدَّ عَلَيْهِ الْوَجَعُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ . (الحديث ٥٦٤٦)[١٨٦٠].

عائیشە هاوسەری پێغەمەر -دروودی خوا لەسەر پێغەمەرو ڕەزای خوا لەسەر هەموو هاوسەرەكانی بێ- فەرمووی: كەسم نەدیوە كەوەك پێغەمەر - دروودی خوای لەسەر بێ- ئاوا ئازاری سەخت بێ). (تاج/٤ ز/٥٢ ل/١٧٢ ژ/٤).

---

[١٨٥٩] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة: (من يرد الله به خيرا ...). (فتح/١١ ص/٢٧٦ خاتمة كتاب المرضى). —المترجم—

[١٨٦٠] أخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: ثواب المؤمن فيما يصيبه... رقم: ٢٥٧٠.

١٨٦١- عَنْ عَبْدِاللّهِ رَضِي اللّه عَنْه قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلّى اللّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَرَضِهِ وَهُوَ يُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا وَقُلْتُ: إِنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا قُلْتُ إِنَّ ذَاكَ بِأَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ قَالَ: أَجَلْ مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى إِلَّا حَاتَّ اللَّهُ عَنْهُ خَطَايَاهُ كَمَا تَحَاتُّ وَرَقُ الشَّجَرِ.(الحديث ٥٦٤٧ أطرافه في: ٥٦٤٨، ٥٦٦٠، ٥٦٦١، ٥٦٦٧)[١٨٦١].

ئیبنو مەسعود کەناوی عەبدوڵلایە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (لە نەخۆشینەکەی پێغەمەردا، -دروودی خوای لەسەر بێ- چووم بۆ سەردان و هەواڵپرسینی، تایەکی گرانی لێ هاتبوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! تایەکی گران و سەخت دایگرتوویت. فەرمووی: (ئەدی وایە، من کە تا دامدەگرێ بەقەد دووپیاو لەئێوە تا دامدەگرێ، گوتم: دیارە ئەوە لەبەر ئەوەیە کەتۆ دووقات پاداشت بۆ هەیە، فەرمووی: (بەڵێ ئەوە وایە، وە هەر موسوڵمانێ هەرئێش و ئازارێکی بێتەڕێ، لەدڕکێکەوە بیگرە هەتا زیاتر، بەهۆی ئەوەوە خودا گوناهەکانی هەڵ دەوەرێنێ، هەروەك چۆن گەڵای درەختێ سەرپاك هەڵوەرێ ئاوا، هەتا لەئەنجاما بەهۆی نەخۆشی و ئێشو ئازارەوە موسوڵمان لەگوناه پاك دەبێتەوە). (تاج/٤ ل/١٧٢ ز/٥٢ ژ/٥ -ش).

١٨٦٢- عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ رحِمَهُ اللّهُ تعالى قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْه أَلَا أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوْدَاءُ أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ إِنِّي أُصْرَعُ وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ لِي قَالَ إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ فَقَالَتْ: أَصْبِرُ فَقَالَتْ: إِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللَّهَ لِي أَنْ لَا أَتَكَشَّفَ فَدَعَا لَهَا.(الحديث ٥٦٥٢)[١٨٦٢].

---

[١٨٦١] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: ثواب المؤمن فيما يصيبه ..رقم: ٢٥٧١.

[١٨٦٢] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب ثواب المؤمن ...رقم: ٢٥٧٦.

عەتای کوڕی ئەبوڕەباح -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- فەرمووی: ئیبنوعەباس -ڕەزای خوایان لێ بێ- پێی فەرمووم: بازنێکی بەهەشتیت پێ نیشانبدەم، گوتم: ئادەی بفەرموو، فەرمووی: ئەم ژنە ڕەشە هاتە لای پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- عەرزی کرد: قوربان! من فێم لێ دێ، و کاتێ پەرکەمەکە دەمگرێ گیانم دەردەکەوێ، لەخودا بپاڕێرەوە بۆم، کەچاکم بکاتەوە. فەرمووی: (ئەگەر حەزدەکەی ددان بگرە بەخۆتا و ئۆقرە بگرەو ئارام بگرە لەسەر ئەم نەخۆشینو ئێشو ئازارە، لەتۆڵەی ئەوەدا خودا بەهەشتت پێ خەڵات دەکا. ئەگەر حەزیش دەکەی ئەوا لەخوا دەپاڕێمەوە بۆت کەخودا چاکت بکاتەوە!) ژنە ڕەشەکە فەرمووی: (باشە ئارام دەگرمو لەژێر باری خودادا صەبر دەگرم، بەڵام لەکاتی خوولێهاتنەکەدا لەشم دەردەکەوێ، لەخودا بپاڕێرەوە کە ئیتر لەشم دەرنەکەوێ، پێغەمەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- نزای ئەوەی بۆیکرد...). (تاج/٤ ل/١٧٤ ز/٥٢ ژ/٩ -ش).

١٨٦٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ يُرِيدُ عَيْنَيْهِ.(الحديث ٥٦٥٣)[١٨٦٣].

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: لەپێغەمەرم بیست دەیفەرموو: (خودای گەورە، لەفەرموودەیەکی قودسیدا، دەفەرموێ: کاتێ دووچاو بەو شیرینو نازدارییە، لەبەندەی خۆمم سەندەوە و گیرۆدەی داوی کوێریم کردو، ئەویش مەردانە لەژێر باری تاقی کردنەوەی مندا، ئارامی گرتو ددانی گرت بەخۆیداو، بەبەشی من ڕازی بوو، ئەوە منیش هەقی بۆ دەکەمەوەو لەباتی

---

[١٨٦٣] لم يوافقه مسلم على إخراج حديث انس في الحبيبتين (فتح/١١ ص/٢٧٦ خاتمة كتاب المرضى، ط.ج). -المترجم

ئـەو دووچـاوە لەقیامـەتـا، بەهەشـتـی دەدەمـێ!. (تـاج/٤ ل/١٧٥ ژ/١٠ ز/٥٢ ش/ت).

١٨٦٤– عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللّٰه عَنْه قَالَ: جَاءَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي لَيْسَ بِرَاكِبِ بَغْلٍ وَلَا بِرْذَوْنٍ.(الحديث ٥٦٦٤ سبق طرفه في: رقم: ١٤٣ تجريد = ١٩٤ فتح = بەرگی ١/ ل/١٦٤)[١٨٦٤].

لێرەدا دەفەرموێ: نەخۆش بووم پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەگەڵ ئەبوبەکری صدیقا، بەپێ تەشریفیان هات بۆ هەواڵپرسینم، نەبە سواری هێستر بوون و نە بەسواری بارگیر بوون).

١٨٦٥– عَنْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنها قَالَتْ: وَا رَأْسَاهْ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاكِ لَوْ كَانَ وَأَنَا حَيٌّ فَأَسْتَغْفِرَ لَكِ وَأَدْعُوَ لَكِ فَقَالَتْ عَائِشَةُ وَا ثُكْلِيَاهْ وَاللّٰهِ إِنِّي لَأَظُنُّكَ تُحِبُّ مَوْتِي وَلَوْ كَانَ ذَاكَ لَظَلِلْتَ آخِرَ يَوْمِكَ مُعَرِّسًا بِبَعْضِ أَزْوَاجِكَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَلْ أَنَا وَا رَأْسَاهْ لَقَدْ هَمَمْتُ أَوْ أَرَدْتُ أَنْ أُرْسِلَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَابْنِهِ وَأَعْهَدَ أَنْ يَقُولَ الْقَائِلُونَ أَوْ يَتَمَنَّى الْمُتَمَنُّونَ ثُمَّ قُلْتُ يَأْبَى اللّٰهُ وَيَدْفَعُ الْمُؤْمِنُونَ أَوْ يَدْفَعُ اللّٰهُ وَيَأْبَى الْمُؤْمِنُونَ.(الحديث ٥٦٦٦ طرفه في: ٧٢١٧)[١٨٦٥].

جارێ حەزرەتی عائیشە سەری دێشێ، لەتاو ژانی سەری دەفەرموێ: وای سەرم! حەزرەتی عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: کەمن وام گوت پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (نەخۆشی نیشانەی مردنە ئەگەر تۆ لەپێش منا بمریت ئەی عائیشە! بێگومان لەخوای گەورە بۆت دەپاڕێمەوە کە گوناهەکانت بپۆشێ و نزای باشت بۆ دەکەم!) منیش گوتم:

---

[١٨٦٤] اخرجه مسلم في الفرائض (عيني/٣/٨٧/٥٧). -المترجم-

[١٨٦٥] لم يوافقه مسلم في تخريج حديث عائشة انها قالت: وارأساه -الى قوله -بل انا و ارساه-). خاتمة كتاب المرضى فتح/١١ ص/٢٧٦). -المترجم-

ئای كۆستم كەوێ! بەخوا وادەزانم حەز دەكەیت كەمن بمرم، خۆ ئەگەر شتی وا ڕوویدات، من بمرمو تۆ زیندوو بیت، ئەوەندە خەم بۆ من ناخۆی هەر ئەو ڕۆژە منت بیردەچێتەوە، دوورنیە لەكۆتایی ئەو ڕۆژەدا كەلەگەڵ یەكێك لەژنەكانتا زەماوەن بكەیت، واتە: بچیتە لایو دروست ببیت لەگەڵی!!.

دیارە كەئەم جۆرە قسەو گفتوگۆیە، لە ڕووی نازو ڕازو گلەیی بەینی ژنو مێدەوە بووەو بۆ خۆشیو سوعبەت بووە بۆیە خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- بەقسەكەی عائیشە زەردەخەنە دەیگرێ. ئەوجا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بەعائیشە دەفەرموێ: (واز لەم قسانە بێنە تۆ زۆرت ماوە لەژیاندا، ئەگەر راستیت دەوێ، من وای سەرم! مەرگ گرِی من دەدا نەوەك تۆ، كەواتە هەتا زووە مشورێكی من بخۆ! پێغەمەر بەسرووش —وحی- ئەمە دەزانێ. عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (ئیتر بەرە بەرە نەخۆشینی سەرەمەرگی دەستی پێكرد).

پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ویستی كە دووپاتی بكاتەوە بۆ عائیشە كە مەرگی نزیكە، ئەوەتا بیر لەدیاریكردنی جێنشین بۆ خۆی دەكاتەوە لەهەمان كاتا دەیەوێ دڵی بداتەوە، بەوە كە باوكی مورشەحە بۆ ئەوە، وەك عائیشە خۆی ئەمە ڕوون دەكاتەوە و دەفەرموێ: (پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە نەخۆشینی سەرەمەرگا كەتیا مرد، فەرمووی: ئەی عائیشە ئەبوبەكری باوكتو براكەتم بۆ بانگ بكە، هەتا وەسێتنامەیێ بنووسم بۆ ئەبوبەكر، كەلەپاش مەرگی خۆم ئەوجێ نشینم بێ، نەبادا هەركەسە بۆخۆی هەوڵ بدا بۆ شوێنەكەم و بڵێ: هەقی منەو بۆ من ڕەواترە و بڕوبیانوو بۆ ئەمە بدۆزنەوە! لەپاشا فەرمووی: وەڵێ نا، پێویست بەنامە و راسپێری ناكا، چونكە خودا ئەوە ناكات و موسوڵمانیش شتی وا قەبوڵ ناكەنو جگە لە ئەبوبەكر بەكەسی تر ڕازی نابن كەلەپاش خۆم ببێ

بەجێنشینم، ئەوە بوو وابوو لەپاش حەزرەت ئەبوبەکر کرا بەجێنشین.
(تاج/٥ ز/٣ ل/١٧ ژ/٥) + (ریاض/٢ ل/٣٥٠ ژ/٩١٦).

١٨٦٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ مِنْ ضُرٍّ أَصَابَهُ فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ فَاعِلًا فَلْيَقُلِ اللّٰهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي.(الحديث ٥٦٧١).
(ریاض/١ ز/٣ ل/٥٨ ژ/٤٠ -ش)[١٨٦٦]

ئەنەسی کوڕی مالك -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەگەر تووشی ناخۆشی بوون خۆزگە بۆ مردن مەخوازن، ئەگەر هەرناچار بوون شتی وابکەن بڵێن خوایە هەتا ژیانم بۆم باشە بم ژێنە، وەکاتێ مردنم باشتر بوو بۆم بم مرێنە). (تاج/١ ل/٥١٦ ز/١٩١ ژ/١ ش/د/ت/ن).

١٨٦٧- عَنْ خَبَّابٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّهُ اكْتَوَى سَبْعَ كَيَّاتٍ فَقَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا الَّذِينَ سَلَفُوا مَضَوْا وَلَمْ تَنْقُصْهُمُ الدُّنْيَا وَإِنَّا أَصَبْنَا مَا لَا نَجِدُ لَهُ مَوْضِعًا إِلَّا التُّرَابَ وَلَوْلَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ.(الحديث ٥٦٧٢ اطرافه في: ٦٣٤٩، ٦٣٥٠، ٦٤٣٠، ٦٤٣١، ٧٢٣٤)[١٨٦٧].

خەبباب -ڕەزای خوای لێ بێ- لەحەوت شوێن سکی خۆی داخ کردبوو فەرمووی: هاوڕێ پێشینەکانمان، بەروو سووری مردن و سەریان نایەوە، بەهۆی خۆشی جیهانەوە لەپاداشی دوا ڕۆژیان بەهیچ جۆرێ کەم نەبۆوە چونکە تێکەڵاوی دنیا نەبوو بوون. بەڵام ئێمە بەپێچەوانەوەی ئەوانەوە، ئەوەندە سامان و دارایمان کەڵەکە کردووە، جێ نەماوە تێی کەین، مەگەر خانووی پێ بکەین، وە لەبەر ئەوە نەبێ کە پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر

---

[١٨٦٦] و الحديث اخرجه مسلم في الدعوات (العيني/٢١ ص/٢٢٥). -المترجم

[١٨٦٧] و الحديث اخرجه مسلم في الدعوات (العيني/٢١ ص/٢٢٦). -المترجم

بێ- ڕێگری کردووه لێمان که مەرگ بەئاوات بخوازین، دەنا مەرگی خۆمم بەئاوات دەخواست). (تاج/١ ز/١٩١ ل/٥١٦ ژ/١).

١٨٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَنْ يُدْخِلَ أَحَدًا عَمَلُهُ الْجَنَّةَ قَالُوا: وَلَا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لَا وَلَا أَنَا إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِفَضْلٍ وَرَحْمَةٍ فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَلَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَزْدَادَ خَيْرًا وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعْتِبَ.(الحديث ٥٦٧٣ سبق في: ٣٧ ب/١ ل/٥٦)[١٨٦٨]

ئەبو هورەیره -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست - دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (قەت کردەوەی کەسێ نایباتە بەهەشت)، هاوڕێیان فەرموویان: هەتا تۆیش ئەی پێغەمەری خودا! بەکردەوەی باشی خۆت ناچیتە بەهەشت؟ فەرمووی: (بەڵێ، هەتا منیش بەهۆی کردەوەی خۆمەوە ناچمە بەهەشت، مەگەر خودا بەمیهرو سۆزو ڕەحمەتی خۆی بم پۆشێو نوقمی میهرەبانی خۆیم بکات، جا کەواتە هەر لەئێستاوە ملی ڕێگەی ڕاست بگرن‌و ئەوەندەی بۆتان دەلوێ درێغی لەکردنی کاری باش مەکەن‌و مزگێنی وەربگرن).

هەرگیز کەستان مەرگ بەئاوات مەخوازن، چونکە ئەوەی خۆی باشەو چاکەکارە، سا بەڵکوو باشتر دەبێ‌و پتر چاکە دەکا، ئەوەیشی کە خۆی خراپەکارە و پیاو خراپە، سا بەشکوو خودای گەورە موڵەتی بدا، تا تەوبە دەکاو دەگەڕێتەوە بۆلای خودا). (ریاض/١ ز/١٤٠ ل/١٣٥ ژ/١٤٥) + (تاج/١ ز/٩ ل/٥١٧ ژ/٢).

١٨٦٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَتَى مَرِيضًا أَوْ أُتِيَ بِهِ قَالَ أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي لَا شِفَاءَ

---

[١٨٦٨] سبق في: رقم/٣٧ تجريد/٣٩ فتح = بەرگی ١/ ل/٥٦. -المترجم-

إِلَّا شِفَاؤُكَ شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا .(الحديث ٥٦٧٥ اطرافه في: ٥٧٤٣، ٥٧٤٤، ٥٧٥٠)[١٨٦٩].

عائيشه -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وابوو، کاتێ دەچوو بۆلای نەخۆشێ، یا فەرمووی کاتێ نەخۆشێکیان دەهێنا بۆ لای ئاوا نزای چاکبوونەوەی بۆی دەکرد دەیفەرموو: (أَذْهِبِ الْبَاسَ رَبَّ النَّاسِ اشْفِ وَأَنْتَ الشَّافِي لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا: ئەی خودای من! ئەی پەروەردگاری هەرچی ئادەمیزادە، ئەی لابەری ئێشو ئازار! شیفای بدەو خۆشو چاکی بکەرەوە، شیفادەری بەراستی هەرخۆتیتو خۆشبوونەوە هەربەدەستی تۆیە، بێجگە لەتۆ شیفادەری تر نییە، ئەگەر خواستی تۆی لەسەر نەبێ دەرمانو نووشتە پارەناکا، شیفایەکی تەواوی وا کەهیچ دەردێ نەهێڵێ!). (تاج/٤ ز/٧٤ ل/٢١٦).

[١٨٦٩] اخرجه مسلم في السلام، باب: استحباب رقية المريض، رقم: ٢١٩١.

# پـايـانىٚ - الخَاتِمَةُ

پێشەوای عەسقەلانی –ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: نامەی نەخۆشەکان چل‌و هەشت فەرموودەی بەرزی واتیادا، حەوتیان هەڵسپێراو (معلق)ن، ئەوانی تریان پەیوەستن، واتە: موصولن. سیی‌و چوار ڕێگەیان دووبارەن، پوختەکەیان: (٤٨ – ٣٤ = ١٤) چواردە فەرموودەیە، موسلیمیش وەك بوخاری ئەم پوختەیەی گێڕاوەتەوە جگە لەمانەیان.

١. ژمارە: ١٨٥٩ تجريد / ٥٦٤٥ فەتح = من يرد الله به خيرا يصب منه.

٢. حديث عطاء: إنه رأى أمّ زفر. انظر: الطريق الأخرى من رقم: ٥٦٥٢ فتح.

٣. رقم: ١٨٦٣ تجريد = ٥٦٥٣ = حديث أنس في الحبيبتين، ژمارە: ١٨٦٥ ت=٥٦٦٦ ف=حديث عائشة: وأرساه هەروا دەفەرموێ: چەند بيستراو –اثرێکی صەحابيشی واتيادا.

روونكردنەوە:

لەم فەرمووده پیرۆزەدا حەقیقەتێکی پزیشکی واتیادا، کەئەویش ئەوەیە، خـوای گـەورە هـەنگوینو نەشـتەرگەری و داخکردنـی کـردووە بـەهۆی چاکبوونەوەی نەخۆشـیو درەدی زۆر. ئێـستا هـەنگوین بەرێژەیـەکی دیـاری کـراوی جیاجیـا، لـە زۆرینـەی دەرمانـە نـوێ سـەردەمی‌یەکاندا هەیـە، وە نەشتەرگەری و کردەوە نەشتەرگەییەکان، کەناسراون بە عەمەلیاتی جیراحی، ئەوەندە زۆربوون لەڕادەبەدەرن، بگرە شێوەکارە کۆنـەکان والـە بیردەچـنەوە، وەك کەڵەشاخ گرتنو خوێن بەدانو زالوگرتن، وەداخ کردنیش ئێـستا گەشـەی کردووە، وە بـووە بەهونـەرێکی گـەڵێ پێشکەوتووی سـەردەمی نـوێ، بەڕاسـتی ئێستا کـە زۆرینـەی راستیەکان بەئـەزموون و بەموشاهەدە چەسپاون، مـرۆڤ بەدڵنیاییـەوە دەتوانـێ بڵـێ: (ئـەوەی لـەم فەرموودەیـەدا ئامـاژەی بـۆکراوە راستیەکی پزیشکیو زانستییە چونکە: نەشتەرگەری و هەنگوین و داخ کردن، بەهەموو جۆرو شێوەکانیەوە رۆحو گیانی پزیشکی ئەمرۆن).

١٨٧٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: أَخِي يَشْتَكِي بَطْنَهُ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلًا ثُمَّ أَتَى الثَّانِيَةَ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلًا ثُمَّ أَتَـاهُ الثَّالِثَةَ فَقَالَ: اسْقِهِ عَسَلًا ثُمَّ أَتَاهُ فَقَالَ: قَدْ فَعَلْتُ؟ فَقَالَ: صَـدَقَ اللَّـهُ وَكَـذَبَ بَطْـنُ أَخِيكَ اسْقِهِ عَسَلًا فَسَقَاهُ فَبَرَأَ.(الحديث ٥٦٨٤ طرفه في: ٥٧١٦)[١٨٧٢].

ئـەبو سەعیدی خـودری -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: پیاوێ هاتـە لای پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- گـوتی: برایـەکم هەیـە سـکی دێـشێ؟ فـەرمووی: هـەنگوینی بـدەرێ، بـۆ جـاری دووهـەم هاتـەوە خزمـەتیو دیسان فەرموویـەوە: هـەنگوینی بـدەرێ، بۆجـاری سێهەم هاتـەوە خزمـەتی: دیسان فەرموویـەوە: هـەنگوینی بـدەرێ، بۆجـاری چـوارەم هاتـەوە گـوتی: قوربـان!

---

[١٨٧٢] اخرجه مسلم في السلام، باب: التداوي بسقي العسل رقم: ٢٢١٧.

هـەنگوینی دەدەمـێ، کەچـی زیـاتر ڕەوانـی دەکـا؟ فـەرمووی: -دروودی خـوای لەسەر بێ-: خودا لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (فِهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ - لەهـەنگوینا شیفاو دەرمان هەیە. کەواتە: ئەم فەرمایشتەی خودا ڕاسـتە بـەڵام ئـەوەی کـە تـۆ هـەنگوین دەدەی بەبراکـەت و سـکی چـاك نابـێ، سـکی براکـەت درۆدەکـا، دیـسان هـەنگوینی پـێ بـدە، جـا هـەنگوینی جارێ تـر دەداتـێ، وەسـکی چـاك دەبێ). (تاج/٤ ل/١٩٥ ژ/٣).

١٨٧٣- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنها أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَقُولُ: إِنَّ هَذِهِ الْحَبَّةَ السَّوْدَاءَ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا مِنَ السَّامِ. قُلْـتُ: وَمَـا الـسَّامُ؟ قَالَ: الْمَوْتُ.(الحديث ٥٦٨٧)[١٨٧٣].

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لەپێغەمەر -درووودی خـوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (ڕەشکە دەرمانی هەموو دەردێکە، مەرگی لێ دەرچێ). عەرزم کرد: مەبەست لەمەرگ چیە؟ فەرمووی: مەبەست لەمەرگ مردنـە). (تاج/٤ ز/٦٢ ل/٢٠٠ ژ/١ ش/ت).

١٨٧٤- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَـلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْدِيِّ فَإِنَّ فِيهِ سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ يُسْتَعَطُ بِهِ مِنَ الْعُذْرَةِ وَيُلَدُّ بِهِ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ. وَدَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِابْنٍ لِي لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ فَبَالَ عَلَيْهِ فَـدَعَا بِمَـاءٍ فَـرَشَّ عَلَيْـهِ.(الحـديث ٥٦٩٢ أطرافـه في: ٥٧١٣، ٥٧١٥، ٥٧١٨، و الحديث ٥٦٩٣ طرفه في: ٢٢٣)[١٨٧٤].

ئوم قەیسی کچی میحصەن -ڕەزای خـوای لێ بـێ- دەفـەرموێ: لەپێغەمـەرم بیـست، دەیفـەرموو: عـوودی هینـدی بـەکاربهێنن، چـونکە حـەوت دەرمـانی پێوەهەیە، بەم شێوەیە بـەکاردەهێنرێ: دەیکوتن و بـەڕۆن زەیتوونـەوە، یـان

---

[١٨٧٣] و اخرجه مسلم في الطب، (العيني/٢١ ص/٢٣٩). -المترجم-

[١٨٧٤] اخرجه مسلم في السلام، باب: التداوي بالعود الهندي.. رقم: ٢٢١٤.

ڕۆنەکەی دەگرن بۆ دوومەڵی مەلاشووی منداڵ دەیتکێننە کونە لووتی، وە ڕۆنەکەشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە، لەگێڕانەوەیەکدا: کوڕێکی خۆمم پێبوو، دوومەڵ لەناو قوڕگی هاتبوو، بەزەبری پەنجە دوومەڵەکەم تەقاند، کە چوومە خزمەتی حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (بۆچی بەزەبری پەنجە دوومەڵی گەرووی منداڵتان دەتەقێنن و ئازارێکی زۆریان ئەدەن، بەڵکوو لەباتی ئەوە بەعودی هیندی دەرمانی بکەن، ئەم عوودی هیندییە، کە بەکوردی پێی دەگوترێ: دارەهیندی، دەرمانی حەوت دەردی واپێوە، بۆ دومەڵی گەرووی منداڵ، دەیتکێننە ناو کونەلووتی، وە ئاوەکەیشی بۆ نەخۆشی پاڵوو دەخورێتەوە). (تاج/٤ ل/٢٠٢ ز/٦٣).

لەگێڕانەوەیەکی ئێرەدا دەفەرموێ: چووم بۆ خزمەتی پێغەمەر درودی کوڕێکی ساوای خۆمم پێ بوو، نانە خۆرە نەبوو بوو، میزی کرد بەجلەکانیدا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- داوای ئاوی کردو لێی پرژاندو ئیتر نەیشۆرد).

عودی هیندی واتە: قوسط، بۆ واتای ئەم وشەیە بڕوانە: ژمارە: ٢٠٥ تەجرید = ٣١٣ فەتح = بەرگی/١ ل/٢١٤ + ژ/١٦٢ تجرید = ٢٢٣ - بەرگی/١ ل/١٨٣.

١٨٧٥- عَنْ أَنَسٍ رَضِي اللَّه عَنْه أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَجْرِ الْحَجَّامِ فَقَالَ احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ وَأَعْطَاهُ صَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَكَلَّمَ مَوَالِيَهُ فَخَفَّفُوا عَنْهُ وَقَالَ: إِنَّ أَمْثَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ وَالْقُسْطُ الْبَحْرِيُّ وَقَالَ: لَا تُعَذِّبُوا صِبْيَانَكُمْ بِالْغَمْزِ مِنَ الْعُذْرَةِ وَعَلَيْكُمْ بِالْقُسْطِ.(الحديث ٥٦٩٦ طرفه في: رقم: ٩٥٣ تجريد = ٢١٠٢ فتح الباري = بەرگی/٣ ل/٢٧)[١٨٧٥].

---

[١٨٧٥] و الحديث من أفراده (العيني/٢١ ص/٢٤١). -المترجم-

پرسیارکرا لەئیمامی ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ-: ئایا کرێی کەڵەشاخگر حەڵاڵە یا چییە؟ فەرمووی: (کرێی کەڵەشاخ گر دروستە، چونکە ئەبو طەیبە کەڵەشاخی گرت لەپێغەمەر -درودی خوای لەسەر بێ- جا حەزرەت -درودی خوای لەسەر بێ- لەباتی ئەوە دوومەن خۆراکی پێیدا، وە قسەی لەگەڵ ئاغا ئازادکەرەکانی کرد، لەبارەی پارمەتی دانیەوە، چونکە ئەم خزمەتە باشەی پێشکەش بە پێغەمەری خودا کردووە، ئەوانیش ئەوسەرانەی کەدایان نابوو لەسەری بەرامبەر بەئازادکردنی بۆیان کەم کردەوە).

وە خۆشەویست -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (بەڕاستی باشترین نموونە بۆ دەرمانی باش، بۆ ئێوەی دانیشتووانی گەرمیان کەڵەشاخ گرتنە، وە هەروەها عوودی دەریایی، کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ: قوسطی بەحری). وە هەروەها حەزرەت -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (منالْتان ئەگەر تووشی دوومەڵی گەروو بوو، یا ئالووی کەوت، بەگوشینی پەنجە ئازاریان مەدەن، بەڵکوو لەباتی ئەوە بەعوودی هیندی واتە: بە قوسط دەرمانی بکەن.
(بڕ: تاج/٢ /٢٩٩ + ژ/١٨٧٤ + تاج/٤ ل/٢٠١ ژ/١).

ڕوونکردنەوە:

ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. کەڵەشاخ گرتنو خوێن بەردانو خۆ داخکردن و زالوو بەکارهێنان، لەشەرعا ڕێگەیان پێ دراوە، وەهەتا ئێستاش نیازمەندان بەکاریان دەهێنن، وە سودیان لێ وەردەگرن، وە پزیشکی و دوکتۆریش ڕێگەی شتی وا دەدا.

٢. هەرکاتێ باشتر هەبوو، کاربەو بکرێ نەوەك کار بە باش بکرێ. وەك لەم فەرموودەدا دەردەکەوێ: کە عەرەبەکان بە ئەزموون لەکۆنا، دوومەڵی گەروو، وە یائالوو کەوتنیان، بەگوشینی سەری پەنجەو بەتەقاندن دەرمانو چارەسەر کردووە، بەلام ئەوەتا پێغەمەر -درودی خوای لەسەربێ- دەفەرموێ:

لەوە باشتر هەیە، ئەوە دەبێ بەهۆی ئازار، تیمارکردنی ئەوجۆرە نەخۆشییانە بەدارە هیندی بکرێ بۆ ئێشترو باشترە. بڕوانە: ژمارە: ٩٤٧=بەرگی/٣ ل/٢٠.

٣. لەفەرموودەکەوە دەردەکەوێ کەکەڵەشاخ گرتن، لەوڵاتی گەرمیان بەسوودترە، هەتا کوێستان، هەروەها بۆلاو بەسوودترە هەتا بۆ پیر.

٤. وەکی تریش ئێستا هەموو شتێ گۆڕاوە، ومئەم ڕێنماییە پزیشکیانە، پەیوەندی بەعیباداتەوە نییە، لەبەرئەوە دەتوانرێ خۆ دەرمان کردنو خۆ چارەسەرکردن بەشێوەیەکی سەردەمانە بێت نەك بەم شێوانە.

١٨٧٦- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُما قَالَ قال: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: عُرِضَتْ عَلَيَّ الْأُمَمُ فَجَعَلَ النَّبِيُّ وَالنَّبِيَّانِ يَمُرُّونَ مَعَهُمُ الرَّهْطُ وَالنَّبِيُّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ حَتَّى رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ قُلْتُ: مَا هَذَا؟ أُمَّتِي هَذِهِ. قِيلَ: بَلْ هَذَا مُوسَى وَقَوْمُهُ قِيلَ: انْظُرْ إِلَى الْأُفُقِ فَإِذَا سَوَادٌ يَمْلَأُ الْأُفُقَ ثُمَّ قِيلَ لِي انْظُرْ هَا هُنَا وَهَا هُنَا فِي آفَاقِ السَّمَاءِ فَإِذَا سَوَادٌ قَدْ مَلَأَ الْأُفُقَ قِيلَ هَذِهِ أُمَّتُكَ وَيَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ هَؤُلَاءِ سَبْعُونَ أَلْفًا بِغَيْرِ حِسَابٍ ثُمَّ دَخَلَ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَهُمْ فَأَفَاضَ الْقَوْمُ وَقَالُوا: نَحْنُ الَّذِينَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاتَّبَعْنَا رَسُولَهُ فَنَحْنُ هُمْ أَوْ أَوْلَادُنَا الَّذِينَ وُلِدُوا فِي الْإِسْلَامِ فَإِنَّا وُلِدْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَبَلَغَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخَرَجَ فَقَالَ هُمُ الَّذِينَ لَا يَسْتَرْقُونَ وَلَا يَتَطَيَّرُونَ وَلَا يَكْتَوُونَ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ فَقَالَ عُكَاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ أَمِنْهُمْ أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: أَمِنْهُمْ أَنَا؟ قَالَ: سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ. (الحديث ٥٧٠٥ أطرافه في: ٣٤١٠، ٥٧٥٢، ٦٤٧٢، ٦٥٤١)[١٨٧٦].

ئیبنوعەباس -ڕەزای خودایان لێبێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- ڕۆژی لەماڵ دەرچوو هات بۆ ناو مان زفەرمووی: (لەخەوما نەتەوەکانم یەکە یەکە پێ نیشان دران و ڕانوێنران لەبەرچاوم. دیارە

[١٨٧٦] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: الدليل على دخول طوائف من المسلمين...رقم: ٢٢٠.

کەخەوی پێغەمەرانیش هەقەو راستەو دروستە، تەماشام کرد: پێغەمەری وا هەبوو، نزیکەی دەپیاوی لەگەڵ بوو، وە هەبوو دوو پیاوی لەگەڵدا بوو، وە پێغەمەری واهەبوو کەیەك پیاوی لەگەڵدابوو، وەهەموو گەلەکەیان بریتی بوون لەو چەند کەسە، یالەو دووپیاوە، یالەو تاقە زەلامە! هەتا پێغەمەری وا هەبوو کەتەشریفی بەبەردەمما ڕەت دەبوو، کەسی لەگەڵ نەبوو، چونکە لەدنیادا لەگەلەکەی کەس باوەڕی پێنەهێنابوو!

هەتا لەدوای ئەوان تارمایی‌و عەشاماتێکی زۆرم بینی، تا چاوبڕکا ئاسۆیان داگرتبوو، گوتم دەبێ ئەم گەلە زۆرە کێبێ، تۆ بڵێی گەلی ئیسلامی من بێ؟ دەی خوادا ئەوان بن. بەڵام پێم گوترا ئەمە مووساو گەلی مووسان. ئەنجا پێم گوترا: ئادەی تەماشای ئێرەوە بکە و چاوبگێڕە بە ئاسۆی ئاسمانا کاتێ تەماشام کرد تارمایی عەشاماتێکی زۆرم دی، هەتا چاو بڕکا ئاسۆی داپۆشی بوو، دیسان گوتیانەوە پێم: ئادەی تەماشای ئەم لاولای خۆشت بکە، جا دیسان کەتەماشام کرد تا چاوبڕکا بەراست و بەچەپا، بەهەر چوارلادا، تارمایی عەشاماتێی بێشمار ئاسۆی داگرتبوون پێم گوترا.. ئەمە هەمووی نەتەوە (ئوممەت)ی تۆن، لەمانە حەفتا هەزار کەسیان بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت).

جا لەپێش ئەوەدا کەپێغەمەر -درودی لەسەر- باسی ئەوحەفتا هەزار کەسەیان بۆ بکا، کەکێن‌و کێ نین و چ کارەن، خۆی رۆیشتەوە بۆماڵەوە، یارانیش بڵاوەیان لێکرد، وەلەناو خۆیانا کردیان بەمقۆمقۆ و گوتیان:

ببێ واتە: نەبێ ئەوانە ئێمەین، چونکە ئێمە بەردی بناغەی ئیسلاممان دامەزراند: بڕوامان هێنا بەخودا و پەیڕەوی پێغەمەرەکەیمان کرد، هەندێکی تریان گوتیان: ئێمە هەرچەند باوەڕمان هێناوە بەخوداو، بەپێغەمەری خودا، لەم ڕووەوە شایانی ئەوەین کەئێوە دەیڵێن، بەڵام لەبەر ئەوەی کەئێمە لەسەردەمی فرە خودایی (شرك) دا لەدایك بووین، ڕەنگ بێ لەبەرئەوە

ئەوانـــە ئێمـــە نـــەبین، بـــەڵكوو ئەوانـــە نەتـــەوەی ئێمـــە بـــن، كەیەكـــسەر لەئیسلامەتیدا لەدایك بوون. جاكاتی ئـەم وتووێـژە گەیـشتەوە بەپێغەمـەر – درودی لەسـەر- تەشـریفی هـات، فـەرمووی: (ئەوانـە كەسـانێكن لەنەتـەوەی ئیـسلام، كـە نووشـتەناكەن و نووقلانـەی خـراپ لێنـادەن و لەبـەر هەنـدێ نەخۆشی كەوا باوە خەڵكی تر هەندێ شوێنی تایبەتی خۆیـان بـەنیازی چارە سەرو دەرمان خۆیان داخ دەكەن، ئەوان ئەوەناكەن و خۆیـان لەبەرشتی واداخ ناكەن، بـەڵكو هەمیـشە بۆ جێبـەجێ بـوونی كـارو فرمانیـان پـشت بـەلوتفـو كەرەمو بەخششی خودا دەبەستن و بەس!).

جا عەككاشەی كوڕی میحصەن –رەزای خوای لێبێ- هەڵسا فەرمووی: ئەی پێغەمەری خودا! ئایا من لەم دەستەیەم یانـا؟ فـەرمووی: (بـەڵێ تـۆ لـەوانی) پیاوێكی تریش هەڵسا گـووتی: ئـەی پێغەمـەری خـودا! ئایـا مـن لـەوانم یانـا؟ فەرمووی: (وەكاشە دەست پێشكەش كەری لێكردی و ئـەو بـەهرە گەورەیـەی بۆخـۆی بـرد) (بـڕ: تـاج/٤ ز/٨٠ ل/٢٤٠ ز/١) + (ریـاض صـالحين/كـوردی/١ ز/١٠ ژ/٧٤ ل -٨٧- چاپی دووەم).

روونكردنەوە:

**یەكـــــەم**: وەك لەفـەرموودەی تـری زۆری صـەحیحەوە دەردەكـەوێ: كەنوشتەكردن بەئایەتەكانی قورئان و بەناوە جوانەكانی خوداو بە پاڕانەوەی ڕێكی شـەرع دروسـتە، یـاخۆ داخكـردن لەبەرهەنـدێ نەخۆشـی دروسـتە، وەك داخكردنـی لاجـانگی منـاڵ، بـەمووروو\ی ئـافیق، یـاداخكردنی دوگمـەی مەیاسیری و زۆر شـتی تـری لـەم بابەتـە، بڕوانـە: ژمـارە:١٠٠٦ تجریـد=٢٢٧٦ فەتحولباری=بەرگی/٣ ل-٨١ + تاج/٤ ز-٧٣ ل-٢١٣).

**دووەم**: عوككاشەی كـوڕی میحـصەن –رەزای خودای لێ بـێ- لەموسـوڵمانە پێـشینەكانە، پیـاوێكی زۆر جـوان بـوو، سوارچـاكی وەك خـۆی نـەبوو،

لەكۆچكارانە، ئامادەی جەنگی بەدرو جەنگەكانی تری پاشی بووە، پاڵەوانانە لەجەنگی بەدردا دەجەنگیٚ، شمشێرەكەی لەدەستیدا دەشكیٚ، چونكە زۆرینەی جەنگاوەرەكانی ئەو رۆژگارە زریەی ئاسنین و مەتاڵیان لەبەردابوو، كاتیٚ شمشێر بەتوندی بەری دەكەوت وەك بیكێشی بەئاسنو بەردا وابوو، جاپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- بڕەدارێكی قەوی دەداتیون پیٚی دەفەرمویٚ: (بەمە جەنگ بكە) ئیتر لەخواوە ئەو بڕەدارە دەبیٚ بەشمشێرێكی درێژی پشت ئەستووری سپی ئیتر وەكاشە شەڕی پیٚ دەكا هەتا خودا سەریان دەخات، لەوەدوایش ئەم شمشێرە لەلای وەكاشە دەمێنیٚ، هەتا لەشەڕی هەڵگەڕاوەكانا، كەناوداره بەحوروبی ریددە، لەبوزاخە، لەسەردەمی جێنشینی ئەبوبەكری صەدیقا بەدەستی تولەیحەی كوڕی خووەیلید كوژرا، ئەم تولەیحەیە ئەوكاتە لافی پێغەمەرێتی لیٚدەدا، بەڵام لەئەنجاما موسوڵمان بۆوە، وە موسوڵمانێكی دروستی لیٚدەرچوو، وەكاشە لەم شەڕەدا، لەگەل سابیتی كوڕی ئەقرەمدا، پێش فەرەوڵی ئیمامی خالیدی كوڕی وەلید بوون، تولەیحە و سەلەمەی برای هەر دووكیان كوشتن، لەشوێنیٚ كەناوی بوزاخە بوو، لەوڵاتی یەمامە، كەوا لەیەمەن. لەئیستیعابا دەڵیٚ: (كاتیٚ پێغەمەر - دروودی لەسەر- مەرگ بوو بەمیوانی عوكاشە، تەمەنی چلو چوار ساڵ بوو، ساڵیٚ لەوەدوا شەهیدكرا). لەساڵی دوازدەی كۆچیدا شەهید بووە، دیارە كە گۆڕەكەی لەودەفەرەیە، لەگەڵ گۆڕی شەهیدەكانی تری حوروبی ریددەدا،

لێرەدا شتیٚ هەیە شایانی روونكردنەوەیە، ئەویش ئەوەیە: كەلەزۆر شوێن خزنو گۆڕی پیرۆزو شەخس هەیە بەناوی (وەكاشە)وە، وەخەڵكی ئەو دەفەرە، بەتایبەتی ڕەشەخەڵك و خەڵكی عەوام، خاوەنی ئەوگۆڕو قسنانە بەم حەزرەتی عەكاشەیە دەزانن لەبەرئەوە زۆر بەچاوی رێزو خۆشەویستییەوە تەماشای شەخسی ناو ئەو گۆڕانە دەكەنو بەگەرمی

سەردانیان دەکەن، هەتا مەلاو زانایانیش بەشداری لەم هەستو سەردانانەدا دەکەن.

وەمن بەچاوی خۆم دوو مەرقەدم دیوە بەم ناوە، کەیەکێکیان وا لەقەراخ، وا لەنێوانی برایماوەو هەرگێنەدا، لەبەهارانا خەڵکێکی زۆر لەهەموو چینێ، لەژنو پیاو، لەگەورەو منداڵ، لەشێخو مەلاو ئۆمی، لەرۆژی چوارشەمەدا، لەم گوندانەوە، هەتا ئێستاش دێن بۆسەردانی ئەم وەکاشەیە، وەچەندین گۆڕی تری وەکاشە ناوی تریش لەشوێنیانی تریش هەیە. گۆڕێکی تریشم بەم ناوە لەناوچەی شوان، لەپارێزگای کەکوك دیوە، لەبەهارانا بەتایبەتی لەم گوندانەوە دێن بۆئەم وەکاشەی کەوا لەپاڵ هەرگێنەدا: لەتیمارو گەرمزیل و گڵەزمردەو قەڵاسوورەو سەرزەلو داریکەلی و تەنگی سەرو فیکە دمرەو برایماوە و هەرگێنەو کانی رۆشنایی و هاڵدەرە و چەندین گوندی تری ئەم دەڤەرەوە، سەرجەم خەڵکی ئەم گوندانە، بەخاو خێزانەوە، دەهاتن بۆسەردانی گۆڕی وەکاشەشە.

لەپاش مەراسیمی زیارەت، دەبوو بەسەیران، هەبوو هەڵ دەپەڕین، هەبوو نیشانیان دەنایەوە، ئیتر هەرکەسە بەجۆرێ تالەدوا نوێژی عەسر، دووبارە زیارەتیان دەکردەوە و ئەوجا بلاوەیان لێدەکرد. وەمن بەچاوی خۆم دیومە کەشێخ محمودی مەلیكو عائیشە خێزانی، لەگەڵ کۆمەڵێ چەکداری خۆیانا لەبەهارا، لەدرایکەلییەوە هاتبوون بۆ زیارەت و سەیران بۆ سەرئەم وەکاشەیە! ئامینە خانی سەرزە لیشیان لەگەڵدا بوو، کەژنێکی شاژنی خاوەن دیوەخان و هەڵوێستی مەردانەبوو لەزۆر کەسی خەڵکی برایماوە و خەڵکی سەرزەلو مەلاکانی ئەوناوچەیەم بیستووە: کە کۆمەڵێ پەیدا بوو بوون، دژایەتی گۆڕی پیاوچاکانیان دەکرد، ئەم جۆرە مەرقەدەپیرۆزەیان دەرووخان، وەنەیاندەهێشت خەڵك سەردانیان بکا، گوتیان: یەکی لەوکۆمەڵە ناوی بەکر بوو کوری مەلا رەئوفی هەرگێنەبوو، کەوالەپاڵ مەرقەدەکەدا، ئەو گۆڕی ئەم

وەكاشـەيەى تێـك داو، بـێ ڕێـزى پـێ كـرد، گوتيـان: سـاڵ وەرنەگـەڕا، كەبـەر موشەكێ كـەوت، يـەك پەنجـەيان بەئەنگوسـتيلەكەيەوە دۆزييـەوە، كەبـەهۆى ئەوپەنجەيەوە خوشكێكى ناسييەوە!!.

وەكاشـەكەى تـريش لەناوچـەى شـوان، حيزبـى بـەعس رووخانـدى، لەگـەل ئەوگونـدە كوردانـەى كەلەوچـەبوون، گوايـە موخـەريببين ئـەو مەرقـەدە بـۆ خۆيـان دەكـەن بەبنكـەو بارەگـا، ئەگـەر نـەروو خێنـرێ، وە حيزبـى بـەعس بەهـەزاران مزگـەوتو مەرقـەدى پياوچـاك و شـوێنى پيرۆزيـان لەكوردسـتان رووخانـــد، تەنانـــەت زۆر لەمـــەلاو زەيـــوانو خزمـــەتگوزارانى ئەوشـــوێنە پيرۆزانەشيان كوشت، لەهەمووى سەيرتر ئێستا كەسانێ هەن، بۆ ئـەو ڕژێمـە خوێنرێژو خوێنمژە دەگرينو خۆزگەى بۆدەخـوازن، بێگومـان كەچارەنووسـى ئەمانيش وەك چارەنووسى حيزبى بەعس دەبێ، ئەگـەر خـراپتريش نەبێكـە ئەويش هەموومان دەزانين كەچى بەسەرهات!. وە وەكوو بيـستوومە لەكەسـى متمانـەپێكراو، خزنـى وەكاشـە نـاوى تـريش هەيـە بەهـەمان نـاوو نيشان، وە ئەمانە هـەموويان گـۆڕى پيـاو باشـانن وە هيچيان گـۆڕى ئـەم وەكاشـەيە نـين كەلەم فەرموودەيەدا ناوى هەيە.

١٨٧٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ لَا عَدْوَى وَلَا طِيَرَةَ وَلَا هَامَـةَ وَلَـا صَـفَرَ وَفِـرَّ مِـنَ الْمَجْـذُومِ كَمَـا تَفِـرُّ مِـنَ الْأَسَـدِ.(الحـديث ٥٧٠٧، اطرافـه في: ٥٧١٧، ٥٧٥٧، ٥٧٧٠، ٥٧٧٣، ٥٧٧٥)[١٨٧٧].

ئـەبوهورەيرە –ڕەزاى خـواى لێ بـێ- لەخۆشەويـستەوە –دروودى خـواى لەسەر بێ- دەفەرموێ: (نە نەخۆشى تەنينەوە لەخۆيەوە هەيەو، نەنوقلانەى خـراپ هەيـەو، نـەپێ ڕەشـىو بـەدقوومى هەيـەو، نـە (هامـە) هەيـەو،

---

[١٨٧٧] أخرجه مسلم في السلام، باب: لاعدوى ولا طيرة ولا هامة ولا صفر ... رقم: ٢٢٢٠.

نەپاشخستنی مانگی موحەرەم هەیە بۆکاتی مانگی سەفەرو نەبەپێچەوانەوە مانگی سەفەر پێش بخرێ بۆ کاتی مانگی موحەرەم. لەگەڵ ئەوەیشە ئەمە واتای وانییەکە پارێز لەنەخۆشی نییە، بەڵکوو پارێزکردن لەپەتاو نەخۆشی کاری باش‌و دروستە، دەی کەواتە هەتا بۆت دەکرێ پارێز لەگول بکەو، لەبەری هەڵبێ هەروەك چۆن لەترسا لەبەر شێر هەڵ دێیت ئاوا!). (تاج/٤ ل-٢٣٠ ز-٧٦ ژ-٥+١+٢+٣+٤+٦).

پوختەی قسەی ساخ ئەمەیە: ئەفسانەی کۆنی سەردەمی نەزانی‌و شتی تری لەم بابەتە بێ بایەخە، هەموو شت لەبنەڕەتدا بەدەست خودا خۆیەتی، بەڵام بەپێی یاسای ئاسایی‌و، بەپێی حاڵ‌و عادەت‌و باوو بەراورد دەبێ بۆ ئیحتیات واتە: دووربینی خۆت لەدەردو نەخۆشی بپارێزی نەبادا تۆش تووش ببی، بەتایبەتی لەنەخۆشی خراپ وەکوو گول‌و گەڕی. ئەمە پوختەی فەرموودەی ئیمامی نەوەوییە، لەم شوێنەدا، پڕگۆڕی پیرۆزی لەنووری خودابێ. هامەش بەزۆر واتا هاتووە، هەموو واتاکانی قسە لەبەد قوومی و ئەفسانە گەری دەکا، کەشتی وا لەشەرعا بێ بایەخە (بڕ: تاج/٤ ل-٢٢٧ ز-٧٦).

١٨٧٧- مكرر- وَعَنْهُ رَضِيَ اللّٰه عَنْه في رِواية: قَالَ: فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَمَا بَالُ إِبِلِي تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَاءُ فَيَأْتِي الْبَعِيرُ الْأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ بَيْنَهَا فَيُجْرِبُهَا؟ فَقَالَ: فَمَنْ أَعْدَى الْأَوَّلَ. (الحديث ٥٧١٧، طرفه في: ٥٧٠٧)[(١٨٧٧-م)].

دیسان ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەگێڕانەوەیەکا، فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خودای لەسەربێ- فەرمووی: نەنەخۆشی تەنینەوە هەیەو، نەمانگی صەفەردەبێ بەمانگی موحەررەم و نەکوندە بوو بەدبوومە، عارەبێکی دەشتەکی گووتی: ئەی پێغەمەری خودا: وادەبێ کە وشترەکان لەناو

(١٨٧٧-م) قال في التاج الجامع للأول في أحاديث الرسول: رواه الشيخان. -المترجم-

لم دان، لەبەر گورج و گۆڵی و پاکیو پوختی دەڵێی ڕەوە ئاسکن، چ دەردو بەڵایان نییە، کەچی کە وشترێکی لاوەکی گەڕیان تێکلاو دەبێ هەموویان گەڕ دەکا ئەی ئەگەر نەخۆشی ناتەنێتەوە ئەوە بۆ وایە؟ فەرمووی: (ئەی باشە نەخۆشییەکە لەکێوە تەنییەوەو گەیشت بەیەکەم وشتر!!). (تاج/٤ ل-٢٢٩ ز-٧٦ ژ-٣).

١٨٧٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: أَذِنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الْأَنْصَارِ أَنْ يَرْقُوا مِنَ الْحُمَةِ وَالْأُذُنِ قَالَ أَنَسٌ كُوِيتُ مِنْ ذَاتِ الْجَنْبِ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَيٌّ وَشَهِدَنِي أَبُو طَلْحَةَ وَأَنَسُ بْنُ النَّضْرِ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ وَأَبُو طَلْحَةَ كَوَانِي. (الحديث ٥٧٢٠، ٥٧٢١)[١٨٧٨].

ئەنەس -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی لەسەر- ڕێگەی ماڵێکی ئەنصاریدا، کەناسراون بەئالی عەمری کوڕی حەزم، کەنزاو نوشتە و دەمبەستی مارو دووپشك و جڕوجانەوەری تری زەهردار و نوشتەی گوێ ئێشە بۆ خۆیانو بۆ خەڵکی تریش بکەن، ئەنەس دەیفەرموو: (نەخۆشی پاڵووم بوو کەبەعەرەبی پێی دەگووترێ -ذات الجنب- ئەبو طلحەی زڕبابم بەداخێکی تایبەتی، بۆ چارەی ئەم نەخۆشی پاڵووە بەدەستی خۆی داخی کردم، ئەو سەردەمە پێغەمبەر -دروودی لەسەر- لەژیانا بوو، ئەنەسی کوڕی نەزڕی مامەم و زەیدی کوڕی سابیتیش لەلام ئامادەبوون لەکاتی داخکردنەکەدا). (تاج/٤ ز-٧٣ ل-٢١٤ ژ-٢+٦+١+٣+ ز-٧٤ ل-٢١٦).

---

[١٨٧٨] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث: رخص لأهل بيت في الرقية (فتح/١١ ص/٤٢١ خاتمة كتاب الطب، ط.ج). -المترجم-

١٨٧٩- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ رَضِي اللّٰه عَنهمَا أنها كَانَتْ إِذَا أُتِيَتْ بِالْمَرْأَةِ قَدْ حُمَّتْ تَدْعُو لَهَا أَخَذَتِ الْمَاءَ فَصَبَّتْهُ بَيْنَهَا وَبَيْنَ جَيْبِهَا و قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنَا أَنْ نَبْرُدَهَا بِالْمَاءِ. (الحديث ٥٧٢٤)[١٨٧٩].

فاتیمەی کچی مونزیر -رەزای خوای لیٚ بیٚ- فەرمووی: دەستووری ئەسمای کچی ئەبوبەکر -ڕەزای خوای لیٚ بیٚ- وابوو کاتی ژنیٚکی تاداریان دەهیٚنا بۆلای، لەکاتی تالیٚ هاتنەکەدا، هەتا دۆعای بۆ بکا، دەچوو ئاوی دەهیٚناو، لەیاخەیەوە دەیکرد بەباخەڵیا بۆ سەرلەشی، وەدەیگوت: پیٚغەمەر -دروودی لەسەر- فەرمانی کردووە پیٚمان کەتادار بەئاو فیٚنك بکەینەوە!). (تاج/٤ ل/٢٠٥ ز/٦٦ ژ/٢).

١٨٨٠- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ. (الحديث ٥٧٣٢ طرفه في: رقم/١١٦٥ تجريد = ٢٨٣٠ فتح = بەرگی/٣ ل/٢٩٦)[١٨٨٠].

له ژماره: ١١٦٥ دا بەتەواوی رابوورد.

١٨٨١- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا قَالَتْ أَمَرَنِي رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ أَمَرَ أَنْ يُسْتَرْقَى مِنَ الْعَيْنِ. (الحديث ٥٧٣٨)[١٨٨١].

حەزرەتی عائیشە -ڕەزای خوای لیٚ بیٚ- فەرمووی: پیٚغەمەر -دروودی خوای لەسەر- فەرمانی پیٚم کردووە، یا فەرمووی فەرمانی بەموسوڵمانان کردووە، کە چاوەزار بکریٚ بۆ رزگاربوون لەچاوی پیس).

---

[١٨٧٩] اخرجه مسلم في السلام، باب: لكل داء دواء و استحباب التداوي. رقم: ٢٢١١.

[١٨٨٠] اخرجه مسلم في الإمارة، باب: بيان الشهداء، رقم:١٩١٦.

[١٨٨١] اخرجه مسلم في السلام، باب: استحباب الرقية من العين و النملة ..رقم: ٢١٩٥.

١٨٨٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى فِي بَيْتِهَا جَارِيَةً فِي وَجْهِهَا سَفْعَةٌ فَقَالَ اسْتَرْقُوا لَهَا فَإِنَّ بِهَا النَّظْرَةَ. (الحديث ٥٧٣٩)[١٨٨٢].

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمەر -دروودی خودا لەسەر پێغەمەرو ڕەزای خودا لەسەر هەموو هاوسەرەکانی- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی لەسەر- لەماڵی من بوو، کچۆڵەیەکی دی خەرکانە لەدەموچاوی هاتبوو، فەرمووی: (چاوەزاری بۆبکەن، ئەمە بووە بەچاوەوە). •تاج/٤ ز/٦٦ ل/٢٠٧ ژ/٦).

١٨٨٣- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: رَخَّصَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الرُّقْيَةَ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ. (الحديث ٥٧٤١)[١٨٨٣].

عائیشە -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی لەسەر- ڕێگەی داوە بە موسوڵمانان کە نوشتەو چاوەزار و دەمبەست بکەن بۆ هەموو جانەوەرێکی زەهردار، وەك مارو دووپشك و زەردەواڵەو هەموو چزوودار و زەهر دارێکی تر).

١٨٨٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّه عَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ لِلْمَرِيضِ بِسْمِ اللَّهِ تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا يُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا. (الحديث ٥٧٤٥ طرفه في: ٥٧٤٦)[١٨٨٤].

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ئەگەر کەسێ ئێشێ، ئازارێکی ببوایە، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر- ئەنگوشتی شایەتمانی بەتفی خۆی تەڕ دەکردو دەینایە سەرخاك و پەنجەی تۆزی خۆڵی پێوە دەلکا، ئەوجا پەنجەی بەخۆڵو تەڕاییەکەی دەمیەوە دەهێنا بەسەر شوێنی ئازارەکەدا و

[١٨٨٢] اخرجه مسلم في السلام، باب: استحباب الرقية من العين و النملة ... رقم: ٢١٩٧.

[١٨٨٣] اخرجه مسلم في السلام، باب: استحباب الرقية من العين و النملة.. رقم: ٢١٩٣.

[١٨٨٤] اخرجه مسلم في السلام، باب: استحباب الرقية من العين و النملة... رقم: ٢١٩٤.

لەوکاتەدا ئەم نزایەی دەخوێندو دەیفەرموو: (بسم الله، تربة أرضنا، بريقة بعضنا، يشفى سقيما بإذن ربنا: بە پیرۆزی ناوی خوای گەورە، دۆعات بۆدەکەم، ئەمە خاکی زەوی خۆمانە، لەگەڵ تەڕایی دەمی موسوڵمانێ لەخۆمان بەفەرمانی پەروەردگارمان، دەبێ بەچارەو دەرمان بۆ نەخۆشمان). (تاج/٤ ز/٧٤ ل/٢١٧ ژ/٤ ش/د/ت).

١٨٨٥- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَا طِيَرَةَ وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ قَالُوا وَمَا الْفَأْلُ قَالَ الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ.(الحديث ٥٧٥٤ طرفه في: ٥٧٥٥)[١٨٨٥].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: لەپێغەمەرم بیست دەیفەرموو: (نوقلانەی خراپ بایەخی نییە، باشترین نوقلانەیش نوخشە لێدانە). گوترا: ئەی پێغەمەری خودا! نوخشە لێدان وەکوو چی؟ فەرمووی: (وەك ئەوە دەتانەوێ کارێ بکەن، لەکاتی نیازی کردنەکەیا، وشەیەکی باش بەرگوێتان بکەوێ). (تاج/٤ ز/٧٨ ل/٢٣٢ ژ/١).

بۆ نموونە یەکی بچێ بۆ حەج، لەکاتی باسکردنی ئەم سەفەرەدا، بەرگوێی دەکەوێ، کەسێ ئەم ئایەتە دەخوێنێ: ﴿فقدِ استَمْسَكَ بالعُرْوَةِ الوُثقى﴾ ئەوە جۆرە نوقلانەیەکی باشە لەخوداوە، نیشانەی ئەوەیە کە حەجەکەی بەنسیب دەبێ، زۆرجار پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کاتێ ئەرکێکی دەسپارد بەکەسێ، ئەگەر ناوەکەی بەدڵی بوایە پێی خۆش بوو، ئەوەی بەنوخشەی باش لێدەدا، وە ئەگەر ناوەکەی بەدڵی نەبوایە پێی ناخۆش بوو، بەوێنە: ئەگەر سەرکارێکی دابنایە ناوی سەرکەوت بوایە پێی خۆش بوو، بەڵام ئەگەر ناوی ژێرکەوت بوایە پێی ناخۆش بوو.

---

[١٨٨٥] اخرجه مسلم في السلام، باب: الطيرة و انفال و مايكون فيه من الشؤم، رقم: ٢٢٢٣.

١٨٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى فِي امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ اقْتَتَلَتَا فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِحَجَرٍ فَأَصَابَ بَطْنَهَا وَهِيَ حَامِلٌ فَقَتَلَتْ وَلَدَهَا الَّذِي فِي بَطْنِهَا فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَضَى أَنَّ دِيَةَ مَا فِي بَطْنِهَا غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ فَقَالَ وَلِيُّ الْمَرْأَةِ الَّتِي غَرِمَتْ كَيْفَ أَغْرَمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ لَا شَرِبَ وَلَا أَكَلَ وَلَا نَطَقَ وَلَا اسْتَهَلَّ فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ.(الحديث ٥٧٥٨ أطرافه في: ٥٧٥٩، ٥٧٦٠، ٦٧٤٠، ٦٩٠٤، ٦٩٠٩، ٦٩١٠)[١٨٨٦].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: دوو ژنی هوزەیلی بوو شەڕیان، یەکێکیان بەردێکی گرتە ئەوی تریان و خۆیو سکەکەوی کوشت، جاکە بۆ داخوازیی و دادگایی، دادیان بردە لای پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بڕیاری دا: کە خوێنی سکەکەی دەکاتە سەرێ، ئیتر ئەو سەرە بەندەبێ، یا کەنیزەك بێ دەبێ، وە بڕیاریشی دا خوێنی ژنە کوژراوەکەو خوێنی سکەکەی لەسەر خوێنڕسانی ژنە تاوانبارەکەیە، نەك لەسەر ژنەکە خۆی. وەکەلەپووری ژنە کوژراوەکەیشیدا بەمناڵەکانیو بە خزمەکانی تری، جا حەمەلی کوڕەزای نابیغەی هوزەیلیش گوتی: ئەی پێغەمەری خوا؟ من چی ببژێرم ئەمە کەلەسکی دایکیدا کوژراوە، نە چەشکەی نانو ئاوی کردووە و نە ورتەی لەدەم دەرهاتووە و نەنقەی لێوە هاتووە، شتی وا خوێی نییە!.

پێغەمەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئەمە بەم قسە قوتانەیدا، وادەردەکەوێ کەلەدەستەی کوڵەنانیو کاهینانە!). (تاج/٣ ز/٨٤ ل/٢٢٠ ژ/٢).

پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەسەر باسەکەوە، کەباسی پزیشکییە، لەو رووەوەیە، کە کوڵەنانێتی و کەهانەش وەك سیحرو جادووبازی لەکاری

---

[١٨٨٦] اخرجه مسلم في القسامة، باب: دية الجنين و وجوب الدية في قتل الخطاء ..رقم:١٦٨١.

جنۆكـەو شـەياتينين، دەتـوانرێ لەڕێگـەی نـزاو نووشـتەكردن بەئايـەت‌و سوورەتەكانی قورئانەوە چارەسەر بكرێن، و ئەمانە نەخۆشی دەروونی يان لێ دەكەوێتەوە، وە بەپزيشكی گيانی (طبي روحي) چارەسەر دەكرێن.

١٨٨٧- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ قَدِمَ رَجُلَانِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَخَطَبَا فَعَجِبَ النَّاسُ لِبَيَانِهِمَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا أَوْ إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ.(الحديث ٥٧٦٧ طرفه في: ٥١٤٦).

عەبـدوڵلای كـوڕی عومـەر -ڕەزای خـوای لێ بـێ- دەفـەرموێ: لـەلای خۆرهـەڵاتی مەدينـەوە دووپيـاوی هۆشمەنـد هـاتن بـۆ خزمـەتی پێغەمـەر - دروودی خـوای لەسـەر بـێ- يـەكێكيان نـاوی زيبريقـان و ئـەوی تريـان نـاوی عەمری كوڕی ئەهتـەم بـوو، سـەرو وتاريـان دا، خەڵكەكە لەقسە نەستەقی‌و ڕەوانبێژی ئەوان واقـی وڕمـان‌و سەرسـام بـوون. پێغەمـەريش -دروودی خـوای لەسەر بێ- بەم بۆنەيـەوە فـەرمووی: (هەفتانـە كـەوا سەرسـام بـوون، چونكە هەنـدێ قـسەی جـوان‌و وتـاری ڕەوان دەق وەك سـيحرو جـادوو وان، گـوێگر دەحەپەسێن‌و سـەرنجی كێش دەكـەن بـۆلای خۆيـان). (تـاج/١٠ ز/٧٠ ل/١٧٤ ژ/١+٢).

١٨٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ.(الحديث ٥٧٧١ طرفه في: ٥٧٧٤)[١٨٨٨].

ئەبو هورەيرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەخۆشەويستەوە دەفەرموێ: (نـەخۆش نەكرێتـە ناوسـاخەوە، نـەبادا سـاخەكانيش نـەخۆش بكـەون‌و دەردەكـە لـە نەخۆشەكانەوە بتەنێتەوە بـۆ سـاخەكانيش). (تـاجی كـوردی/٤ ز/٧٦ ل/٢٢٩ ژ/٤).

---

[١٨٨٨] اخرجه مسلم في السلام، باب: لا عدوى و لا طيرة و لا هامة... رقم: ٢٢٢١.

١٨٨٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰه عَنه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فِيهِ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا وَمَنْ تَحَسَّى سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَسُمُّهُ فِي يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَجَأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا.(الحديث ٥٧٧٨، طرفه في: ٦٤٩ تجريد = ١٣٦٥ فتح الباري = بەرگی/٢ ل/٧٢) + (الحديث ٦٤٧ تجريد = ١٣٦٣ فتح = بەرگی/٢ ل/٧١)[١٨٨٩].

ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (کەسێ لەکێویکەوە، یاله بەرزاییەکەوە، بەنیازی خۆکوشتن، خۆی بەربداتەوەو خۆی بکوژێ، ئەوە کاتێ دەمرێ هەمیشە لەو کێوەوە خۆی هەڵ دەداتە خوارەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ، هەتا هەتایە ئەمە کارو پیشەیەتی و بە ئێجگاری لەئاگری دۆزەخا دەمێنێتەوە لەسەر ئەم حاڵە، وە کەسێ زەهر بخوا، یا بخواتەوەو بەزەهر خۆی بکوژێ ئەوە لەئاگری دۆزەخیشا، زەهرەکەی کە لەدونیادا خۆی پێکوشتووە، هەروا لەناودەستیاو پەیتا پەیتا دەیخوا، یا دەیخواتەوە و هەتا هەتایە بەئێجگاری لەئاگری دۆزەخ دا، دەبێ‌و هەمیشەیش ئەمە حاڵ‌و کارو پیشەی دەبێ).

(وەکەسێ بەپارچە ئاسنێ خۆی بکوژێ، وەك ئەوە بەخەنجەرێ یا بەکێردێ، یا بەدەمانچەیێ، بەقەستی خۆی بکوژێ، ئەوە لەئاگری دۆزەخیشا ئەو پارچە ئاسنە دەگرێ بەدەستیەوە و خۆش خۆش، بەردەوام دەیکا بەورگی خۆیا، ئیتر هەتا هەتایە لەئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوەو، ئەوە حاڵیەتی). (تاج/٣ ز/٨١ ل/٢٠٣ ژ/٧).

---

[١٨٨٩] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: غلظ تحريم قتل الانسن نفسه، ...رقم: ١٠٩.

**روونكردنەوە:**

مەبەست هەڕەشەكردنە لە خۆكوشتنن دەنا هەر كەسێ لەسەر باوەڕو ئیمان بمرێ، بەهیچ تاوانێ لەڕەحمەتی خوداو لەبەهەشت نائومێد نابێ. عەسقەلانی -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- ئاوا تەئویلی ئەم فەرموودەیە دەكا: (ئەمە سزای ئەوكەسانەیە كەئەم تاوانە گەورەیە ئەنجام دەدەن، مەگەر خودا بەمیهرەبانی خۆی چاو پۆشی لێ بكاو، لە دۆزەخی هەمیشەیی ڕزگاری بكاو بیباتە بەهەشتی بەرینی نەبڕاوە).

١٨٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ شِفَاءً وَفِي الْآخَرِ دَاءً.(الحديث سبق طرفه في: ١٣٣٤ تجريد= ٣٣٢٠ فتح= بەرگی/٣ ل/٤٥٩)[١٨٩٠]. واتەكەیشی لەوێ بەتەواوی ڕابورد، لێرە ووشەی (إناء = دەفرو قاپو حاجەت)ە و بەس. ئەویش ئەوە دەگەیەنێ لە باتی خواردنەوە هەموو شلەیێ، لەم ڕووەوە، با خواردنەوەش نەبێ، وەك شلەو شۆربا، بڕیاری ئاوو خواردنەوەی هەیە. واتە: ئێرە عام ترو گشتی ترە.

---

[١٨٩٠] راجع رقم: ١٣٣٤ تجريد = بەرگی/٣ ل/٤٥٩. -المترجم-

# پـايـانـێ - الخَـاتِمَةُ

مامۆستای عەسقەلانی -ڕەزاو -ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ- لێرەدا لەم پایانەدا دەفەرموێ: (نامەی پزیشکی) سەدو هەژدە فەرموودەی بەرز کراوەی تیادایە، هەژدە ڕێباز (طریق)یان بێڕشتەن (معلق)ن، ئەوانی تریان پەیوەست (موصول)ن.

هەشتاو پێنج ڕێبازیان دووبارەن، هەیانە لەم نامە خۆیدا دووبارە بوونەتەوە، هەیانە لەپێشتر دووبارە بوونەتەوە، پوختەکەیان: (١١٨ — ٨٥ = ٣٣) سیی و سێ فەرموودەن، پێشەوا موسلیم وەك پێشەوا بوخاری، -ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لەهەردووکیان بێ- ئەم پوختەیەی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەم هەشتەیان:

١. فەرموودەی ئەبوهورەیرە، ژمارە: ١٨٧٠ تەجرید = ٥٦٧٨ فەتح = في نزول الداء و الشفاء.
٢. ژمارە: ١٨٧١ تەجرید = ٥٦٨٠ فەتح = الشفاء في ثلاث.
٣. ژمارە: ١٨٧٣ تەجرید = ٥٦٨٧ فەتح = حدیث عائشة في الحبة السوداء.
٤. ژمارە: ١٨٧٧ تەجرید = ٥٧٠٧ فەتح الباری = حدیث أبي هريرة (فرَّ من المجزوم). لاحظ ما جاء في هامش هذا الرقم من إخراج مسلم له في باب السلام برقم/٢٢٢٠.
٥. ژمارە: ١٨٧٨ تەجرید = ٥٧٢٠ فەتح = حدیث أنس (رخص لأهل بیت في الرقیة).
٦. ژمارە: ١٨٧٨ کۆتاییەکەی = حدیث أنس (أن أبا طلحة كواه) = فەتح/٥٧٢١.
٧. حدیث عائشة في الصبر على الطاعون = ٥٧٣٤ فتح الباري.
٨. حدیث أنس: (اشف و أنت الشافي) = ٥٧٤٢ فتح.

هەروەها دەفەرموێ: شازدە بیستراو -أثر- یشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٨٠- نامەی جلو بەرگ ⋆ كتاب اللباس

نامەی جلو بەرگ لە تاجول ئوصولدا وا لەبەرگی چواردا، ل/٩٧ ز/٢٩ هەتا ل/١٥٤ ز/٤٩ + رياض/٢ ل/٢٧٣ ز/١١٧ هەتا ل/٢٩٦ ز/١٢٦.

١٨٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الْإِزَارِ فَفِي النَّارِ.(الحديث ٥٧٨٧)[1891].

ئەبو هورەيرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەويست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هەر جلو بەرگێ درێژييەكەی بكەوێتە خوار دوو قاپە ڕەقڵەی پياوەوە، ئەوە شوێنەكەی لەقيامەتا والەناو ئاگری دۆزەخا).
(رياض/٢ ل/٢٨٠ ژ/٧٩٣) + (تاج/٤ ز/٣٨ ل/١٢٧ ژ/) + (تجريد/٤ ل/٧٤ ژ/١٣٨٨ = ٥٧٩ فەتحولباری + ب/٤ ل/١٤١ ژ/١٤٥٣).

١٨٩٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّه عَنه قَالَ كَانَ أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَنْ يَلْبَسَهَا الْحِبَرَةُ.(الحديث ٥٨١٣ طرفه في: ٥٨١٢)[1892].

ئەنەسی كوڕی مالك -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: (پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەگشت جلو بەرگێ زياتر حەزی لە لەبەركردنی حيبەرەبوو). (تاج/٤ ل/١٠٥ ز/٣١ ش/ن).

---

[1891] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة: (ما أسفل من الكعبين...). (فتح/١١ ص/٦٠٢ ط.ج خاتمة كتاب اللباس) -المترجم-

[1892] اخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: فضل لباس ثياب الحبرة، رقم/٢٠٧٩.

حیبـەرە جۆرە قوماشـێکی نایـابی یەمەنیـیـە، ڕەنگبـێ جـۆرێ بـێ لـەو قوماشەی جاران پێیان دەگوت شیرداخ.

١٨٩٣- عَنِ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰه عَنهَا أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تُوُفِّيَ سُجِّيَ بِبُرْدٍ حِبَرَةٍ.(الحديث ٥٨١٤)[١٨٩٣].

عائیشه -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسـەر بێ- کاتێ مەرگ بـوو بـەمیوانی دایـان پۆشـی بەشـاڵی یـەمانی. (تـاج/٤ ز/٢٠٢ ل/٥٤٣ ژ/١ ش/د).

روونکردنەوە:

ئیمامی نەوەوی -ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: کاتـێ مـردوو گیانی دەردەچـێ واباشـە جلـەکانی لەبـەری دابکـەنرێ، هـەتا بـەهۆی ئـەو جلانـەوە ئەندامەکانی دەق نەگرێ، وە پاش ئەوە بەچەرخێ هـەموو لەشـی دابپۆشـرێ، هەتا شەرمگای دەرنەکەوێ، وەك لەم فەرموودەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە.

١٨٩٤- عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللّٰه عَنْه قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ وَهُوَ نَائِمٌ ثُمَّ أَتَيْتُهُ وَقَدِ اسْتَيْقَظَ فَقَالَ مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ قُلْتُ وَإِنْ زَنَى ....(الحديث ٥٨٢٧ طرفه في: رقم: ٥٩٨ تجريد = ١٢٣٧ فتح = بەرگی/٢ ل/٢١ + رقم/١٠٤٧ تجريد = ٢٣٨٨ فتح = بەرگی/٣ ل/١٤٠)[١٨٩٤].

لەم دوو شوێنە ئەم فەرموودەیـە بەتـەواوی ڕۆیـشت، لێـرەدا ئـەوەی هەیـە لەسەتا ئەبو زەڕە -ڕەزای خوای لێ بـێ- دەفـەرموێ: (چـووم بـۆلای پێغەمـەر -

---

[١٨٩٣] اخرجه مسلم في الجنائز، باب: تسجية الميت... رقم: ٩٤٢.

[١٨٩٤] سبق في رقم: ١٢٣٧، اخرجه مسلم في الإيمان، باب: من لايشرك بالله شيئا دخل الجنة، رقم: ٩٤.

دروودی خـوای لەسـەر بـێ- نوسـتبوو، بـەرگێکی سـپی لەبـەردابوو، لەپاشـا چوومەوە بۆ خزمەتی لەخەو هەڵسا بوو.....).

١٨٩٥- عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْحَرِيرِ إِلَّا هَكَذَا وَأَشَارَ بِإِصْبَعَيْهِ اللَّتَيْنِ تَلِيَانِ الْإِبْهَامَ قَالَ فِيمَا عَلِمْنَا أَنَّهُ يَعْنِي الْأَعْلَامَ.(الحديث ٥٨٢٨ أطرافه في: ٥٨٢٩، ٥٨٣٠، ٥٨٣٤، ٥٨٣٥)[١٨٩٥].

عومەر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەیی دەکرد، لەئاوریشم و لەبەرکردنی، مەگەر بۆ ئەمە. پێغەمـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بـەو دوو پەنجەیـەی کـەدێن بـەدوا پەنجەکەڵەی دا ئامـاژەی کرد. واتە: بەپەنجەی شایەتمان و بەپەنجـەی ناوەڕاست، ئاماژەی کـرد، واتـە: ئەگەر ئاوریشم بـۆ پـەراوێزو تـەطریـز و شـتی تـری وابـوو دروسـتە). (تـاج/٤ ل/٩٩ ژ/٥).

١٨٩٦- عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: مَـنْ لَـبِسَ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا فَلَنْ يَلْبَسَهُ فِي الْآخِرَةِ.(الحـديث ٥٨٣٤ أطرافـه في: ٥٨٢٨، ٥٨٢٩، ٥٨٣٠، ٥٨٣٥)[١٨٩٦].

عومەر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسـەر بێ- فەرمووی: (هەر پیاوێ لەموسـوڵمانان لـەم جیهانـەدا، ئاوریـشم لەبـەربکا، لەوجیهاندا لەبەهەشتا لەبەری ناکـا، واتـە: ناچێتە بەهەشـت چونکە بـەرگی بەهەشتیـیەکان ئاوریشمە). (تاج/٤ ز/٢٩ ل/٩٧ ژ/١).

---

[١٨٩٥] اخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: تحريم استعمال إناء الذهب ...رقم/٢٠٩٦.

[١٨٩٦] رواه الخمسة إلاّ أبا داود، (تاج/٤ ل/٩٧). -المترجم-

روونكردنەوە:

لەتاج دا دەفەرموێ: بوخاری و موسلیم و نەسائی ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، لەوەجهێکی ئەم فەرمودەیەدا، کەلە ئیمامی ئەنەسەوەیە، عەینی دەفەرموێ: (و الحدیث من أفرادهِ واتە: ئەم فەرموودەیە بوخاری بەتەنیا گێڕاویەتەوە، موسلیم نەیگێڕاوەتەوە). ئەم دوو فەرمایشتە بەدیمەن جیایە، دەگەڕێتەوە بۆ خاڵێکی گرنگ لە زانستی فەرموودەدا، کە ئەویش ئەم یاسا ناسراوەیە، لەناو فەرموودە شوناسەکاندا:-

(فەرموودە بەدوو شێوەی سەرەکی دابەش دەکرێ‌و هەربەشەی ناوێکی لێ دەنرێ:

**یەکەم**: بەناوی مخرجی یەکەمی، کە زۆرینەی کات یەکێکە لەسەحابەکانی پێغەمەر، وەك دەگوترێ: حەدیسی عومەر، حەدیسی عائیشە، حەدیسی زەید، حەدیسی ئەبو سەعید، بەناوی سەحابیەکەوە فەرموودەکە ناودەبرێ، جا ئەوەی کەلێرەدا، واتە: لە پەراوێزی فەرموودەکاندا، لەم کتێبەدا، لەتەخریجەکەدا دەفەرموێ: (أخرجە مسلم) مەبەست ئەم جۆرەیە، واتە: ئیمامی موسلیم هەمان فەرموودەی لەهەمان صەحابەوە بەسەنەدی خۆی دەرهێناوە، بەلام مەرج نییە سەنەدو مەتن ئەمیش بەهەمان لەفظ و بەهەمان دەق‌و مەتن‌و بەهەمان سەنەدی بوخاری بێ، بەڵکو وادەبێ ڕشتەو دەقی فەرموودەکە لەلای هەردوو ئیمام یەك شتە بەبێ زیادو کەم، جاری وایش دەبێ هەم لەڕشتەکەدا، هەم لەدەقەکەدا جیاوازی هەیە، بگرە زۆر جار جیاوازی زۆریش هەیە، بەلام چونکە مخرجی حەدیسەکە و تەوەرەی حەدیسەکە یەك شتن دادەنرێ بە متفق علیە، تەنانەت ڕێ دەکەوێ ئیمامی موسلیم، لەیەکێ لە گێڕانەوەکانی خۆیدا بۆ فەرموودەکە، پار چەیێ لەدەقی فەرموودەکە، نەقڵ دەکا، وە هەموو فەرموودەکە لەشوێنێ تر نەقڵ دەکا، وە ئیمامی بوخاریش هەروا: لەهەندێ ریوایەتی خۆیدا پارچەیێ لەفەرموودەکە

نـەقڵ دەکـا، کـە ئەوپارچـەیە لەوفەرموودەیـەدا تایبەتـە بـە خۆیـەوە، لەفەرموودەکەی ئیمامی موسلیمدا ئەو پارچەیە یا ئەو زیادەیە نییـە، لەبـەر ئـەوە خوێنـەر سـەری لێ تێـك دەچـێ، دەڵـێ: کـەی ئـەم دوو حەدیـسەیە لەموتەفقو عەلەیهن. جا بۆ روونکردنەوەی تەواوی ئەم باسە عەرزتان دەکەم، ئیمامی موسلیم فەرموودەی ژمارە: ١٨٩٤ تەجرید، بەم سەنەدە ئیخراج دەکا:

١. زوهەریری کوڕی حەرب و ئەحمـەدی کوڕی خـیراش، هـەردوو شـێخی موسلیمن.

٢. عەبدولصەمەدی کوڕی عەبدولواریث.

٣. لە عەبدولواریثی باوکی عەبدول صەمەدەوە.

٤. حوسەینی موعەللیم.

٥. ئیبنو بورەیدە.

٦. یەحیای کوڕی یەعمەر.

٧. ئەبولئەسوەدی دیلی.

٨. ئەبو زەڕ.

بەڵام ئیمامی بوخاری بەسەنەدو مەتنی خۆی ئاوا دەیگێڕێتەوە:

١. ئەبو مەعمەر (شێخ = مامۆستا) ی بوخاری.

٢. عەبدولواریث.

٣. حوسەینی موعەللیم.

٤. عەبدوڵلای بورەید.

٥. یەحیای کوڕی یەعمەر.

٦. ئەبولئەسوەدی دیلی – دوئەلی

٧. ئەبو زەڕ

لەگێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیەدا، سەنەد ـڕشتەی- موسلیم ئاوایە:

١. محمدی کوڕی موثەننا.

٢. محمدی کوڕی جەعفەر

٣. شوعبە.

٤. و اصیلی ئەحدەب

٥. مەعروور

٦. ئەبوزەڕ.

**یەکەم**: دیارە کەئەم ڕشتانە جیاوازی زۆریان هەیە، بەڵام هەموویان سەر ڕشتەکەیان دەچێتەوە سەر ئەبوزەڕ، ئەلغەفاری، مەتنی ڕیواتەکانیش جیاوازی زۆریان هەیە.

**دووەم**: فەرموودەکە تەوەرە و بابەتەکەو واتاکەی یەکە، یا زۆر لەیەکەوە نزیکە، بەڵام لەچەند سەحابەیەکەوە ئیخراج کراوە، وەك فەرموودەی ژمارە:١٨٩٦ تەجرید، کە لەبوخاریدا لەچەند کەسێکەوە ریوایەت کراوە، ژمارە:٥٨٣٠ فەتح لە عومەرەوە، لەگەڵ تەرەفەکەی: ٥٨٢٨، ٥٨٢٩، ٥٨٣٤، ٥٨٣٥.

ژمارە: ٥٨٣٢ فەتح لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە.

ژمارە: ٥٨٣٣ فەتح مورسەلی ئیبنووزوبەیر.

جابەم جۆرە فەرموودەیە دەگوترێ: ریوایەت و موسلیم. جا ئەوەی کە لەتاجولئوصولا زۆر جار دەفەرموێ: بوخاری و موسلیم، ریوایەتیان کردووە، مەبەست هەردوو شێوەکەیە، جاری واهەیە بەشێوەی یەکەمە، کەپێی دەگوترێ متفق علیە جاری واهەیە بەشێوەی دووەمە، کە پێی دەگوترێ: ریوایەت بەمەهنا، چونکە ئالی هەردوو فەرموودەکە لەواتاو مەعنادا یەك دەگرێتەوە.

**سێیەم**: مامۆستای عەسقەلانی –رەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: لەبارترین فەرمایشت لەم لایەنەوە: (کەسزای ئەوکەسە لەقیامەتا ئەوەیە کەلەو نازو بەهرەیە بێبەش دەبێ، بەلام وادەبێ ئەم هەڕەشەیە نایەتەجێ، بەهۆی تۆبەوە، یا بەهۆی چاکەوە، یا بەهۆی شەفاعەتەوە یا بەهۆی پاڕانەوەی منالەوە بۆی). فەرمایشتی شێخی عەسقەلانی تەواو. لەڕاستیدا ئەم جۆرە هەڕەشانە هەموویان هەروان، مەرج نییە لەقیامەتدا دەقاو دەق جێبەجێ بکرێن، بەلام هەشیانە وەك خۆی جێبەجێ دەکرێ، ئەگەر کابرای گوناهبار هەتا مردن لەگومڕا هیدابێ و ئاوڕێ لەئایینو خواپەرستی و چاکە خوازی نەداتەوە.

**چوارەم**: (بڕوانە: تێبینی) کۆتایی پایانی پاش ژمارە: ١٩٦٣ تەجرید = بەرگی/٥ ل/٢٢٥).

١٨٩٧- عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنه قَالَ: نَهَانَا النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أنْ نَشْرَبَ فِي آنِيَةَ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ، وَأنْ نَأْكُلَ فِيهَا وَ عَنْ لُبْسِ الحرير و الديباج و أن نجلس عَلَيْهِ. (الحديث ٥٨٣٧ سبق طرفه في: رقم: ١٨١٣ تجريد = ٥٤٢٦ فتح = بەرگی/٥ ل/٨٥).[1897]:

(بڕ: تاج/ ٤ ل/٥٧ ز/٢٩ ز/٢٢) + (ریاض/٢ ل/٢٩٣ ز/٨٠٨)، فەرموودەکە لەوێ بەتەواوی رۆیشت، لێرە لە ئاخرەکەیەوە ئەمەی پترە: (لەسەر ئاورێشم دامەنیشن).

## جلو بەرگی زەعفەراناوی

١٨٩٨- عَنْ أنَسٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنه نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أنْ يَتَزَعْفَرَ الرَّجُلُ. (الحديث ٥٨٤٦)[1898].

---

[1897] أخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب تحريم استعمال إناء الذهب، رقم: ٢٠٦٧.

[1898] أخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: نهى الرجل عن التزعفر، رقم: ٢١٠١.

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگەی پیاوی نەئەدا، کەبەزەعفەران خۆی بۆنخۆش بکا، یا جلو لەشی خۆی پێ ڕەنگ بکا). (بڕ: تاج/٤ ل/١٤٣ ز/٤٤ ژ/٤).

ڕوونکردنەوە:

مەبەست لەم ئامازانە کەدەیکەین بۆ ئەطرافو گێڕانەوەکانی تری فەرموودەکانو بۆ شوێنی ئەم فەرموودانە، لەریاض الصالحین و لەتاج الأصول داو، لەسەر چاوەکانی تردا، کار ئاسانیيە بۆ پسپۆڕان و کەسانێ کە بیانەوێ، لەفەرموودەکان بەتەواوی حاڵی ببنو، بڕیارە شەرعییەکانیان لێ وەربگرنو، بەتایبەتی بۆ وەرگێڕانو وتار خوێنان و بەحس نووسانو لێکۆڵەرەوان، هەتا بتوانن بەئاسانی تەوفیق، یا جەمع، لەنێوانی گێڕانەوە جیاجیاکانا بکەن و بەهرەی تەواویان لێ وەربگرن. زۆر لەپسپۆڕان جەخت لەسەر ئەم لایەنە دەکەنو داوای لەبەندە دەکەن، دەڵێن: چونکە کارئاسانیيەکی زۆر باشی واتیادا، بەتایبەتی بۆ خوتبەو وتارو ئامۆژگاری و...تاد.

بۆنمونە: ئەوەتا بەپێی ئەم فەرموودەیەی ئێرە، بۆ پیاو، خۆڕەنگ کردنو خۆ بۆنخۆشکردن بە زەعفەران، کە گیایەکی بۆنخۆشە، گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی هەیە، ناباشە و نەیی لێ کراوە، کەچی بەپێی فەرموودەکەی تاجول ئوصوول پێغەمەر خۆی شتی وای کردووە، وە ئیبنو عومەر شتی وایکردووە. کەبەباشی لەبابەتەکە دەکۆڵینەوە دەبینین: هۆی ئەم هەمکە ڕاجیاییيە، لەم مەسەلەیەدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم گێڕانەوە جیاجیایانە، وەهەروەها لەشوێنەکانی تریشدا، وە لەڕاستیشدا ئەم ڕاو بۆچوونو بڕیارە جیاجیایانە بۆ مەردوم بوونە سەرچاوەی کارئاسانی و بارسووکی، وە بەپێی پێویستو بارودۆخ و شوێن و کەس، سوودو بەهرەیان لێ وەردەگیرێ. وەك دەگوترێ: (إختلاف ڕەحمەتە).

## باسی سۆل (نەعل)

١٨٩٩- وَ عَنْهُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنه أَنَّهُ سُئِلَ: أَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ؟ قَال: نَعَمْ.(الحديث ٥٨٥٠ سبق طرفه في: رقم: ٢٤٦ تجريد = ٣٨٧ فتح الباري = بەرگی/١ ل/٢٥٩)[١٨٩٩].

١٩٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰه عَنه أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ لِتَكُنِ الْيُمْنَى أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ.(الحديث ٥٨٥٥)[١٩٠٠].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: کاتێ کەپێلاو لە پێدەکەن، لەپێشا بیکەنە پێی ڕاستتان، لەکاتی داکەندنیشا، لەپێشدا پێی چەپتان دابکەنن، واتە: بەپێچەوانەی لەپێکردنەوە، باپێی ڕاست لەکاتی لەپێکردندا یەکەم بێو لەکاتی داکەندندا دووەم بێ. (تاج/٤ ل/١٢٠).

١٩٠١-و عَنْهُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنه أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا يَمْشِي أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ لِيُحْفِهِمَا جَمِيعًا أَوْ لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا.(الحديث ٥٨٥٦)[١٩٠١].

دیسان ئەبوهورەیرە دەفەرموێ: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: بەشێوەی گشتی بەیەك تاك پێلاوەوە مەڕۆن، یاهەردوو تاکەکان پێکەوە داکەنن و ئەوسا ئەگەر ناچار بوون بەپێی پەتی بڕۆن، یاهەردوو تاکەکان لەپێ بکەنو بەئاسایی بڕۆن. (تاج/٤ ل/١٢٠ ژ/٢ ز/٣٦) + (ریاض/٤ ل/٨٧ ز/٢٩٩ ژ/١٦٤٩، ١٦٥٠).

---

[١٨٩٩] اخرجه مسلم في المساجد ومواضع الصلاة.. رقم: ٥٥٥.

[١٩٠٠] اخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: إستحباب لبس النعل في اليمنى أولا ..رقم/ ٢٠٩٧.

[١٩٠١] اخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: استحباب لبس النعل في اليمنى أولا ..رقم: ٢٠٩٧.

روونكردنەوە:

مەبەستی سەرەكی لەم باسی سۆلە باسی پێلاوە بەگشتی، وە مەبەست لەم وردەكاریيانە لەم بابەتانەدا ئەوەیە: كە مرۆڤ بەشێوەی گشتی، بەپێی كاتو ساتو سەردەمی خۆی، موهەندەم بێو، لەجلو بەرگو شتیوادا رێكو پێك بێو، شرۆشێواو نەبێ. دەنا بەهیچ شێوەیێ مەبەست ئەوەنییە كەمرۆڤ لەكاروباری ئاسایی و عادەتیدا، وازلەباوو یاساو رێسای سەردەمو وولاتی خۆی بهێنێو، خۆی ببەستێتەوە بەعاداتو نەریتو دەستووری جلو بەرگو شتی تری وای سەردەمی پێغەمەرەوە. چونكە (عادات) جیایە لە (عبادات). جلو بەرگیش بەشێكە لەعادات.

## ئەنگوستیلە سوننەتە

١٩٠٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَقَالَ: إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ وَنَقَشْتُ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ فَلَا يَنْقُشَنَّ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ. (الحديث ٥٨٧٧ سبق طرفه في رقم:٥٨ = ٦٥ فتح = بەرگی/١ ل/٨٣)[١٩٠٢].

ئەنەسی كوڕی مالیك -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەنگوستیلەیەكی زیوینی دروست كرد، نەخشەكەی مۆری (محمد رَسُولُ اللّٰه) بوو. ئەوجا فەرمووی: (من ئەمووستیلەیەكی زیوینم لەلای وەستا بۆخۆم دروست كردووە، مۆری محمد رَسُولُ اللّٰه : موحەمەد پێغەمەری خودایەم لێ هەڵكەندووە، بەلام نابێ كەسی تر چاولەمن بكاو ئەم مۆرە لەئەموستیلەی خۆی هەڵبكەنێ). (تاج/٤ ل/١١٨ ژ/٥).

---

[١٩٠٢] اخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: لبس النبيُّ صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ ... رقم: ٢٠٩٢.

# ژنو پیاو لەجلو بەرگ و شتیوا دا حەرامە لاسکایی یەکتر بکەنەوە

١٩٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْه قَالَ: لَعَنَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُخَنَّثِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالْمُتَرَجِّلَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَقَالَ: أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ. قَالَ: فَأَخْرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فُلَانًا وَأَخْرَجَ عُمَرُ فُلَانًا.(الحديث ٥٨٨٦ طرفه في: ٥٨٨٥، ٦٨٣٤)[١٩٠٣].

ئیبنو عەباس -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەفرەتی کردووە لەپیاوی سەرژنانی و، لە ژنی کوڕانی، وە فەرمووی: (ئەم جۆرە کەسانە مەهێڵن بێنە ماڵتان، ئەگەر هاتیشنە ماڵتان دەریانکەن). گوتی: پێغەمەر خۆی فیسارە کەسی وەدەرنا، وە عومەریش فیسارەژنی وەدەرنا). (ریاض/٤ ل/٧٧ ژ/١٦٣١ ز/٢٩٢) + (تاج/٤ ل/١٥٠ ز/٤٧ ژ/١).

١٩٠٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهما عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ وَفِّرُوا اللِّحَى وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ.(الحديث ٥٨٩٢)[١٩٠٤].

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: بەپێچەوانەی بتپەرستانو فرە خواپەرستان بکەن، بەم ڕەنگە: ئێوە ریش تەواو بهێڵنەوە، سمێڵ تەواو کورت بکەنەوە). (تاج/٤ ل/١٣٧ ز/٤٢ ژ/٢ ش/د/ت/ن).

---

[١٩٠٣] قال الإمام النووي -رحمه الله- في رياض الصالحين: (رواه البخاري) يعني: (من افراده). -المترجم-

[١٩٠٤] أخرجه مسلم في الطهارة، باب: خصال الفطرة، رقم: ٢٥٩.

# قژو موو بۆیەو ڕەنککردن و هەندێ بابەتی تری لەم بابەتە

١٩٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ: النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ.(الحديث ٥٨٩٩ سبق طرفه في: ١٣٨٠ = ٣٤٦٢ فتحولباری = بەرگی/٤ ل/٦٥) + (ریاض/٤ ل/٧٩ ز/٢٩٣ ز/١٦٣٦/٣/)[١٩٠٥].

١٩٠٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْه قَال: كَانَ شَعَرُ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ رَجِلاً، لَيْسَ بِالسَّبِطِ، وَلاَ الجَعْدِ، بَيْنَ أُذُنَيْهِ و عَاتِقِهِ.(الحديث ٥٩٠٥ طرفه في: ٥٩٠٦)[١٩٠٦].

قەتادە -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: عەرزی ئەنەسی کوڕی مالیکم کرد: مووی پێغەمەر چۆن بوو؟ فەرمووی: قژە سەری کەمێ لوول بوو، نەزۆر کرژو نەزۆر خاو بوو، هەتا لای گوێچکەو ناو شانی دەهات). (تاج/٤ ل/٢٥٨ ز/٨٤ ژ/١+ بڕ: بەرگی:٤ ل/٢٤١ تەجریدی صەریح بەکوردی، بڕگەی: سێیەم).

١٩٠٧- عَنْ أَنَسٍ رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ضَخْمَ الْيَدَيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ حَسَنَ الْوَجْهِ لَمْ أَرَ بَعْدَهُ وَلَا قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَكَانَ بَسِطَ الْكَفَّيْنِ.(الحديث ٥٩٠٧ أطرافه في: ٥٩٠٨، ٥٩١٠، ٥٩١١)[١٩٠٧].

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەستو پێی قەوی بوون، رووی زۆر جوان بوو، لەجوانیو نازداریدا، نەلەوەو پاشو نەلەوەو پێش مانەندی ئەوم نەبینیوە، هەردوو لەپەکانی بەسروشت کراوە بوون).

---

[١٩٠٥] اخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: في مخالفة اليهود في الصبغ، رقم: ٢١٠٣.

[١٩٠٦] اخرجه مسلم في الفضائل، باب في صفة النبيُ و مبعثه، ....رقم: ٢٣٤٧.

[١٩٠٧] عدّهُ العينى طريقا آخر لحديث أنس السابق (العيني/٢٢ ص/٥٣). -المترجم-

١٩٠٨- عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنِ الْقَزَعِ قَالَ: الراوي: القَزَعُ، إذا حُلِقَ الصَّبِيُّ، وتُرِكَ هَاهُنَا شَعَرَةٌ، وَ هَاهُنَا، وَهَاهُنَا، فَأَشَارَ إِلَى نَاصِيَتِهِ وَجَانِبَيْ رَأْسِهِ.(الحديث ٥٩٢٠ طرفه في: ٥٩٢١)[١٩٠٨].

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: لەپێغەمەرم ژنەوت، نەهی دەکرد لەقوچکە تاش، گێڕەرەوە دەفەرموێ: کاتێ سەری منالّ دەتاشرێ، لەپێشە سەری و لەهەردوو لاجانگی، هەنێکی دەتاشرێ، و هەنێکی ناتاشرێ. (تاج/٤ ل/١٤١ ژ/٦) + (ریاض/٤ ل/٨١ ز/٢٩٥ ژ/١٦٣٨، ١٦٣٩).

روونکردنەوە:

مەبەست لەم فەرموودە پیرۆزەیە ئەوەیە کەموسوڵمان لەهەموو شتێکا ئاسایی بێ، شتێ کەلەگەڵ زەوقی سەلیم و سروشتی پاکی مرۆڤدا ڕێک نەکەوێ و دابنرێ بەڕیز پەرو یاساو ڕێسا بەزێن، لێی دووربێ و، پێشەنگ نەبێ لەداهێنانی خووی ناشیرین و ڕەفتاری ناهەموارا، دەنا بەهیچ شێوەیێ مەبەست ئەوە نییە کەچەشنە داب و نەریتی تایبەتی بەناوی ئایینەوە بسەپێنرێ بەسەر خەڵکەکەدا، عورفی صەحیح و خووی شیرینی ناو کۆمەڵ ئایین پەسەندی دەکا، ئیتر لەهەر وڵاتێ چی باوبێ، لەبارەی جل و بەرگ و قژ پەروەردەکردن و شتی واوە، شەرع ڕێگەی پێدەدا، بەمەرجێ دژی شەرعی خوداو سروشتی پاکی مرۆڤ نەبێ (مَارَآهُ الْمُسْلِمُونَ حَسَناً فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ: هەرچی موسوڵمانان بەجوانی بزانن لای خواش جوانە).

---

[١٩٠٨] أخرجه مسلم في اللباس و الزينة، باب: كراهة القزع، رقم: ٢١٢٠.

١٩٠٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰه عَنهَا قَالَتْ كُنتُ أُطَيِّبُ النبـي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ بِأَطْيَبِ مايَجِدُ، حَتَّى أَجِدُ وَبِيصَ الطِّيبِ فِي رَأْسِهِ وَ لِحْيَتِهِ.(الحديث ٥٩٢٣ سبق طرفه في: رقم: ١٨٩ تجريد = ٢٧١ فتح الباري = بەرگی/١ ل/٢٠٣)[1909].

عائیشەی هاوسەری پێغەمەر -دروودی خوا لەسەر پێغەمەرو ڕەزای خودای گەورە لەعائیشەی هاوسەری بێ- دەفەرموێ: بەدەستی خۆم بۆنی خۆشم دەدا لەپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- تەنانەت لەباشترین بۆنی خۆشم ئەدا لەسەرو لەڕیشی، هەروا لەبەرگو جەستەی، گەلێ جار ئەوەندە بەتۆخی لێم ئەدا، بریقەی بۆنەکەم ئەدی بەسەرو ریشیەوە (تاج/٤ ل/١٦٩ ز/٥١ ژ/٧ ش/د/ت/ن باسی بۆنی خۆش زۆر پەسەندە).

١٩١٠- عَنْ أَنَسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنه أَنَّ النَّبِيُّ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لَ يَـرُدُّ الطِّيبَ.(الحديث ٥٩٢٩ سبق طرفه في رقم: ١١٠٣ تجريد= ٥٨٢ فتح الباري = بەرگی/٣ ل/١٩٣).

١٩١١- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنهَا قَالَتْ طَيَّبْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ بِيَدِي بِذَرِيرَةٍ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ لِلْحِلِّ وَالْإِحْرَامِ.(الحديث ٥٩٣٠ سبق طرفه في رقم: ٧٣٩ تجريد = ١٥٣٩ فتح الباري = بەرگی/٢ ل/١٦٤).

عائیشه -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: لەحەجی ماڵاوایی‌دا بەدەستی خۆم، تۆزێ بۆنی زەریرەم ئەدا، لەجەستەی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کەجۆرە تۆزێکی بۆنخۆشی گیراوە بوو، لە هیندەوە دەهات، هەم بۆکاتی ئیحرام شکاندنی و هەم بۆکاتی ئیحرام دابەستنی). (تاج/٤ ل/١٦٨ ژ/٥ -ش).

---

[1909] أخرجه مسلم في الحج، باب: الطيب للمُحْرِم عند الإحرام ..رقم: ١١٩٠.

١٩١٢- عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِي اللَّه عَنهمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الَّذِينَ يَصْنَعُونَ هَذِهِ الصُّوَرَ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُقَالُ لَهُمْ أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ.(الحديث ٥٩٥١ طرفه في: ٧٥٥٨).

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئەوانەی کەئەم وێنانە دروست دەکەن، لەرۆژی قیامەتا لەسەر ئەو تاوانە سزاو ئازار ئەدرێن، وەبەتەوسەوە، بۆتەعجیزو دەسەوسانکردن پێیان دەگوترێ: ئادەی ئەگەر راست ئەکەن‌و درۆناکەن گیان بکەن بەبەر ئەم گیانلەبەرانەدا کەوێنەکاناتن دروست کردون. (بڕ: تاج/٤ ل/١٥٩ ز/٥٠ باسی وێنە نادروستەو مەنعی فریشتە ئەکا) + (ریاض/٤ ز/٣٠٥ ل/١٠٩ ژ/١/١٦٧٨).

١٩١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ قَال الله تعالى: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي فَلْيَخْلُقُوا حَبَّةً وَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً﴾ وَزَادَ فِي رِوَايَةٍ: فَلْيَخْلُقُوا شَعِيرَةً. (الحديث ٥٩٥٣ طرفه في: ٧٥٥٩).

ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: ژنەوتم لەپێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (خوای گەورە دەفەرموێ: دەبێ کێ لەوکەسە ستەمکارتربێ کەدەچێ دروستکراوێ دروست دەکا، وەك دروستکراوانی من، ئەگەر ئەوان ڕاست دەکەن‌و درۆناکەن فەرموون با میرووچەیێ دروست بکەن، یاگەردیلەیێ دروست بکەن، یا تۆمەیێ دروست بکەن، یادەنکە جۆیێ دروست بکەن). (تاج/٤ ل/١٦٠ ژ/٢ – ش. باسی وێنە نادروستو ناڕەوایە) + (ریاض/٤ ل/١٠٩ ز/٣٠٥ ژ/١٦٧٨ هەتا ژ/١٦٨٧).

# پـايـانـى - الخَـاتِمَةُ

مامۆستای گەورەو مەزن، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لەم پایانەدا دەفەرموێ: نامەی جلو بەرگ، دووسەدو بیست و دوو فەرموودەی بەرزەوە کراوی واتیادا، چلو شەشیان بێپڕشتن، یامانەندی بێپڕشتن، ئەوانی تریان هەموو پەیوەستن، واتە: موصولن. سەدو هەشتاو دوویان دووبارەن، پوختەکەیان (٢٢٢-١٨٢ = ٤٠) چل فەرموودەیە، پێشەوا موسلیمیش وەك پێشەوا بوخاری –ڕەزاو ڕەحمەتی خوادایان لێ بێ- ئەم پوختەیەی هەموو تەخریج کردووە، بێجگە لەمانەیان:

١- ژمارە: ١٨٩١ تجريد = ٥٧٨٧ فتح البارى = فەرموودەی ئەبوهورەیرە: ما أسفل من الكعبين مِنَ الإِزَارِ.

٢- ژمارە: ٥٨٣٩ فتح الباري = حديث الزبير في لبس الحرير. (راجع: رقم/١١٩٩ تجريد = ٢٩١٩ فتح الباري = بەرگی/٣ ل/٣٢٣ و هامشه الرقم/٢٥٤).

٣- ژمارە/٥٨٩٦ وطرفاه : ٥٨٩٧، ٥٨٩٨ = حديث أم سلمة في شَعَرِ النَّبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

٤- ژمارە/ ١٩١٠ تجريد = ٥٩٢٩ فتح البارى = حديث أنس كان لا يَرُدُّ الطِّيبَ.

٥- ژمارە/ ٥٩٣٣ فتح البارى = حديث أبي هريرة في لعن الواصِلَةِ.

٦- ژمارە/ ٥٩٤٦ فتح وطرفه في: ٥٩٣٧ = حديث أبي هريرة: لاتُشِمْنَ.

٧- ژمارە: ٥٩٥٢ فتح = حديث عائشة في نقض الصُّوَرِ.

٨- ژمارە: ٥٩٦٠ فتح = حديث ابن عمر في وَعْدِ جبريل، وَ طرفه في: ٣٢٢٧. بڕوانە: بەرگی/٤ ل/٣ ژ/٥: إِنَّا لا ندخل بيتا فيه صُورَةٌ وَلاَ كَلْبٌ. وقد اخرجه مسلم من حديث عائشة.

٩- حديث: صَاحِبُ الدَّابَّةِ أَحَقُّ بِصَدْرِ الدَّابَّةِ إِلاَّ أَنْ يَأْذَنَ لَهُ. يقع قبل رقم/ ٥٩٦٦ فتح مُبَاشَرَةً.

هەروا عەسقەلانی دەفەموێ: نۆزدە بیستراوی صەحابە و کەسانی دوائەوانی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٨١- نامەی ویڵە جوانەکان ⋆ کتاب الأدَبِ

## رەحمەتو چاکیو دڵسۆزی بۆ باوكو دایكو کەسوکار و سیلەی رەحم

١٩١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْه قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: أُمُّكَ قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ أُمُّكَ قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ أُمُّكَ قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ أَبُوكَ.(الحديث ٥٩٧١)[١٩١٤].

ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پیاوێ هات بۆ خزمەتی حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- عەرزی کرد: ئەی پێغەمەری خودا: کێ شایانترین کەسە کە بەجوانی هاوڕێتی بکەم؟ فەرمووی: (دایکت)، گوتی: ئەوجاکێ؟ فەرمووی: (دیسان هەر دایکت)، گوتیەوە: ئەوجا کێ؟ فەرموویەوە: (دیسان هەردایکت)، گوتی: ئەوجاکێ؟ فەرمووی: (ئەوجا باوکت). (ریاض/١ ل/٢٥٨ ژ/٣١٦ ز/٤٠ -ش).

١٩١٥- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّه عَنْهمَا قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّـهِ وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قَالَ: يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَا الرَّجُلِ فَيَسُبُّ أَبَاهُ وَيَسُبُّ أُمَّهُ فَيَسُبُّ. (الحديث ٥٩٧٣)[١٩١٥].

---

[١٩١٤] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: بر الوالدين وانهما احق به، رقم/٢٥٤٨.

[١٩١٥] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان الكبائر و اكبرها رقم/٩٠.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر -ڕەزای خوایان لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر - دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: تاوانێکی گەلێ گەورەیەو لە گوناهە هەرە گەورەکانە، کەپیاو جنێو بە باوك و دایکی خۆی بدات. یاران فەرموویان: ئەی پێغەمەری خودا: جا چۆن چۆنی پیاو جنێو بەباوك و دایکی خۆی ئەدا، بۆ هەیە کەشتی وا بکا؟ فەرمووی: ئا هەیە، بەم رەنگە دەچێ جنێو بە باوك و دایکی کابرایەکی تر دەداو، کا براکەیش جمێن بەباوك و دایکی ئەو دەداتەوە، ئاوا دەبێ بەهۆی ئەوە کەخەڵك جنێو بە باوك و دایکی بدەن. (ریاض/١ ل/٢٧٢ ز/٤١ ژ/٣٣٨).

١٩١٦- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لاَ يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ. (الحديث ٥٩٨٤)[1916].

جوبەریری کوڕی موطعیم -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر - دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئەوەی رشتەی خزمایەتی بپسێنێ و سیلەی رەحم ببڕێ دووپێی ناچێتە ناو بەهەشت. (ریاض/١ ل/٢٧٢ ژ/٣٣٩ ز/٤١ -ش- باسی ناڕەوایی دلڕەنجاندنی دایك و باوك ...).

١٩١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الرَّحِمَ شَجْنَةٌ مِنَ الرَّحْمَنِ فَقَالَ اللَّهُ: ﴿مَنْ وَصَلَكِ وَصَلْتُهُ وَمَنْ قَطَعَكِ قَطَعْتُهُ﴾. (الحديث ٥٩٨٩)[1917].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: رەحم و بەزەیی، رەگ و ریشەی دەچێتەوە سەر رەحمانی ناوی خودای میهرەبان، کە خاوەنی سۆزو بەزەیی یە، جا لەم دیدو

---

[1916] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: صلة الرحم و تحريم قطيعتها، رقم: ٢٥٥٦.

[1917] قال العيني: (الحديث من أفراده) ج/٢٢ ص/٩٣ . -المترجم-

روانگەیەوە خودای میهرەبان بەرەحم دەفەرموێ، کە پارچەیەکە، لەناوی رەحمانە خۆی: هەرکەسێ تۆ بەسەر بکاتەوە، منیش ئەو بەسەر دەکەمەوە، هەرکەسێکیش پەیوەندی لەگەڵ تۆ ئەی رەحم! ببڕێ منیش پەیوەندی لەگەڵ ئەو دەبڕم.

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئەم جۆرە فەرموودانە، لەسەرشێوەی مەجاز و نمایشو تەمسیلن، لە جۆری ئەو ئەمسالانەن، کە خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەیان بۆ دەکا، کە دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ﴾. مەبەستی سەرەکی لەم جۆرە دەربڕینو ئاخاوتنە دووپاتکردنەوەی بابەتەکەیە، کە پەیوەندیدارانی گرنگی پێبدەنو پشت گوێی نەخەن، هەتا پاداشتی گەورەی لای خوا دەردەست بکەن، دەنا بەپێچەوانەوە ئاو قەدی سزای سەختی لای خودا دەبن.

وەکی تریش پەیوەندی خزمایەتی و جێبەجێ کردنی سیلەی رەحم بەزۆر شێوە دەبێ، وەك بەهاموشۆکردنو بەیارمەتی سامانیو بە ئامۆژگاری خێرو بەهاوبەشی کردن لەشینو شادی یانا. (بڕ: ڕاڤەی ژمارە/١٦٩٨ تجريد = ٤٨٥٠ فەتح = بەرگی/٤ ل/٤٩٣).

١٩١٨- عَنْ عَمْرُ بْنِ العَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنه قَال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جِهَاراً غَيْرَ سِرٍّ، يَقُولُ: إِنَّ آلَ أَبِي لَيْسُوا بِأَوْلِيَائِي. إِنَّمَا وَلِيِّيَ اللهُ وَصَالِحُ الْمُؤمِنِينَ، وَلَكِنْ لَهُمْ رَحِمٌ أَبُلُّهَا بِبِلاَلِهَا. (الحديث ٥٩٩٠)[١٩١٨].

عەمری کوڕی عاص -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: بەگوێی خۆم بەئاشکرا بەدەنگی بەرز، نەك بەنهێنی و لەژێر لێوەوە، لەزاری پیرۆزی

---

[١٩١٨] أخرجه مسلم في الإيمان، باب: مُوَالاة المؤمنين و مقاطعة غيرهم و البراءة منهم، رقم/٢١٥.

پێغەمەرم بیست دەیفەرموو: خانەوادەی نەوەی فیسارەکەس سەروەرو پشتو پەنای من نین، سەروەرو خاوەنی من تەنیا خودایەو بەس، لەدوا خودا کەسو پشتو پەنای من هەموو موسوڵمانێکی خواناسی باشە، کەلەکاتی پێویست دا دەبن بەپارێزەرانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئەوەندە هەیە خزمو کەسوکارە ئەوان مافی خزمایەتیان لەسەرم هەیە، هەتا خۆم ماوم لە دنیادا، بەپێی شەرعی خودا، سیلەی رەحمیان بەجێ دەهێنم. (ریاض/١ ل/٢٦٥ ژ/٣٣٠ ز/٤٠- ش).

مەبەست لەم فەرموودەیە جەخت کردنە لەسەر ئەم سێ شتە:

١. پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- کەسایەتیەکی خێڵەکی نییە، کەبەکەسوکار و هۆزی خۆیەوە بنازێ.

٢. هەمیشە خودای گەورە پشتیوانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، وە بەپێی بەڵێنی خۆی: وَاللّٰهُ مُتِمُّ نُورِهِ لەکاتی پێویستدا پشتیوانی ئەم ئایینە پیرۆزە دەکا، هەروەها موسوڵمانان بەشێوەی گشتی.

٣. بەجێ هێنانی سیلەی رەحم رەفتارێکی بەرزی ئیسلامیە، وە پێغەمەر خۆی لەوبوارەدا سەرمەشق و پێشەوایە.

١٩١٩- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ وَلَكِنِ الْوَاصِلُ الَّذِي إِذَا قُطِعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا. (الحديث ٥٩٩١)[1919]:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئەوکەسە خزم دۆست نییە، کە بەدەستیاو خزم بەسەر دەکاتەوە، بەڵام خزم دۆست ئەوکەسەیە، کە

[1919] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عمر و (ليس الواصل بالمكافيء)، خاتمة كتاب الأدب، فتح/١٢ ص/٢٦٠. -المترجم-

خزمەکەی پەیوەندی لەگەڵیا دەبڕێ، بەڵام ئەو خزمایەتیەکە تازە دەکاتەوە.
(رياض/١ ل/٢٦١ ز/٤٠ ژ/٣٢٢).

١٩٢٠- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنها قَالَتْ: جَاءَ أَعْرابِيٌّ إِلَى النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: تُقَبِّلُونَ الصِّبْيَانَ؟ فَمَا نُقَبِلَهُمْ، فقالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَوَ أَمْلِكُ لَكَ أَنْ نَزَعَ اللهُ مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ. (الحديث٥٩٩٨)[١٩٢٠]:

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی هات بۆلای پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- عەرزی کرد: ئایا ئێوە منالانی خۆتان ماج دەکەن؟ ئێمە شتی واناکەین و منالی خۆمان ماج ناکەین!! پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرموو: جامن دەسەلاتی چیم هەیە بۆت؟ تۆیە کەخودا خۆی رەحمەتی لەدڵت سڕیوەتەوە، من دەسەلاتی چیم هەیە بۆت.

١٩٢١- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه: قَدِمَ عَلَى النبيّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْيٌ فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ السَّبْيِ قد تَحْلُبُ ثديَهَا تَسْعَى إِذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِي السَّبْيِ أَخَذَتْهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا وَأَرْضَعَتْهُ فَقَالَ: النبيّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتُرَوْنَ هَذِهِ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ قُلْنَا لَا وَهِيَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ لَا تَطْرَحَهُ، فَقَالَ: لَلّٰهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هَذِهِ بِوَلَدِهَا. (الحديث ٥٩٩٩)[١٩٢١]:

عومەری کوڕی خەتاب -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەغەزایەك هاتەوە، هێندێ ئافرەتی بەتالانی گیراوی هێنایەوە، ئافرەتێ لەدیلەکان منالْ بەبەر بوو، بەڵام منالەکەی لەولاتی خۆی لێ بەجێمابوو، زۆر هرۆیی منالەکەیی دەکرد، لەبەرئەوە هەردەسووڕایەوە

[١٩٢٠] أخرجه مسلم في الفضائل، باب: رحمته صَلَى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ الصبيان و العيال ...رقم/٢٣١٧.

[١٩٢١] أخرجه مسلم في التوبة، باب: في سعة رحمة الله تعالى و أنها سبقت غضبة، رقم/٢٧٥٤.

بەناو ژنە دیلەکاندا کە منالێکی کۆرپەی شیرە خۆری دەست دەکەوت لەجیاتی منالەکەی خۆی و لەحەیبەتی ئەو، ئەوساوایەی هەڵ دەگرت‌و دەینووساند بەسینگ‌و بەرۆکی خۆیەوەو مەمکی دەدایە. جا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئایا بەڕای ئێوە ئەم ئافرەتەی کە ئێستا ئاوا بەپەرۆشە بۆ منالەکەی، ئەگەر منالەکەی لەم کاتەدا دەست بکەوێتەوە، تووڕی دەداتە ناوئاگری سوورەوە؟. گوتمان نەبەخوا شتی واناکا، جا فەرمووی: دەسا بزانن کەخودای گەورە، بەبەندەکانی خۆی گەلێ بەڕەحمترە، هەتا ئەم ژنە بەمنالەکەی خۆی. (ریاض/٢ ل/٨ ز/٥١ ژ/٤١٨ ش-باسی ئومێد بەرەحمەتی خودا).

١٩٢٢- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ جَعَلَ اللَّهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ جُزْءًا وَأَنْزَلَ فِي الْأَرْضِ جُزْءًا وَاحِدًا فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ حَتَّى تَرْفَعَ الْفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ. (الحديث ٦٠٠٠ طرفه في: ٦٤٦٩)[١٩٢٢].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لە زاری پیرۆزی خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: خودای گەورە رەحمەت‌و سۆزو میهرەبانی خۆی دابەش کردووە بەسەد بەشەوە، نەوەدو نۆ شیانی لای خۆی هێشتۆتەوە، وە تاقەیەك بەشیانی ناردۆتە خوارەوە بۆ ناو زەوی، ئیتر ئەمەی کە دەیبینین مەخلووقات و دروستکراوانی خودا، لەناو خۆیانا رەحم بەیەکتری دەکەن‌و، بەزەییان بەیەکتریدا دێتەوە، ئەمە هەمووی لەوتاقە بەشەیە، تەنانەت ئەوەیشە کەوڵاخ سمی خۆی دەپارێزێ، نەبادا بەر بەچکەکەی بکەوێ، ئەومیش هەر لەو بەشەیە.

[١٩٢٢] اخرجه مسلم في التوبة، باب: في سعة رحمة الله تعالى و انها سبقت عضبه، رقم/٢٧٥٢.

لەگێڕانەوەیەکی ریاض الصالحین‌دا دەفەرموێ: خودا سەد رەحمەتی هەیە، یەك رەحمەتی لەوسەدە داناوە، لەناو پەری و جنۆکەو ئادەمیزاد و گیانلەبەران و جانەوەرو مارو مێروودا، ئیتر بەهۆی ئەم تاقە رەحمەتەوەیە، کەئەم شتانە لەناو خۆیاندا میهرو بەزەیی لەگەڵ یەکتر دەنوێنن و بەزەیی یان بەیەکتریدا دێتەوە، تەنانەت ئەوەیش کەدرندە بەزەیی‌بە بەچکەی خۆیدا دێتەوە، هەر بەهۆی ئەم تاقە رەحمەتەوە یە، بەڵام نەوەدو نۆ رەحمەتی تری هەیە، هەڵی گرتوون بۆ رۆژی قیامەت، لەو رۆژەدا بەورەحمانە رەحم دەکا بەبەندەکانی خۆی. (ریاض/٢ ل/٩ ز/٥١ ژ/٤٢٠ — ش).

١٩٢٣- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهمَا قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْخُذُنِي فَيُقْعِدُنِي عَلَى فَخِذِهِ وَيُقْعِدُ الْحَسَنَ عَلَى فَخِذِهِ الْأُخْرَى ثُمَّ يَضُمُّهُمَا ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ ارْحَمْهُمَا فَإِنِّي أَرْحَمُهُمَا. (الحديث ٦٠٠٣ سبق طرفه في: رقم/١٤٧١ تجريد = ٣٧٣٥ فتح الباري، و سبقت ترجمته هناك كاملة)[١٩٢٣].

١٩٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلَاةٍ وَقُمْنَا مَعَهُ فَقَالَ: أَعْرَابِيٌّ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا وَلَا تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا فَلَمَّا سَلَّمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لِلْأَعْرَابِيِّ لَقَدْ حَجَّرْتَ وَاسِعًا يُرِيدُ رَحْمَةَ اللَّهِ. (الحديث ٦٠١٠)[١٩٢٤].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە مزگەوت پێشنوێژی بۆمان دەکرد، عارەبێکی دەشتەکی لەپشتیەوە نوێژی دەکرد، لەناو نوێژەکەدا گوتی: خودایە: بەس رەحم بەمن‌و مەحەممەد بکە و رەحم بەکەسی تر مەکە لەگەڵمانا. پێغەمەر -دروودی

---

[١٩٢٣] سبقت ترجمته بالكامل في بەرگی/٤ ل/١٦١ ژ/١٤٧١.

[١٩٢٤] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي هريرة (قام اعرابي فقال: اللهم ارحمنا..) (خاتمة كتاب الأدب ج/١٢ ص/٢٦٠. -المترجم-

خـواى لەسـەر بـێ- كەسـلاوى نوێژەكـەى دايـەوە، بەعەرەبـە دەشـتەكيەكەى فەرموو: ئەى براله: رەحمەتى خودا گەلێ گەورەيە، هەموو شتێكى گرتۆتـەوە، تۆ بۆ وا تـەسك و بچووكى دەكەيتـەوە. (تـاج/۹ ل/٤٧ ز/١٤ ژ/٤ -ش/د/ت/ن - باسى غەيبەتى بەدكار دروستە).

۱۹۲٥- عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَال: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَرَى الْمُـؤْمِنِينَ فِـي تَـرَاحُمِهِمْ وَتَـوَادِّهِمْ وَتَعَـاطُفِهِمْ كَمَثَـلِ الْجَـسَدِ إِذَا اشْتَكَى عُضْوًا تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى. (الحديث ٦٠١١).[1925]:

نوعمـانى كـوڕى بەشـير -ڕەزاى خـواى لێ بـێ- دەفـەرموێ: خۆشەويـست - درودى خواى لەسەر بێ- دەفەرموێ: دەبـێ موسـوڵمانان لـەناو خۆيانـدا، وەك برا، تەباو دۆستو دڵسۆزى يەكترى بنو، لەگەڵ يەكترى بەرەحم و بە بەزەيى و ميهرەبان بن، نموونەى بالاو سەرمەشقێكى جوان بن، بۆ بەتەنگەوە بـوونى يەكترى، وەك چۆن جەستـەيەك ئەگەر ئەندامێكى بێتـە ژان، بەوێنـە چاوژان بكا، ئيتر هەموو گيانى وەك يەك دێنـەژانو، هـەموو ئەندامـەكانى تـرى شـەو نخوونـى لەگەڵ دەكێشن و، لـەتاوى ئـازارى ئـەو، ئـەوانيش تايـان لێ دێ، دەبـێ موسوڵمانانيش لەگەڵ يەكتريدا ئاوابن! (رياض/١ ل/٢٠٧ ز/٢٧ ژ/٢٢٤/٣).

۱۹۲٦- عن أنس بن مالك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللَّهم عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قال: ما من مسلم غرس غرسا فأكل منه إنسان أو دابة إلا كان له صدقة. (الحديث ٦٠١٢ سبق طرفـه و ترجمتـه في رقـم: ١٠١٩ تجريـد = ٢٣٢٠ فـتح البـاري = بەرگى/٣ ل/١٠٦)[1926]:

---

[1925] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: تراحم المؤمنين و تعاطفهم و تعاضدهم، رقم: ٢٥٨٦.

[1926] سبق في رقم: ١٠١٩ تجريد = بەرگى/٣ ل/١٠٦. -المترجم-

١٩٢٧- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: مَنْ لايَرْحَمُ لاَ يُرحَمُ. (الحديث ٦٠١٣ طرفه في: ٧٣٧٦)[١٩٢٧].

جەریری کوڕی عەبدوللا -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئەوەی رەحم بەکەس نەکا، ئەوە کەسیش رەحم بەوناکا.

## مافی دراوسێو ڕاسپێری باش دەربارەی

١٩٢٨- عَنْ عائيشة رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها عَنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: مَازَالَ جِبْرِيلُ يوصيني بِالجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ. (الحديث ٦٠١٤)[١٩٢٨].

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: هەمیشە جوبرائیل ئامۆژگاری خێری دەکردم دەربارەی دراوسێ، تەنانەت وامزانی کەهاوسێ میراتو کەلەپوور لەهاوسێ دەگرێ. (تاج/٩ ل/٢٤ ز/٧ ژ/٥ + ریاض/١ ل/٢٥٢ ز/٣٩ ژ/١/٣٠٣).

١٩٢٩- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: وَاللّٰهِ لَا يُؤْمِنُ، وَاللّٰهِ لَا يُؤْمِنُ، وَاللّٰهِ لَا يُؤْمِنُ، قِيلَ: وَمَنْ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: الَّذِي لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ. (الحديث ٦٠١٧ طرفه في: رقم/١٠٥٩ تجريد = ٢٥٦٦ فتح = ب/٣ ل/١٨٦)[١٩٢٩].

---

[١٩٢٧] اخرجه مسلم فى الفچائل: رحمته صلى الله عليه وسلم، الصبيان والعيال، رقم/٢٣/١٩.

[١٩٢٨] أخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: الوصية بالجار...رقم: ٢٦٢٤.

[١٩٢٩] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي شريح: (من لا يأمَنُ جاره) فتح الباري/١٢ ص/٢٦٠ خاتمة كتاب الأدب).

-المترجم

ئـەبو شـورەيح -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- سـێ جـار لەسـەریەك فـەرمووی: بـەخودا بـاوەڕو ئیمـانی نییـە! عـەرزیان کـرد: کـێ؟ ئـەی پێغەمـەری خـودا! قـەرمووی: کەسـێ کەهاوسـێ لـەزیان و وەزەنـی بترسـێ. (تـاج/٩ ل/٢٤ ز/٧ ژ/٣ – ش + ریـاض/١ ل/٢٥٣ ز/٣٩ ژ/٣٠٥/٣ متفق علیه)

١٩٣٠ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: قال رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُـؤْذِي جَـارَهُ وَمَـنْ كَـانَ يُـؤْمِنُ بِاللّٰـهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ وَمَنْ كَـانَ يُـؤْمِنُ بِاللّٰـهِ وَالْيَـوْمِ الْـآخِرِ فَلْيَقُـلْ خَيْـرًا أَوْ لِيَصْمُتْ. (الحديث ٦٠١٨ طرفه في: رقم: ١٧٧٢ تجريد = ٥١٨٥ فتح الباري).

ئـەبو هـورەیرە -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: خۆشەویـست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: هەرکەسێ باوەڕی ساغی بەخوداو بەرۆژی دوایـی هەیە، با بۆ دراوسێی خۆی باش بێ و ئازاری نـەدا، هەرکەسێکیش بـاوەڕی سـاغی بـەخوداو بـەرۆژی دوایـی هەیـە، بـارێزی میـوانی خـۆی بگـرێ، هەرکەسێکیش باوەڕی تەواوی بەخوداو بەرۆژی دوایی هەیە، با یاقسەی بـاش بکا، یا بۆ خۆی بێ دەنگ بێ! (ریـاض/١ ل/٢٥٤ ژ/٣٠٨/٦ ز/٣٩ + ژمـارە/١٧٧٢ تەجرید).

کورد گوتنی: کەقسەی چاك نازانی، قسەی خراپیش مەکە، کە گوڵ نیـت دڕك مەبە.

## زۆری ڕێگەی خێرو فرەیی جۆری چاکە

١٩٣١– عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدَاللهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما، عَنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ. (الحديث ٦٠٢١)[١٩٣١].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست - دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: کردنو گوتنو پەخشی ئەوەی کەیاسانامەی خودا، پەسەندی بکا، بەچاکەو بەخێر دادەنرێ!. (ریاض/١ ل/١٢٩ ز/١٣ ژ/١٨/١٣٤) + (ژ/٦٦٦ هەتا ٦٩٢ تجريد).

روونکردنەوە:

ماموٚستای عەسقەلانی -ڕەحمەتی خودای لێبێ- ئەم نمونانە دەهێنێتەوە، بۆ ئەو خێرو چاکەیەی کەلەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆکراوە، وە زۆرینەیان بەفەرموودەی تر دەچەسپێنێ:

١. ئەو خەرجی و مەسرەفەی مرۆڤ دەیکا بۆ خزمو کەسوکاری خۆی.

٢. هەرچی ببێ بەهۆی پاراستنی نامووس و ڕێزی خۆی.

٣. ڕووی خۆش لەگەڵ دۆستو برادەرو موسوڵمانانیدا.

٤. چۆڕێ ئاو لەسەتڵەکەت بکەیتە سەتڵو دۆڵچەی هاوڕێکەت.

٥. هەموو قسەیەکی باشو، هەموو کارێکی چاکو هەموو خوو و عادەتو ڕەوشت و نەریتی جوانی باش.

٦. نەکردنی خراپە و خۆدوور خستنەوە لەشەڕە، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کەهۆکاری ئەوە سازابێت.

٧. مەعرووف هەموو کارێکە کەشەرع و هۆشی ساغ بەباشی دابنێن.

٨. دەست پێوەگرتن، کەدژی دەستبڵاوییە.

---

[١٩٣١] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث جابر (كل معروف صدقة) (فتح ١٢ ص٦٠ ٢ خاتمة كتاب الأدب.
-المترجم-

٩. هەمووكارێ کە بەڵگەی شەرعی بچەسپێ و ساغ بێتەوە کەهەق و ڕەوایە و کردنی بەپێی شەرع ڕەوایە و باشە.

١٠. ئیتر کورت و پوخت: هەموو شتێ، شەرع بەحەڵاڵ و جوانی بزانێ، کردنی، گوتنی، بڵاوکردنەوەی، لەلایەن هەرکەسێکەوە بێ، بەمەرجی نیازی خێروباش، دادەنرێ بەخێرو سەدەقە.

١١. مەعرووف هەموو شتێکە کەشەرع ڕێگەی پێدەدا، یا پێشگیری لەکردنی دەکا، کردنی بەشی یەکەم و نەکردنی بەشی دووەم، بەنیازی پەیڕەوی شەرعی خوا دادەنرێ بەخێرو چاکەو سەدەقە.

١٩٣٢- عَنْ عائيشة رَضِي اللَّهُ عَنه قَالَ:تْ: قَال لي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ. (الحديث ٦٠٢٤ سبق في رقم: ١٢٠٥ تجريد = ٢٩٣٥ فتح = بەرگی/٣ ل/٣٢٨)[١٩٣٢]:

١٩٣٣- عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِي اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا ثُمَّ شَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسًا إِذْ جَاءَ رَجُلٌ يَسْأَلُ أَوْ طَالِبُ حَاجَةٍ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا وَلْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا شَاءَ. (الحديث ٦٠٢٧ سبق في رقم: ٦٨٧ تجريد ١٤٣٢ فتح = بەرگی/٢ ل/١١١)[١٩٣٣]:

ئەبو موسا -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: موسوڵمان قەڵایە بۆ موسوڵمان، دەبێ وەك چینی دیوار چنگ بدەنە یەك!. ئەوجا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پەنجاکانی هەردوو دەستی خۆی تێك پەڕاندو، ئاماژەی کرد، کەدەبێ ئاوا پشتی یەك بگرن. (بڕ: ژمارە/٢٩٢ تجرید = ٤٨١ فەتح = بەرگی/١ ل/٢٩٩).

---

[١٩٣٢] اخرجه مسلم في السلام، باب: النهي عَن ابتداء أهل الكتاب بالسلام.. رقم: ٢١٦٥.

[١٩٣٣] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب تراحم المؤمنين. رقم: ٢٥٨٥.

مەندەی فەرموودەکە لەپێشەوە رابورد (بڕ: بەرگی/٢ ل/١١١).

## خووشیرنی و رەفتاری جوان و زمانپاکی

١٩٣٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللّٰه عَنه قَالَ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبَّابًا وَلَا فَحَّاشًا وَلَا لَعَّانًا كَانَ يَقُولُ لِأَحَدِنَا عِنْدَ الْمَعْتِبَةِ مَا لَـهُ تَـرِبَ جَبِينُـهُ. (الحديث ٦٠٣١ طرفه في: ٦٠٤٦)[١٩٣٤]:

ئەنەسی کوڕی مالیك -ڕەزای خوای لێ بێ- فـەرمووی: پێغەمـەر -درودی خوای لەسەر بێ- جمێن فرۆش و هەرزەگۆ و نەفرینکـەر نـەبوو، کاتـێ گلـەیی لەکەسـێکمان بکردایـە، پـێی دەفـەرموو: ئـەوە چییەتی بۆچـی وادەکا لـووتی بەقوڕا چێت!. (بڕ: تاج/٩ ل/٦١ ز/٢١ ژ/٢).

١٩٣٥- عَنْ جابر رَضِي اللّٰهُ عَنه قَال: مَاسُئِلَ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ شَيْءٍ قَطُّ، فَقَالَ: لاَ. (الحديث ٦٠٣٤)[١٩٣٥]:

جابیر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: هەرگیز نەبووە کەشتێ لەپێغەمـەر -درودی خوای لەسەر بێ- داوابکـرێ و بڵـێ: نـا! (تـاج/٤ ل/٢٦٩ ز/٩٠ ژ/٤ — باسی رەفتارە شیرینەکانی پێغەمەر -درودی خوای لەسەر بێ ).

١٩٣٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللّٰه عَنه قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا قَالَ لِي: أُفٍّ، وَلاَ لِمَ صَنَعْتَ؟ وَلاَ: أَلاَ صَـنَعْتَ؟ .(الحـديث ٦٠٣٨ طرفه في ٢٧٦٨)[١٩٣٦]:

---

[١٩٣٤] و الحديث من أفراده (العيني /٢٢ ص١١٧). -المترجم-

[١٩٣٥] اخرجه مسلم في الفضائل، باب: ما سئل رَسُولُ اللهِ شيئا قط..رقم: ٢٣١١.

[١٩٣٦] اخرجه مسلم في الفضائل، باب: كان رَسُولُ اللهِ الله صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ احسن الناس خلقا ..رقم/٣٠٩.

ئیمامی ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: دەساڵی ڕێك بەردەستی‌و خزمەتی پێغەمەرم کرد، نەبووە کەپێم بڵێ: ئۆف لەدەست تۆ، یا بۆئەوەت واکرد؟ یانەدەبوو کەئاوا بیکەیت.

١٩٣٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَا يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلًا بِالْفُسُوقِ وَلَا يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ إِلَّا ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ.(الحديث ٦٠٤٥ طرفه في رقم: ١٣٩٥ تجريد = ٣٥٠٨ فەتح = ب/٤ ل/٨٣)[١٩٣٧]:

لێرەدا دەفەرموێ: ژنەوتم لەخۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: ئەو موسوڵمانەی بەبرای ئایینی خۆی، یا بە خوشکی ئایینی خۆی بڵێ: ئەی ناموسوڵمان و تۆمەتی بێبڕوایی بداتە پاڵی، یا تۆمەتی بەدکاری لێبدات، ئەوە ئەگەر تۆمەت بۆکراوە کەوا بوو، ئەوە بەرئەودەکەوێ، دەنا تۆمەتبارکردنە ناهەقەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆی. (ریاض/٤ ل/١٤٠ ز/٣٢٦ ژ/١/١٧٣٢ + ژ/٢/١٧٣٣ + ز/٢٦٤ ژ/٤/١٥٥٤).

ڕوونکردنەوە:

پوختەی مەبەست لەفەرموودەکانی ئەم بابەتە چەند مەبەستێکە:

١. موسوڵمان زمانپاك بێ، جمێن فرۆش و زمان شڕنەبێ.
٢. تۆمەتی ناڕەوا لەکەس نەدا، دەنا ئۆباڵی ئەوە بەملی خۆیەتی.
٣. ئەم جۆرە فەرموودانە بۆ هەڕەشەیە، وە بەپێی نیازی گوتەری ئەم تۆمەت‌و جنێوو شایەتییە ناهەقانە، بەرپرسی دەکەوێتە سەری.

١٩٣٨- عَنْ ثَابِتَ بْنَ الضَّحَّاكِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ الشَّجَرَةِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ حَلَفَ عَلَى مِلَّةٍ غَيْرِ الْإِسْلَامِ فَهُوَ كَمَا

---

[١٩٣٧] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان حال إيمان من رغب عن ابيه وهو يعلم، رقم/٦١.

قَالَ، وَلَيْسَ عَلَى ابْنِ آدَمَ نَذْرٌ فِيمَا لَا يَمْلِكُ، وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ فِي الدُّنْيَا عُذِّبَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ لَعَنَ مُؤْمِنًا فَهُوَ كَقَتْلِهِ، وَمَنْ قَذَفَ مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَتْلِهِ. (الحديث ٦٠٤٧ سبق طرفه في رقم: ٦٤٧ تجريد = ١٣٦٣ فتح الباري = بەرگی/٢ ل/٧١)[١٩٣٨].

لێرەدا ئەم دووزیادەی هەیە:

١. شت هەتا نەبێ بەماڵی مرۆڤ نەزرو بەخشینی دانا مەزرێ، وەك تۆ بڵێیت: ئەو مەلەبەحەواوە بۆ تۆ، کەمەلەکە هی تۆنەبێ، یا ئەگەر ئەم سکەی ژنە کەم کچ بوو مارەم کرد لە کوڕەکەی تۆ، یا ئەگەر لەیلام مارەکرد بۆ خۆم لەپاش شەوێ تەڵاقی کەوتبێ.

٢. لەعنەت کردن لەموسوڵمان بەقەد کوشتنەکەی تاوانێکی گەورەیە و گوناهی بەقەد ئەو هەیە، بەڵام واتای وانییە: ئەگەر کەسێ لەعنەت لەکەسێ تر بکا لەسەر ئەوە دەکوژرێ، هەروەك چۆن کەسێ بەناهەق کەسێ بکوژێ دەکوژرێتەوە.

## غەیبەت و دووزمانی

١٩٣٩- عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ. (الحديث ٦٠٥٦)[١٩٣٩].

حوزەیفە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: ژنەوتم لە زاری پیرۆزی خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: مرۆی دوو زمان دووپێی ناچێتە ناوبەهەشت. (ریاض/٤ ل/١١٣١ ژ/١٥٣٦/١/١).

---

[١٩٣٨] أخرجه مسلم في الإيمان، باب: غلظ تحريم قتل الإنسان نفسه، رقم: ١١٠.

[١٩٣٩] أخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان غلظ تحريم النميمة، رقم/١٠٥.

١٩٤٠- حديث ابي هريرة (وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ وَلَا يُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا. (الحديث ٦٠٦١ سبق بالكامل في رقم: ١١٢٢ تجريد = ٢٦٦٢ فەتح)[١٩٤٠]:

## بەخیلیو کینە کێشان

١٩٤١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا تَبَاغَضُوا وَلَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثة أَيَّامٍ. (الحديث ٦٠٦٥ طرفه في: ٦٠٧٦)[١٩٤١]:

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ڕقو کینەو دەغەز لەیەکتری مەکێشن و پشت مەکەنە یەکتری و لەیەکتری لووتە لا مەبن، وەك برای باشو تەبا بەندەی باشی خودابن، دروست نییە بۆ موسوڵمان کە زیاتر لەسێ ڕۆژ قسە لەبرای ئایینی خۆی دابڕێ. (بڕوانە: ریاض/٤ ز/٢٦٩).

١٩٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ وَلَا تَحَسَّسُوا وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا تَنَاجَشُوا وَلَا تَحَاسَدُوا وَلَا تَبَاغَضُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. (الحديث ٦٠٦٤ طرفه في ٥١٤٣، ٦٠٦٦، ٦٧٢٤)[١٩٤٢]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: دووربن لەگومانی خراپ، چونکە گومانی خراپ دەق وەك قسەی درۆ وایەو وەکوو درۆ تاوانێکی گەورەیە، هەستیش

---

[١٩٤٠] اخرجه مسلم في الزهد و الرقاق، باب: النهي عن المدح...رقم/٣٠٠٠.

[١٩٤١] اخرجه مسلم في البر والصلة، باب: تحريم التحاسد و التباغض، رقم: ٢٥٥٩.

[١٩٤٢] قال في التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول، رواه الأربعة (تاج/٥ ص/٢٩) وهم الشيخان و أبوداود و الترمزي. -المترجم-

هەڵمەگرن بەنیازی خراپو، بەشوێن عەیبو نەنگی خەڵك دا مەگەڕێنو، سیخوڕی و جاسووسی مەکەنو، بەربەرەکانێ و قینەبەری مەکەنو بەخیلی بەیەکتری مەبەنو کۆستە کۆستە لەیەکرتی مەکەنو پشت مەکەنە یەکتری، وە وەك برا تەبابن و بەندەی باشی خودابن. (تاج/٩ ل/٤٩ ز/١٦).

## غەیبەتی ڕەوا و پۆشینی نەنگی موسوڵمان

١٩٤٣- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنها قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَا أَظُنُّ فُلَانًا وَفُلَانًا يَعْرِفَانِ مِنْ دِينِنَا شَيْئًا. (الحديث ٦٠٦٧ طرفه في: ٦٠٦٨)[١٩٤٣].

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -درووودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئەی عائیشە گومان نابەم کە فیسارەکەسو ئەو فیسارەکەس هیچ لەم ئایینی ئیسلامەی ئێمە بزانن. (تاج/٩ ل/٤٦).

١٩٤٤- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه قَال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى إِلَّا الْمُجَاهِرِينَ وَإِنَّ مِنَ الْمُجَاهَرَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلًا ثُمَّ يُصْبِحُ وَقَدْ سَتَرَهُ اللّٰهُ عَلَيْهِ فَيَقُولُ يَا فُلَانُ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللّٰهِ عَنْهُ.(الحديث ٦٠٦٩)[١٩٤٤].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمەر - درووودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: ئۆمەتی من هەموویان بەرعەفوو لێبوردنی خوا دەکەون، مەگەر ئەوانەیان کە سری خۆیان هەڵ دەماڵن، وەك ئەوە کابرایەك لەشەودا کارێکی ناشیرین دەکا، وە خودا بۆی دەپۆشێ، کەچی کابرا بۆ بەیانی دەچێ تاوانی خۆی ئاشکرا دەکاو، دەیگێڕێتەوە بۆ ئەم و ئەو

---

[١٩٤٣] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث (ما اظن فلانا و فلانا) (خاتمة كتاب الأدب – ج/١٢ ص/٢٦٠ فتح الباري؛ ط.ج = طبعة جديدة. -المترجم

[١٩٤٤] اخرجه مسلم في الرهد و الرقائق، باب: النهي عن هتك الأنسان..رقم/١٩٩٠.

و دەڵێ: ئەی فیسار! مـن دوێ شـەو، ئیشێکی وا وام کـرد! لەگـەڵ فلانو ئـەو فلانا، ئارەقمان خواردەوە، یا قومارمان کرد مەسەلا!!

تەماشـاکەن ئـەو کابرایـە خـودا بەشـەو پـەردەی بۆدەگـاو بـە پـەردەی رەحمەتی خۆی گوناهو نـەنگی دەپۆشـێ، کەچی ئـەو ئەوەنـدە بـێ باكو بـێ ئاگایـە، دەچـێ بـەرۆژ پـەردەی خـودا لەسـەر نـەنگ و شـوورەیی خـۆی هـەڵ دەداتەوە!. (ریاض/١ ل/٢١٥ ز/٢٨ ژ/٢٤١/٢/ -ش=متفق علیه).

روونکردنەوە:

کردنـی گونـاەو تـاوان بەئاشـکرا، خـۆی تـاوانێکی دووهەمـە، وە تۆڵـەی گوناهەکە قورسـتر دەکا. هەنـدێ شت هەیـە لـەزاتی خۆیـدا دروسـتە، کردنـی حەڵاڵە، بەڵام گێڕانەوە و گوتنی ئەوکارە حەڵاڵە نهێنیـیە لـەلای ئـەمو ئـەو، بەبێ مەهانەی ڕەوا، حەرامەو تاوانەو، دەبێ بەهۆی سزای سەختی لای خودا. (بڕ: تاج/٣ ز/٤٣ ل/١٠٢ ژ/١٣) ئـەوەیش وەك كەسـێ لەگـەڵ حـەڵاڵ حـەڵاڵی خـۆی دا دروست ببـێو قـسەی ژنو مێـردی خۆیـان بکـەن، کەچـی بچـێ ئـەم باسو خواسە بۆئەم و ئەو بگێڕێتەوە.

## باسی قسەدابڕین و قسەنەکردن لەگەڵ یەکتری

١٩٤٥- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ يَلْتَقِيَانِ فَيُعْـرِضُ هَـذَا وَيُعْـرِضُ هَـذَا وَخَيْرُهُمَـا الَّـذِي يَبْـدَأُ بِالسَّلَامِ. (الحـديث ٦٠٧٧ طرفـه في: ٦٢٣٧)[١٩٤٥].

[١٩٤٥] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: تحريم الهجر فوق ثلاث بلاعذرٍ شرعي. رقم: ٢٥٦٠.

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: دروست نییە بۆ پیاوی موسوڵمان، هەروا بۆ ژنی موسوڵمان، کە زیاتر لەسێ شەو، قسە دابڕێ لەبرای موسوڵمانی، یا لەخوشکی موسوڵمانی و قسەی لەگەڵ نەکا، گریمان ئەگەر لەشوێنێ تووشی یەکتری بوون، ئەمیان بەم لاداو ئەویان بەولادا روو وەرگێڕێ! پیاو باشی ئەم دووبرا موسوڵمانە لەیەك تۆراوەیش ئەوەیانە کەلەپێش دا ئاشت دەبێتەوەو رۆژ باشی و سڵاو لەوی تریان دەکا. (ریاض/٤ ل/١١٧٥ ز/٢٨٠ ژ/٢).

## زەمی درۆو پەسنی راستی

١٩٤٦- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ رَضِي اللّٰه عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يَكُونَ صِدِّيقًا وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللّٰهِ كَذَّابًا. (الحديث ٦٠٩٤)[١٩٤٦].

عەبدوڵڵای کوڕی موسعوود -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: لەڕاستی ڕەحمەت دەبارێ، هەمیشە راستی بکەن بەپیشە، چونکە ڕاستی ئادەمیزاد دەخاتە سەر رێگەی چاکە، کردەوەی چاکەیش ئادەمیزاد ەخاتە سەر رێگەی بەهەشت! پیاوی واهەیە ئەوەندە ڕاستگۆیە و ئەوەندە سۆراخی راستی دەکاو ئەونە عەودالی ڕاستیە، هەتا لەلای خودا بەپیاوی راستو راستاڵ لەقەڵەم دەدرێو، لەدیوانی خودا ناوی بەڕاستاڵو راستی پەروەر دەنووسرێ، وە هەروەها ژنیش، وەنەکەن درۆبکەن، چونکە درۆ هەوێنی بەدکاریە، پیاو دەخاتە سەر رێگەی خراپە، کردەوەی خراپەیش پیاو دەخاتە سەر رێگەی ئاگری دۆزەخ، هەروا ژنیش،

---

(١٩٤٦) أخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: قبح الكذب و حسن الصدق، رقم: ٢٦٠٧.

موسـوڵمانی واهەیـە سـەر دەکاتـە درۆکـردن و هـەر درۆدەکـا، هـەتا بەرەبـەرە دەبێ بەردرۆ زنو لەلای خودا بەدرۆزن لەقەڵەم دەدرێ. (ریاض/١ ز/٤ ل/٦٩ ژ/١/٥٤ ش.باسی ڕاستی + تاج/٩ ز/٣٤ ل/٨٨ ف/١ باسی ڕاستگۆیی).

## خۆگرتن لەبەرباری ئازاری مەردوم دا

١٩٤٧- عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِي اللّٰه عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: لَيْسَ أَحَدٌ أَوْ لَيْس شَيْءٌ أَصْبَرَ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنَ اللّٰهِ إِنَّهُمْ لَيَدْعُونَ لَـهُ وَلَـدًا وَإِنَّـهُ لَيُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ. (الحديث ٦٠٩٩ طرفه في: ٧٣٧٨)[١٩٤٧].

ئەبو مووسا -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسـەر بـێ- دەفـەرموێ: کـەس نییـە کـە وەك خـودای گـەورە بـەئارم و بەحەوسەڵە بێ، لەسەر ئەو هەموو ئازارو قسە ناڕەوایانـەی کەبـەو دەکرێو بەگوێی خۆی دەیانبیستێ، ئەوەتانێ بتپەرستان و هاوبەش پەیـداکاران بـۆی، بڕیاری هاوتاو منداڵی بۆ دەدەنو دەڵێن: خودا منداڵی هەیـە، خـودا شـەریكو هاوبەشی هەیە، کەچی لەگەڵ ئەم تانـەو توانجـەش دا، ئـەوەتانێ خـودا رزقو رۆزیـی یـان دەدا، سـاخلەمیان دەکـا، خۆشـیو نـازو بـەهرەی خـۆی دەڕژێنـێ بەسەریانا، واتە: ئارامو حەوسەڵە و هێمنی سیفەتی خوداو پێغەمەرانو پیـاو چـاکانە. (تـاج/٩ ز/٣٠ ل/٨١ ش-باسـی صـەبرو ئـارامو لێبـوردنو بەحەوسەڵەییو ئازارکێشی).

## تووڕەبوون

---

[١٩٤٧] اخرجه مسلم في صفات المنافقين و احكامهم: باب: لا احد اصبر على اذى من الله ..رقم/٢٨٠٤.

١٩٤٨- عَنْ ابي هريرة رَضِي اللّٰهُ عَنه قَالَ: أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ. (الحديث ٦١١٤)[1948]:

ئەبوهورەیره -ڕەزای خوای لیٚ بیٚ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بیٚ- دەفەرمویٚ: ئەوکەسە ئازانییە کە پاڵەوانی چاکەو، کەس لەزۆرانبازیدا دەرەقەتی نایێ، بەڵام ئەوکەسە ئازایە، کەلەکاتی تووڕەیی دا، خۆی پیٚدەگیریٚ و، رقی خۆی دەخواتەوە. (ریاض/١ ل/٦٤ ز/٣ ژ/٤٥/٢١).

١٩٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰه عَنْه أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَوْصِنِي. قَالَ: لَا تَغْضَبْ. فَرَدَّدَ مِرَارًا، قَالَ: لَا تَغْضَبْ. (الحديث ٦١١٦)[1949]:

ئەبوهورەیره -ڕەزای خوای لیٚ بیٚ- فەرمووی: پیاویٚ هاتە خزمەتی پیٚغەمەر -دروودی خوای لەسەر بیٚ- عەرزی کرد: شتیٚکی وام فیٚربکە، کەتیٚی بگەم، کەکەم و پوخت بیٚ، بەشکم لیٚی حاڵی ببم، ئەویش فەرمووی پیٚی: تووڕەمەبە. پیاوەکە چەند جاریٚ ئەم قسەیەی دووبارە کردەوەو پیٚی دەگوت: شتیٚکم فیٚربکە، بەڵام زۆرنا، بەشکم لیٚی حاڵی ببم و ببیٚ بەهۆی چوونە بەهەشتم؟ پیٚغەمەریش -دروودی خوای لەسەر بیٚ- هەربەم وەڵامە وەڵامی دەدایەوەو دەیفەرموو: تووڕەمەبە. (ریاض/١ ز/٣ ل/٦٦ ژ/٤٩/٢٥).

---

[1948] أخرجه مسلم في البر والصلة و الآداب، باب: فضل من يملك نفسه رقم/٢٦٠٩.

[1949] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة: لا تغضب.. - خاتمة كتاب الأدب ج/١٢ ص/٢٦٠. -المترجم-

## شەرمو شكۆ

١٩٥٠- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأنصاري رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ. الحديث ٦١٢٠)[١٩٥٠]:

ئەبو مەسعودى ئەنصارى -ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ- لەخۆشەويستەوە -دروودى خواى لەسەر بىٚ- دەفەرمویٚ: ئەو فەرمایشتە جوانو قسە نەستەقەى كە دەفەرمویٚ: ئەگەر شەرم ناكەى چى دەكەى بیكە. ئەم فەرمایشتە لەفەرموودەى پیٚغەمەرە پیٚشینەكانە. (تاج/٩ ز/٣٨ ل/٩٥ ژ/٣ باسى شەرمو شكۆ) + (ریاض/٤ ز/٣٧٠ ل/١٣٣٣ ژمارە/٣٧/١٨٤٤).

١٩٥١- عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: الْحَيَاءُ لَا يَأْتِي إِلَّا بِخَيْرٍ. (الحديث ٦١١٧)[١٩٥١]:

عیمرانى كوڕى حوصەین -ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ- لەخۆشەویستەوە -دروودى خواى لەسەر بىٚ- دەفەرمویٚ: شەرمو شكۆ هەرخیٚر دیٚنیٚو بەس. (تاج/٩ ز/٣٨ ژ/١ ل/٩٤ ش/د-باسى شەرمو شكۆ).

## سوعبەت و گاڵتە كەمە دروستە

١٩٥٢- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِي اللّٰه عَنه قَال: إِنْ كَانَ النَّبِيُّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُخَالِطُنَا حَتَّى يَقُولَ لِأَخٍ لِي صَغِيرٍ يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ. (الحديث ٦١٢٩ طرفه في: ٦٢٠٣)[١٩٥٢]:

---

[١٩٥٠] لم یوافقه مسلم على تخريج حديث رقم/٣٤٨٤ فەتح راجع (بەرگى/٤ ل/٧٨ تسلسل/١٨). -المترجم-

[١٩٥١] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان عدد شعب الإيمان و افضلها و ادناها..رقم/٣٧.

[١٩٥٢] و الحديث اخرجه مسلم في الصلاة (العيني ج/٢٢ ص/١٧٠) — المترجم -.

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی لەئێمە جیانەدەکردەوە، تەواو تێکەڵاوی دەکردین، ئەوەندە بێ دەمارو بێ فیزو بێ دەعیە بوو، گاڵتەو سوعبەتی لەگەڵمان دەکرد، تەنانەت برایەکی بچکۆلەم هەبوو، نازناوی ئەبو عومەیر بوو، بۆ خۆشی پێمان دەگوت: باوکی عومەیر، دایك برام بوو، بەمنداڵی لەسەردەمی پێغەمەردا مرد، ئەبو عومەیر کێشکەیەکی هەبوو، گەمەی پێ دەکرد، ڕۆژێ کێشکەکە مرد، حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- هات بۆ ماڵمان، تەمشای کرد ئەبو عومەیر خەمبارە، فەرمووی: ئەوە چییەتی؟ عەرزیان کرد: مەلیچکەکەی مردووە! فەرمووی: ئەی باوکی عومەیر! مەلیچکەکەت چی بەسەرهات. (تاج/٩ ل/٩١ ز/٣٥ ژ/٣ – ش/د/ت/ باسی سوعبەت دروستە).

## موسوڵمان دەبێ زرنگ و وریابێ

١٩٥٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ. (الحديث ٦١٣٣)[١٩٥٣].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: موسوڵمان دەبێ زرنگ و هۆشیارو وریاو دووربینبێ، ئەگەر دنیابوو، کەسێ خەڵەتانی، نابێ جارێ تر باوەڕی پێبکاو دووبارە بیخەڵەتێنێتەوە! چونکە مرۆڤی ژیر دووجار لەسەریەك لەیەك کونەوە شت پێوەی نادات!. (ریاض/٤ ل/١٣٢٨ ژ/١٨٣٤/٢٧ ز/٣٧).

ڕوونکردنەوە:

---

[١٩٥٣] اخرجه مسلم في الزهد و الرقائق. باب: لا يلدغ المؤمن من جحر مرتين. رقم/٢٩٩٨.

جێگەی داخە گەلی کورد لەم لایەنەوە خۆش باوەڕە، رۆژ نییە دەرو دراوسێکانی وەك مارەکەی شێخ هۆمەر پێوەی نەدەن، کەچی ئەو وەك نەبای دیبێ و نەبۆران، جار لەگەڵ جارا باشتر دەستی دەکاتەوە بەکونی هەژدیهاکەدا.

## چەند بابەتێکی ئەدەب

١٩٥٤- عَنْ أَبِي بنْ كَعْبٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْه أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً. (الحديث ٦١٤٥)[١٩٥٤]:

ئوبەیی کوڕی کەعب -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: بەڕاستی بازێ لەشیعر حیکمەتە، هەندێ لەهەڵبەست دانایی یەکی شیرینی واتیادا. (تاج/١٠ ل/١٧٤ ز/٧٠ ب/د/ت — باسی- هەندێ هەڵبەست پڕە لە حیکەمەت و دانایی).

١٩٥٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللّٰه عَنْهمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا. (الحديث ٦١٥٤)[١٩٥٥]:

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست —دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی لەڕاستیدا ناودڵی مرۆڤ پڕبێ لەکێم و زووخاو، هێشتا ئەوەی باشترە لەوەی کەناو دڵی پڕبێ لەهەڵبەست و هۆنراوە!. (تاج/١٠ ل/١٧٢ ز/٦٨).

---

[١٩٥٤] لم يوافقه مسلم. على ما قاله مؤلف التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول صَلَى الله عَلَيهِ وَسَلَمَ (بەرگی/١ ل/١٧٤ ز/٧٠ — ب/د/ت — يعنى رواه البخارى وأبو داود و الترمزي ولم يروه مسلم. -المترجم-

[١٩٥٥] لم يوافقه مسلم على تخريج الحديث ابن عمر: لأن يمتليء... . خاتمة كتاب الأدب: فتح/١٢ ص/٢٦٠. -المترجم-

# خۆشەویستان پێکەوە حەشر دەکرێن

١٩٥٦- عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ قَائِمَةٌ؟ قَالَ: وَيْلَكَ وَمَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟ قَالَ: مَا أَعْدَدْتُ لَهَا إِلَّا أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. قَالَ: إِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ. فَقُلْنَا وَنَحْنُ كَذَلِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. (الحديث ٦١٦٧ سبق في ١٤٥٩ تجريد = ٣٦٨٨ فەتح)(١٩٥٦).

# ئاڵای بەد ئەمەکی و بێ پەیمانی

١٩٥٧- عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهما عَنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ الْغَادِرَ يَنْصِبُ اللَّهُ لَهُ لِوَاءً يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ. (الحديث ٦١٧٨ أطرافه في: ٦١٧٧، ٣١٨٨، ٦١٧٨، ٦٩٦٦، ٧١١١)(١٩٥٧).

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: لەرۆژی قیامەتدا هەموو ستەمگەر و بێ پەیمانێ، ئاڵایەکی تایبەتی خۆی هەیە، هەڵدەکرێ لە دیاری، پێی دەناسرێتەوە، دەڵێن: ئەمە نیشانەی ناپاکیو پەیمانشکێنی فیسارەکەسە، هەتا ئاوا ناوی بەدیی بزڕێ و ریسوا ببێت.

# هەندێ گوتەی ناپەسەند

١٩٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ تُسَمُّوا العِنَبَ الْكَرْمُ إِنَّمَا الْكَرْمُ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ. (الحديث ٦١٨٢ طرفه في: ٦١٨٣)(١٩٥٨).

---

(١٩٥٦) سبق في رقم: ١٤٥٩ = بەرگی/٤ ل/١٤٨. -المترجم-

(١٩٥٧) أخرجه مسلم في الجهاد و السير، باب: تحريم الغدر رقم/١٧٣٥.

(١٩٥٨) أخرجه مسلم في الألفاظ من الأدب، باب: كراهة تسمية العنب كرما، رقم: ٢٢٤٧.

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: بەترێ و داری مێو مەڵێچن: (کەرم)، کە بەواتا ڕێزداری و نازداریيە، چونکە دڵی موسوڵمان شایستەی ئەم ناوە جوانەیە. (تاج/١٠ ز/٨٣ ل/١٩٤).

١٩٥٩ - وَ عَنْهُ رَضِي اللَّهُ عَنه: أَنَّ زَيْنَبَ كَانَ اسْمُهَا بَرَّةَ، فَيِقِيلَ: تُزَكِّي نَفْسَهَا، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْنَبَ. (الحديث ٦١٩٢)[١٩٥٩].

دیسان ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: زینەبی هاوسەری پێغەمەر، لەپێشا ناوی بەڕەبوو، واتە: ژنەخاس، دادە باشە، گوترا: بەرەخۆی بەچاك و باش دادەنێ! جا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ناوی نا "زەینەب".

١٩٦٠- عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ رَضِي اللَّهُ عَنه قَال: كَانَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ فِي الثَّقَلِ وَأَنْجَشَةُ غُلاَمُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسُوقُ بِهِنَّ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يا أَنْجَشُ رُوَيْدَكَ سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ. (الحديث ٦٢٠٢ أطرافه في: ٦١٤٩، ٦١٦١، ٦٢٠٩، ٦٢١٠، ٦٢١١)[١٩٦٠].

ئەنەس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: کۆمەڵێ ژن، کەیەکێکیان ئوم سولەیمی دایك بوو، بەسواری وشتر لەسەفەرێکا، لەناو بارو بنەکەدا بوون، ئەنجەشە کە نۆکەری پێغەمەر بوو، بەدەنگە خۆشەکەی خۆی، بەهۆرە، وشترەکانی ژێر ئافرەتەکانی لێ دەخوڕی، وەك زانراوە وشتر ئەگەر بەدەنگی خۆش هۆرەی بۆ بکرێ، تەواو خێرا دەبێ، هەروەك چۆن ران بەدەنگی شمشاڵی خۆش باش دەلەوەڕێ ئاوا! جا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بۆ ئەوەی ئەنجەشە، پێی لێ هەڵ نەبڕی و بەئاسایی، و شترەکان لێ بخوڕێ

---

[١٩٥٩] اخرجه مسلم في الأداب، باب: استحباب تغعيير اسم القبيح..رقم: ٢١٤١.

[١٩٦٠] اخرجه مسلم في الفضائل، باب: رحمة النبيُّ صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ للنساء ..رقم/٢٣٢٣.

پىَ فەرموو: ئەى ئەنجەشە! هێواش لەسەرە خۆبە، ولاخەکان بەهێواشى لىَ بخورە، چونکە باریان ئافرەتە کە وەك شووشە و مینا ناسکن و بەرگەى ئەم هەڵبەز هەڵبەزە ناگرن!. (تاج/١٠ ل/١٨٨ ز/٧٨ ژ/٢).

١٩٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: أَخْنَى الْأَسْمَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللَّهِ رَجُـلٌ تَـسَمَّى مَلِـكَ الْأَمْلَـاكِ. (الحـديث ٦٢٠٥ طرفه في ٦٢٠٦)[1961]:

ئـەبو هـورەیرە -ڕەزاى خـواى لىَ بـىَ- فـەرمووى: خۆشەویـست -درووودى خواى لەسەر بىَ- فەرمووى: لە رۆژى زیندووەدا لەهەموو کەسىَ خوێڕى تـرو، لەهەموو ناوىَ دزێوو ناشیرینتر، لەلاى خودا، ئـەو پیاوەیـە کـە بـەخۆى بلىَ: ملـك الأمـلاك. واتـە شاهەنـشاە: شـاى شـایان. (تـاج/١٠ ل/١٥٨ ز/٦٣ ژ/٢) + (ریاض/٤ ز/٣٢ ل/١٢٥٤ ذ/١).

١٩٦٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَـالَ: عَطَـسَ رَجُلَـانِ عِنْـدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا وَلَمْ يُشَمِّتِ الْآخَرَ فَقِيلَ لَهُ، فَقال: هَذَا حَمِـدَ اللَّهَ وَ هَذَا لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ. (الحديث ٦٢٢١ طرفه في: ٦٢٢٥)[1962]:

ئەنـەس -ڕەزاى خـواى لىَ بـىَ- فـەرمووى: جارىَ لەخزمـەت پێغەمـەردا -درووودى خواى لەسەر بىَ- دوو پیـاو پژمین، پێغەمـەر -درووودى خـواى لەسـەر بـىَ- نـزاى خێـرى بـۆ یـەکێکیان کـردو، نـزاى بـۆ ئـەوى تریـان نـەکرد، واباوە کەیـەکىَ دەپـژمىَ پـىَ دەگـوترىَ: یرحمـك الله: رەحمـەتى خـودات لىَ بـىَ. ئەوەیان کە پێغەمەر نزاى بۆى نـەکردن گوتى بـە پێغەمـەر: بۆچى کە ئـەو پژمى نـزات بـۆیکرد، کەچى بـۆمن، کەپـژمیم نـزات بـۆ نـەکردم؟ فـەرمووى: چونکە ئەو لەپاش پژمینەکەى سوپاسى خـوداى کـردو حەمدوسـەناى خـواى

---

[1961] أخرجه مسلم في الآداب، باب: تحريم التسمّي بملك الأملاك و ملك الملوك. رقم/٢١٤٣.

[1962] أخرجه مسلم في الزهد و الرقاق، باب: تشميت العاطس و كراهة التثاؤب، رقم: ٢٩٩١.

کـرد، بـەلاّم تـۆ سـوپاس و حەمـدو سـەنات نـەکرد. (ريـاض/٢ ل/٣٣١ ز/١٤٢ ژ/٨٨١/٤).

## پژمینو باوێشك

١٩٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ فَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ كـان حقـاً عَلَـى كُـلِّ مُـسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يقول: يرحمك الله وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ فإذا تثاءب أحـدكم فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ فإنَّ أحدكم إذا تثاءبَ ضَحِكَ مِنْهُ الـشَّيْطَانُ. (الحـديث ٦٢٢٦ سبق في: ١٣٢٦ تجريد = ٣٢٨٩ فتح = بەرگی/٣ ل/٤٥٤)[(١٩٦٣)].

ئەبو هـورەيرە -ڕەزای خـوای لێ بێ- فـەرمووی: پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسەر بێ- فەرمووی: خودا پژمەی پێ خۆشەو حـەزی لـە پـژمینی بەندەيـە، بەلاّم باوێشکی پێ خۆش نييە، چونکە نيشانەی خاوبوونی لـەش‌و داهـەزانی لەشـە، جاکاتـێ يـەکێکتان پـژمی‌و سوپاسـی خـودای کـرد، ئـەوە دەبـێ بـەماف لەسـەر هـەموو موسـوڵمانێ کـە گـوێی لێيـەتی پێـی بڵـێ: (يرحمك الله) خـودا ڕەحمت پێ بفـەرموێ. بـەلاّم باوێـشك لەشـەيتانەوەيە، جا ئەگـەر کەسـێکتان باوێشکی هات، با هەتا دەتوانـێ بـەری بگـرێ‌و بيداتـەوە دوواوە، چـونکە کاتـێ ئێـوە باوێـشك دەدەن، شـەيتان لەخۆشـيياندا پێتـان پـێ دەکـەنێ. (ريـاض/٢ ل/٣٢٩ ز/١٤٢ ژ/٨٧٨/١).

---

(١٩٦٣) اخرجه مسلم في الزهد و الرقاق، باب: تشميت العاطس و كراهة التثاؤب، رقم: ٢٩٩٤.

# پایانێ - الخَاتِمَةُ

ماموٚستا عەسقەلانی لێرەدا، لەفەتحولباری شەرحی صەحیحی بوخاریدا دەفەرموێ: نامەی ئەدەب و وێڵە جوانەکان، دوو سەدو پەنجاو شەش فەرموودەی بەرزەوە بوو (مەرفووع)ی واتیادا، حەفتاو پێنجیان بێڕشتەن، واتە: معلقن، ئەوانی تریان پەیوەستن واتە: موصولن، دووبارە کانیان دوو سەد و یەك فەرموودەن، پوختەکەیان: (٢٥٦ – ٢٠١ = ٥٥) دەکاتە پەنجاو پێنج فەرموودە. پێشەوا موسلیمیش وەك پێشەوا بوخاری -رەزاو رەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێ- ئەم پوختەیەی هەموو گێڕاوەتەوە، جگە لەمانەیان کە نۆزدە فەرموودەن: واتە: (٥٥ – ١٩ = ٣١) مو سلیمیش (٣١) فەرموودەی لەو پوختەیە وەك بوخاری گێڕاوەتەوە.

١. فەرموودەی عەمری کوڕی عاص: (عُقُوقُ الوَالِدَيْنِ مِنَ الكَبَائِرِ) بابی ژمارە (٦) لەکتابی ئەدەب، وا لەنێوانی ژمارە: ٥٩٧٤ و ٥٩٧٥ دا.

٢. فەرموودەی ئەبوهورەیرە: (مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ فِي رِزْقِهِ) = ٥٩٨٥ فتح الباری، لە تەجریدەکەدا نییە.

٣. فەرموودەی ژمارە: ١٩١٧ تەجرید = ٥٩٨٩ فتح (الرَّحِمُ شَجْنَةٌ).

٤. فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر: (لَيْسَ الوَاصِلُ بِالمكَافِيءِ) = ژمارە/١٩١٩ تەجرید = ٥٩٩١ فەتح.

٥. فەموودەی ئەبوهورەیرە: (قام أعرابي فقال اللهم ارحمنا) = ژمارە/١٩٢٤ تەجرید = ٦٠١٠ فەتحولباری.

٦. فەرموودەی ئەبو شورەیح: (من لاَيأمَنْ جَارُهُ...) = ژمارە/١٩٢٩ تەجرید = ٦٠١٧ فەتح.

٧. فەرموودەی جابیر: (كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ) = ١٩٣١ تەجرید = ٦٠٢١ فەتحولباری.

٨. فەموودەی ئەنەس: (لَمْ يَكُنْ فَاحِشاً...) ژمارە/١٩٣٤ تەجرید = ٦٠٣١ فەتح.

٩. فەرموودەی عائیشە: (مَا أظن فلانا وفلانا يعرفان من ديننا...) = ١٩٤٣ تەجرید = ٦٠٦٧ فەتح. لەتەجریدەکەدا نییە.

١٠. فەرموودەی ئەنەس: (كَانَتِ الأَمَةُ مِنْ إِمَاءِ أَهْلِ المدينة...) = ٦٠٧٢ فەتح. لەتەجریدەکەدا نییە.

١١. فەرموودەی حوزەیفە: (إِنَّ أَشْبَهَ النَّاسِ دَلاًّ وَسَمْتاً...) = ٦٠٩٧ فەتح.

١٢. فەرموودەی ئیبنو مەسعود: (إِنَّ أحسن الحديث كتاب الله) = ٦٠٩٨ فەتح.

١٣. فەرموودەی ئەبو هورەیرە: (إذا قَال الرجل: يا كافر...) = ٦١٠٣ فەتح.

١٤. فەرموودەی ئیبنو عومەر لەهەمان بابەت، ژمارە/٦١٠٤ فەتح.

١٥. فەموودەی ئەبوهورەیرە: (لا تغضب) = ١٩٤٩ تەجرید = ٦١١٦ فەتح.

١٦. فەرموودەی ئیبنوعومەر: (لأَنْ يمْتَلِيءَ...) = ١٩٥٥ تەجرید = ٦١٥٤ فەتح.

١٧. فەرموودەی سەعیدی کوڕی مسَب لەباوکیەوە: (لەبابەت ناوی حزنەوە) = ٦١٩٠ فەتح.

١٨. فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا: (رَأَيْتُ إِبراهِمَ أبنَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) = ٦١٩٤ فەتح.

هەروا کۆمەڵێ بیستراو -اثر- ی صەحابەو چینەکانی تریشوا تیادا، سەرجەمیان یازدە بیستراوە، بازێکیان پەیوەستن و بازێکیان بێ ڕشتەن.

<u>تێبینی/</u> کە دەڵێین موسلیمیش وەك بوخاری فیسارە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، مەبەست ئەوە نییە، کە ڕشتە (سەنەد) و (دەق)ی هەردووکیان وەك یەك بێ، بەبێ کەمو زیاد، نەخەیر مەبەست ئەوەنییە، گەرچی ئەم بابەتە باسێکی دوورودرێژو کەمێ پێچیدە و ئاڵۆزە، بەڵام لەبەر گرنگیو بۆ سوودو بەهرە وەرگرتنی تەواو لەم ئامـاژەو هێمایا نەئەم چەند خاڵە روون دەکەینەوە، بەپشتی خودا، دەڵێین:

١. ریوایەت بەمەعنا، ئەوەیە کەچەند فەرمووودەیەك، چەند کەسێ، هەرکەسێ بەرشتەی تایبەتی خۆیو بەدەقی تایبەتی خۆی دەیگێڕێتەوە، وەهەر فەرمووودەیێ لەو فەرمووودانە لەمەسنەدی کەسێکە، بەڵام لەئەنجاما هەموو گێڕاوەکان سەبارەت بەباتێکن، ئەم جۆرە هەر زۆر زۆرە، وەك ئەو کۆمەڵە فەرمووودە زۆرەی کەلەبارەی (محمدی مهدی)یەوەن، بەهەموویان دەگەنە تواتری معنوی، گەرچی لەناو خۆیانا چفیف و قویيان واتیادا.

٢. فەرمووودەی واهەیە چەند فەرمووودە شوناسێ، دەری دەهێنێ، بەوێنە: بوخاری لەئەبوهورەیرەوە دەری دەهێنێ، موسلیم لەئیبنوعەباسەوە دەری دەهێنێ، بۆ نموونە: فەرمووودەی ژمارە: ١٩٥٥ تەجرید = ٦١٥٤ فەتح، بوخاری بەم شێوەی ئێرە لەدوو صەحابەوە دەری هێناوە، لەئبنوعومەرەوە، ئەوجا لەئەبو هورەیرەوە، بەژمارە: ٦١٥٥ فەتح. رشتەو مەتنی فەرمووودەکەی ئیبنوعومەر، لای بوخاری ئاوایە:

حَدَّثَنَا عبدالله بن موسى، أَخبَرَنَا حَنْظَلَةُ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنهما عَنِ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: لَأَنْ يَمْتَلِيءَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحاً، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِيءَ شِعْراً.

رشتەو مەتنی فەرمووودەکەی ئەبوهورەیرە لای بوخاری ئاوایە:

حَدَّثَنَا عُمَرُ بْنُ حَفْصٍ، حَدَّثَنَا أَبِي، حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ، قَال: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه، قَال: قَال رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَأَنْ يَمْتَلِيءَ جَوْفُ رَجُلٍ قَيْحاً، حَتَّى يَرِيَهُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَمْتَلِيءَ شِعْراً.

موسلیمیش هەمان فەرمووودەی لەم سێ هاوڕێی پێغەمەرەوە دەرهێناوە:

١. ئەبو هورەیرە
٢. سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص
٣. ئەبو سەعیدی خودری

بەسێ مەتن، کەیەکەم و دووەمیان وەكو گێڕانەوەکەی ئەبو هورەیرە وایە لای بوخاری، لەگەڵ ئەم دوو جیاوازییە زۆرکەمەدا، جیاوازی دەقی یەکەم: (جَوْفُ رَجُلٍ قَيْحاً) لە (يَرِيَهُ). جیاوازی دەقی دووەمی موسلیم: (جَوْفُ

أَحَدِكُمْ قَيْحاً يَرِيَهُ). بەڵام دەقی سێیەمی موسلیم، سەرەتاکەی تەواو جیایە، بەڵام کۆتاکەی رێك وەك یەکەم و دووەم وایە، لەگەڵ کەمێ جیاوازی (بڕوانە: صحیح مسلم بشرح النووی، ج/١٥ ص/١٤-١٥).

جا ئەوەی کە شێخی عەسقەلانی -ڕەحمەتی خودای لێبێ- لە خاتیمەکانی نامەو سەرباسەکاندا، ئاماژە دەکا، بۆ ئەوە کەئەم حەدیسە و ئەو حەدیسە موسلیم دەری نەهێناوە، بوخاری دەری هێناوە، تەنیا ئەم لایەنە یە، کە لەو صەحابەوە دەری نەهێناوە، چونکە هەموو صەحابەیێ مسندی خۆی هەیە. لەوانەیە موسلیمیش هەمان فەرموودەی دەرهێنایە بەڵام لەسەحابەیەکی ترەوە. جا لەم روانگە و بۆچوونەوەیە، کە عەسقەلانی لەخاتیمەی کتابی ئەدەبدا دەفەرموێ: (لم یوافقِ البخاريَ مُسْلِمَ في تخریج حدیث ابن عمر: لَأَنْ یَمْتَلِيءَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ....) بەڵام مامۆستای عەینی لەکاتی شەرحی ئەم فەرموودەیەدا، بەدەق دەفەرموێ: (وَ أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ عَنْ أَبِي هُرَيرَةً). فەموودەی وایش هەیە هەر لایەکیان دەری هێناوە، ئەویتریان نە بەڕشتە، نەبە دەق، بەبەمەعنا دەری نەهێناوە، وە هۆکانی دەرهێنان و دەرنەهێنانیش زۆر زۆرن.

وەکی تریش (طرفە) و (أطرافە)ی حەدیس، ئەوەیە کە بوخاری، یا موسلیم، یا فەرمووده زانێکی تر، لەکتێبەکەی خۆیدا، حەدیسی لەچەند شوێنێ، بەچەند بۆنەیەکەوە دەگێڕێتەوە، بەیەك رشتە، یا بەچەند رشتەیەکی جیاجیا، بەڵام هەموو رشتەکان مەتنەکەیان هی یەك کەسن و لەموسنەدی یەك کەسن، بەڵام دەچنەوە سەریەك کەس لەکۆتایی‌دا، مەتنی طەرەف و ئەطرافەکانیش، مەرج نییە لەهەموو جێگە کاندا یەك بن، بەڵکو و جاری واهەیە فەرموودەکە بەش بەش دەکرێ، لەهەر شوێنێ بەشێکی ریوایەت دەکرێ، لەتەنیا یەك شوێن دەقی مەتنەکە بەتەواوی دەنووسرێ: (بڕوانە: ژمارە/٤٩ تەجرید = ٥٣ فەتح= بەرگی/ ل/٧٥) کە لەزیادە شوێنا، بەیازدە بۆنەوە، هەرجارەی بوخاری طەرەفێ واتە: بەشێ لەو فەرموودەیە دەگێڕێتەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٨٢- نامەی ڕێخوازی

(بڕ: تاج/١٠ ز/٢٦ هەتا زنجیرە/٣٩).

## باسی سلاو کردن ٭ كِتَابُ الأسْتئذَان

١٩٦٤- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنه عَنْ النَّبِيَ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: قال: يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ. (الحديث ٦٢٣١ طرفاه في: ٦٢٣٢، ٦٢٣٤)[١٩٦٤].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: بابچوك سلاو لەگەورە بكا، لەكاتی بەیەك گەیشتندا، ڕابردوو لەدانیشتوو سلاو بكا، كەمیش سلاو لەزۆر بكا. لە گێڕانەوەیەكی تاج و ریاض دا: باسوار سلاو لەپیادە بكا. (ریاض/٢ ل/٣١٨ ز/١٣٣ – دەستووری سلاوكردن ژ/١/٨٥٧) + (تاج/١٠ ل/١١٨ ز/٣٢ ژ/٣-لەپێشا سلاوكردن ئنجا قسەكردن).

وَ عَنْهُ رَضِي اللّٰهُ عَنه في رِوَايَة: قَال: قَال رَسُولُ اللّٰهِ صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُسَلِّمُ الراكب عَلَى الماشِي، وَ المَاشِي عَلَى القَاعِدِ، وَ القَلِيلُ عَلَى الكَثِيرِ. (الحديث ٦٢٣٢ طرفه في: ١٩٦٤ تجريد = ٦٢٣١ فتح). واتاكەی بەتەواوی لەژمارە: ١٩٦٤ دا ڕابوورد.

١٩٦٥- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِي اللّٰه عَنهمَا أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ صَلّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ قَالَ: تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ

---

[١٩٦٤] اخرجه مسلم في السلام، باب: يسلم الراكب على الماشي و القليل على الكثير، رقم: ٢١٦٠.

وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ. (الحديث ٦٢٣٦ سبق طرفه في رقم/١٢ تجريد = ١٢ فتح = بەرگى/١ ل/٣٣)[١٩٦٥]:

لەوێ بەتەواوى رۆيشت، هێنانەوەى لێرە بەسەرچوونە، بە پێچەوانەى ئەم مەرجەى دانەرى تەجريدە، كە لەپێشەكييەكەى خۆيدا دەفەرموێ: (و إذا اتى الحديث المتكرر أثبته في اول مرة و ان كان في الموضع الثاني زيتادة فيها فائدة ذكرتها و الا فلا...).

## رێخوازى سوننەتە

١٩٦٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه، قَالَ: اِطَّلَعَ رَجُلٌ مِنْ جُحْرٍ فِي جُحَرِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِدْرىً يَحُكُّ بِهِ رَأْسَهُ، فَقَالَ: لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْظُرُ، لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنَيكَ إِنَّمَا جُعِلَ الإِسْتِئْذَانُ مِنْ أَجْلِ البَصَرِ. (الحديث ٦٢٤١ طرفاه في: ٥٩٢٤، ٦٩٠١)[١٩٦٦]:

سەهلى كوڕى سەعد -ڕەزاى خواى لێ بێ- فەرمووى: جارێ پياوێ لەدرزى دەرگاكەى ماڵى پێغەمەرەوە -دروودى خواى لەسەر بێ- سەرەتاتكێى دەكردو، تەماشاى ناوەوەى دەكرد، پێغەمەر -دروودى خواى لەسەر بێ- شانەيەكى ئاسنينى بەدەستەوە بوو سەرى خۆيى پێ دادەهێنا، فەرمووى: ئەگەر دەمزانى كەتۆ تەماشاى ناوەوە دەكەى لەدرزى دەرگاكەوە، ئەم شانەيەم دەكرد بەناوچاوتا، چونكە خوداى گەورە لەبەرچاو، رێخوازى (ڕێپێدان = إستئذان)ى داناوە. (رياض/٢ ل/٣٢٦ ز/١٤٠ ژ/٨٧١/٢/٢ — ش + تاج/٣ ل/٢٢٧ ز/٧ + تاج/١٠ ل/١١٠ ز/٢٨).

---

[١٩٦٥] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان عدد شعب الإيمان و افضلها و أدناها.. رقم: ٣٧.

[١٩٦٦] قال النووي في رياض الصالحين: (متفق عليه). -المترجم-

# داوێنپیسی ئەندامەکان بێجگە لەدامەن

١٩٦٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُما قَالَ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِمَّا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا أَدْرَكَ ذَلِكَ لَا مَحَالَةَ فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ وَالنَّفْسُ تَمَنَّى وَتَشْتَهِي وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ. (الحديث ٦٢٤٣ طرفه في: ٦٦١٢)[١٩٦٧]:

له ئیبنو عەباس -ڕەزای خوایان لێ بێ- پرسیار کرا: مەبەست لە (لَمَمْ) لەم ئایەتەدا چییە، کە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ... (٣١/٥٣) سورة النجم – واتە: خودا لەگوناهە وردەکانی ئەوکەسانە خۆش دەبێ، کە لەگوناهە گەورەکان‌و لەگوناهە ناشیرینە حەیابەرەکان خۆیان دەپارێزن﴾. لێیان پرسی مەبەست لە (لەمەم) لەم ئایەتەدا چییە؟ فەرمووی: شتێکی وام نەدیوە کەلە (لەمەم) بکا، وەك ئەمەی، کە ئەبوهورەیرە، لە پێغەمەرەوە دەیگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (هەموو ئادەمیزادێ خودا بەشی خۆی داوێنپیسی لەچارەی نووسیوە، خواە ناخواە دەشێ ئەوەی تووش ببێ، جا داوێنپیسی چاو برێتییە لەتەمشا کردنی نادروست، داوێنپیسی زمان بریتیە لەقسەکردنی نادروست وە دڵیش ئارەزووی ئەوە دەکاو، دەروونیش ئاوات بۆ ئەو بێ شەرعییە دەخوازێ، لەئەنجاما دامەن (فەرج = عەورەت = شەرمگا)یش ئەمە بەکردەوە بەدی دەهێنێ، یا رەفزی دەکا. (ریاض/٤ ل/١١٩٨ ز/٢٩٠ ژ/١).

---

[١٩٦٧] اخرجه مسلم في القدر، باب: قدر على ابن آدم حظه من الزنا و غيره، رقم/٢٦٥٧.

## سلاو لەمنالان

١٩٦٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّهُ مَرَّ على صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ وقال: كان النبيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يفضلهُ. (الحديث ٦٢٤٧)[١٩٦٨]:

ئەنەسی کوڕی مالیك -ڕەزای خوای لێ بێ- جارێ لەلای کۆمەڵێ منالەوە ڕەت بوو، سلاوی لێ کردن و، فەرمووی: جارێ لەگەڵ پێغەمەردا دەڕۆیشتم، لەلای کۆمەڵێ منالەوە ڕەت بوو، سلاوی لێ کردن. (ریاض/٢ ل/١٥٦ ز/٧١ ژ/٦٠٤/٣/٣ + ب/٢ ز/١٣٦ ل/٣٢١ ژ/٨٦٢/١/٣ - باسی سلاوکردن لەمنالان).

## دەستورو چۆنێتی ڕێخوازی و دانیشتنی ناو کۆڕی دانیشتن

١٩٦٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عبدالله رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي دَيْنٍ كَانَ عَلَى أَبِي، فَدَقَقْتُ البَابَ، فَقَالَ: مَنْ ذَا، فَقُلْتُ: أَنَا. فَقَالَ: أَنَا، أَنَا، كَأَنَّهُ كَرِهَهَا. (الحديث ٦٢٥٠ سبق طرفه في رقم/٩٦٣ تەجرید = ٢١٢٧ فتح = بەرگی/٢ ل/٣٦)[١٩٦٩]:

لێرەدا جابیر -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: چووم بۆ خزمەتی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەپاش مردنی عەبدوڵڵای باوکم، هەتا ڕاوێژی پێ بکەم، لەبارەی دانەوەی ئەو قەرزەی کەوا لەسەر باوکم، جا لەدەرگام دا، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لە ژوورەوە فەرمووی: (ئەوە کێیە؟) منیش گوتم: منم. پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هاتە دەرەوەو وەك کەسێ وەلامەکەی منی پێ ناخۆش بێ، لەبەر خۆیەوە فەرمووی: (منم منم!!). (ریاض/٢ ل/٣٢٩ ز/١٤١ ژمارە/٨٧٧/٤).

---

[١٩٦٨] اخرجه مسلم في السلام، باب: استحباب السلام على الصبيان، رقم: ٢١٦٨.

[١٩٦٩] اخرجه مسلم في الآداب، باب: كراهة قول المستأذن أنا.. رقم: ٢١٥٥.

١٩٧٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنهما عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ الرجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَجْلِسَ فِيهِ وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا. (الحديث ٦٢٦٩ سبق طرفه في: رقم/ ٤٨٠ تەجريد/٩١١ فتح- بەرگی/١ ل/٤٥٤)[١٩٧٠]:

لێرەدا ئەم پترییەی هەیە: بەڵام لەکاتی پێویست دا تەکە تەکە بکەن و، جێگەی یەکتری بکەنەوەو، کەمێ برەوێنەوە، هەتا شوێنی هاتوانی تر لە کۆڕەکەدا ببێتەوە.

١٩٧١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنهما قَال: رَأَيْتُ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِفَنَاءِ الكَعْبَةِ مُحْتَبِياً بِيَدَهُ هكَذَا. (الحديث ٦٢٧٢)[١٩٧١]:

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: لەحەوشەی کابەدا، پێغەمەرم دی، -دروودی خوای لەسەر بێ- بە چیچکانەوە دانیشتبوو، کوروشکەی کردبوو، هەردوو دەستی ئاوا گرتبوو بەبەرئەژنۆی خۆیەوە. واتە: بەدەستی راستی مەچەکی دەستی چەپی لەبەر ئەژنۆیا گرتبوو، لەسەر ئەو شێوەیە بەچیچکانەوە دانیشتبوو.

١٩٧٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ رَضِيَ اللّٰهُ عَنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى رجُلانِ دُونَ الْآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ مِنْ أَجْلِ أَنْ يُحْزِنَهُ. (الحديث ٦٢٩٠)[١٩٧٢]:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: کاتێ سێ کەس بوون، نابێ دوو کەستان بەبێ ئەوی ترتان سرتە بکەن و دوو بەدوو بەبێ ئەوی ترتان قسەی پەنهانی

---

[١٩٧٠] اخرجه مسلم في السلام، باب: تحريم إقامة الإنسان من موضعه المبارح رقم/٢١٧٧.

[١٩٧١] قال العيني: هو من افراده (العمدة/٢٢ ص/٢٥٩) -المترجم-.

[١٩٧٢] اخرجه مسلم في السلام، باب: تحريم مناجاة الإثنين دون الثالث بغير رضاه، رقم/٢١٨٤.

بكەن، چاوەڕوانكەن ئەگەر قسەيەكى نهێنى خۆتان هەبوو مەيكەن هەتا تێكەڵى خەڵكى تر دەبن، ئەوسا دوو بەدوو قسە نهێنيیەكەى خۆتان بكەن، چونكە ئەگەر سێ كەس بن‌و دوانتان چپە چپ بكەن‌و لەوى ترتانى بشارنەوە ئەوە شتى وا دەبێ بەهۆى دڵتەنگى ئەوى ترتان. (رياض/٤ ل/١١٧٩ ز/٢٨١ ژ/٣/ش).

## كوژانەوەى ئاگر لەكاتى خەوتنا

١٩٧٣- عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ عَلَى أَهْلِهِ بِالْمَدِينَةِ مِنَ اللَّيْلِ فَحُدِثَ بِشَأْنِهِمْ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ هَذِهِ النَّارَ إِنَّمَا هِيَ عَدُوٌّ لَكُمْ فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ. (الحديث ٦٢٩٤)[١٩٧٣]:

ئەبو موسا -ڕەزاى خواى لێ بێ- فەرمووى: لەمەدينە شەوێ ماڵێ سووتا بەسەرخاوەنەكەيدا، كەئەم رووداوە يان عەرزى پێغەمەر -درودى خواى لەسەربێ- كرد فەرمووى: ئاگر دوژمنى ئێوەيە، كەدەخەون لەخۆتانى بكوژێننەوە. (رياض/١ ز/١٦ ژ/١٦١/٦ ل/١٥٠- ش) + (ژمارە/١٣٢٤ تجريد = ٣٢٨٠ فەتح = بەرگى/٣ ل/٤٥٢).

١٩٧٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰه عَنهمَا قَالَ رَأَيْتُنِي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَنَيْتُ بِيَدِي بَيْتًا يُكِنُّنِي مِنَ الْمَطَرِ وَيُظِلُّنِي مِنَ الشَّمْسِ مَا أَعَانَنِي عَلَيْهِ أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللّٰهِ. (الحديث ٦٣٠٢)[١٩٧٤]:

ئيبنو عومەر -ڕەزاى خواديان لێ بێ- دەفەرموێ: لەسەردەمى پێغەمەردا -دروودى خواى لەسەر بێ- بەدەستى خۆم خانۆچكەيەكم دروست كرد بۆ

---

[١٩٧٣] اخرجه مسلم في الأشربة، باب: الأمر بتغطية الإناء و إيكاء السقاء... رقم/٢٠١٦.

[١٩٧٤] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عمر في البناء (خاتمة كتاب الاستئذان ج/١٢ ص/٣٧٠). -المترجم-

خۆم، لەزستاندا پەنای لە باران دەدامو، لە هاوینا سێبەری لێ دەکردمو، هەتا ولێی نەدەدام، خۆم نەبێ کەسێکی تر لەدروستکراوانی خودای گەورە یاریدەی نەدام لە دروستکردنی. (تاج/١٠ ل/٢٩٦).

## پایانێ - الخَاتِمَةُ

شێخی عەسقەلانی –ڕەحمەتی خودای لێبێ- لەم پایانەدا دەفەرموێ: نامەی ڕێخوازی (إستئذان) هەشتاو پێنج فەرموودەی بەرزەوە کراوی لەخۆگرتووە، دوازدەیان یابێ ڕشتەن، یا لەبڕیاری بێڕشتەدان، ئەوانی تریان پەیوەستن واتە: موصولن، شەست و پێنج فەرموودەیان دووبارەن، پوختەکەیان بیست فەرموودەیە، پێشەوا موسلیمیش وەك پێشەوا بوخاری –ڕەحمەتی خودا لە هەردوولایان بێ- ئەم پوختەیەی گێڕاوەتەوە، بێجگە لەمانەیان، کە ئێستا لەدواوە دەیانژمێرین، کە ئەم پێنج فەرموودەیەن:

١. فەرموودەی ئەبوهورەیرە: (رَسُولُ الرَّجُلِ إِذْنُهُ) وا لەپێش ژمارە: ٦٢٤٦ فەتح.

٢. فەرموودەی ئەنەس، لەبارەی موصافەحەو تەوقەکردنەوە = ٦٢٦٣ فەتح.

٣. ژمارە/١٩٧١ تەجرید = ٦٢٧٢ فەتح = فەرموودەی ئیبنو عومەر، لەبارەی (إِحْتِبَاء)ەوە.

٤. ژمارە/ ١٩٧٤ تەجرید = ٦٣٠٢ فەتح. فەرموودەکەی ئیبنو عومەر - ڕەزای خوادایان لێ بێ- لەبارەی دروستکردنی خانووەکەی.

٥. فەرموودەی ژمارە/ ٦٣٠٠ فەتح = قُبِضَ النَّبِيُّ وَأَنَا خَتِينٌ.

بسم الله الرحمن الرحيم

## نامەی نزاو دووعا

پێشەکی بڕوانە: بەرگی/٩ ل/١٨٠ ز/٦٦ -باسی دوعاو نزا- تاجول ئوصولّ بەکوردی. هەتا لاپەڕە: ٢٥٢ کۆتایی زنجیرە:٨٨ + ریاض/٣-کوردی ل/١٠٥٠ ز/٢٥٠ هەتا لاپەڕە/١٠٧٢ کۆتایی زنجیرە/٢٥٢) = كِتَاب الدَّعَوَاتِ چاپی یەکەم = چاپی دووەم ل/٣١٨ ژ/١٤٦٧/٣/٣ هەتا ل/٣٤١ ژ/١٥٠٢/٧/٧.

١٩٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّم قال: لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ يَدْعُو بِهَاو أُرِيدُ أَنْ أَختبِئ دَعْوَتِي لِأُمَتِي فِي الآخِرةِ. (الحديث ٦٣٠٤ طرفه في: ٧٤٧٤)[١٩٧٥].

له ئەبو هورەیرەوە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەپێغەمەرەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: هەموو پێغەمەرێ نزاو پاڕانەوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، کە خودا گیرای دەکا لێی، هەموو پێغەمەرەکانی تر نزاکەی خۆیانیان بەزوویی لەدنیادا کردووەو نزاکەیان قەبوولکراوە، بەڵام من نزاکەی خۆمم هەڵگرتووە بۆ ڕۆژی قیامەت، لەوێ تکای پێ دەکەم بۆ ئۆمەتم، ئیتر ئەوەی لە ئۆمەتم لەسەر ئیمان‌و باوەڕی ڕاست بمرێ و هیچ هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکا -خودا حەزکا- ئەوە ئەوکەسە بەر ئەم تکاو شەفاعەتەی منە دەکەوێ!.
(تاج/٤ ل/٢٧٧ ز/٩١ ژ/١ -باسی دڵسۆزی پێغەمەر بۆ گەلی خۆی).

١٩٧٦- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ رَضِي اللَّه عَنه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: سَيِّدُ الِاسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ) قَالَ وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ

---

[١٩٧٥] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: اختباء النبيُ صلى اللهُ عليهِ وسلمَ دعوة الشفاعة لأمته رقم: ١٩٨، ١٩٩.

مُوقِنًا بِهَا فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ. (الحديث ٦٣٠٦ طرفه في: ٦٣٢٣)[١٩٧٦].

شەددادی کوڕی ئەوس -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: پاڕانەوەی هەرە گەورەو سەروەری گوناهپۆشی ئەوەیە کە بەندە بە سۆزی دڵ بڵێ: (اللّهُمَّ أَنتَ رَبِّيْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَ أَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَ وَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَ أَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْلِي فَإِنَّهُ لاَيَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنتَ: خوداوەندم! هەرتۆ پەروەردگاری منیت، لەتۆ زیاتر خوای ترنییە، من بەندەو عەبدی تۆم و تۆ منت لەنەبوون دروست کردووە، تا بتوانم پەیمان و بەڵێنی تۆ ناشکێنم! کە نەشم توانی ئەوە لەدەساوسانیمە، چونکە ستەمە کە بەندە بتوانێ تەواوی ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ بهێنێ، پەنا دەگرم بەتۆ لەشەڕی کردەوەی خۆم، کەدەبێ بەمایەی سزاو تۆڵە بۆم، تۆ سەرچاوەی نازو نیعمەتی بۆمن و، هەمیشە چاکەو نیعمەتی بێ شوماری تۆم لەبەرچاوەو، پێ دەنێم لەگوناهباریی خۆم، کەواتە: لێم خۆش بە، بەڕاستی تۆ نەبی کەسی تر ناتوانێ و هیچ کەس رادەی ئەوەی ناکەوێ کە لەگوناهی بەندەی خودا خۆش بێ).

پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: هەرکەسێ لەرۆژدا ئەمە بەدەم بڵێ، وە بەدڵ باوەڕی تەواوی پێی هەبێ، وە بەر لەهاتنی شەو، لەو رۆژەدا بمرێ، ئەوە بەهەشتییە، وە هەرکەسێ -بەشەو- ئەمە بڵێ، وە بەدڵ باوەڕی پێی هەبێ، وە لەبەرهاتنی رۆژ بمرێ، ئەوە بەهەشتییە. (ریاض/٤ ل/١٣٨٦ ژ/٣٧١ -نامەی پاڕانەوەو داوای لێبووردن. چاپی یەکەم = چاپی دووەم ل/٢٦٥ ژ/١٨٧٥/٧/).

---

[١٩٧٦] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث شداد بن أوس (سيد الاستغفار..). خاتمة كتاب الدعوات، فتح/١٢ ص/٥٣٢. -المترجم-

روونكردنەوە:

شەددادی كوڕی ئەوسی كوڕی سابیت ی خەزرەجی، پیاوێكی زانای دانای تێكۆشەر بوو، بەتایبەتی لەخواپەرستیدا، برازای حەسانی كوڕی سابیتە، كە شاعیری پێغەمەر بوو، ئەوسی باوكیشی هاوڕێی پێغەمەر بوو، وە لەغەزای ئوحوددا شەهید كرا، شەدداد یەكێك بوو لەزانا حەلیمو هێمنەكان، شەدداد دەیفەرموو: جارێ زۆر نەخۆش بووم، لەگیانەلادا بووم، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- تەشریفی هات، فەرمووی: ئەی شەدداد ئەوە چیتە؟ گوتم: دنیام تەواو لێتەنگ بووە. پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: تۆقەی ناكەی، بەم نەخۆشینە نامریت، بەڵكوو چاك دەبێتەوە، شام ئازاد دەكرێ، بیتولەقدیس ئازاد دەكرێ، تۆو منالەكانی تۆ لەناویانا دەبن بەپێشەنگ و پێشەوایان. وە پێغەمەر چۆنی فەرموو وابوو، بەغەوی -بەرەحمەت بێ- دەفەرموێ: شەدداد لەحمص نیشتەجێ بوو، ئەبو نەعیم دەفەرموێ: لەفەلەستین مردووە، لەسەردەمی جێنیشینی موعاویەدا. ئیبنوحەبان دەفەرموێ: ساڵی پەنجاو هەشتی كۆچی لەبەیتول مەقدیس بەخاك سپێردرا تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵ بوو. رەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێ- (بڕ: إصابة في تمييز الصحابة).

١٩٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ وَاللَّهِ إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً. (الحديث ٦٣٠٧)[١٩٧٧].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەپێغەمەرەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: بەخودا بەیەزدانی پاك من بەش بەحاڵی خۆم، زۆر دەپاڕێمەوە، ڕۆژی واهەیە پتر لەحەفتا جار لەخودا دەپاڕێمەوە و داوای

---

[١٩٧٧] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي هريرة في عدد الاستغفار كل يوم (خاتمة كتاب الدعوات ج/١٢ ص/٥٣٢). -المترجم

لێخۆشبوونی لێ دەکەم‌و تەوبەی لەخزمەتدا نوێ دەکەمەوە، نەبادا بەهەڵە هەڵەیەکم کردبێ، یالەکردنی ئەرکی سەرشانی خۆمدا درێغیم کردبێ. (تاج/٩ ل/٢٥٣ ژ/٢ ز/٨٩ - باسی پاڕانەوەو پەشیمانی).

## باسی: تەوبە و پەشیمانی

١٩٧٨- عَنْ عَبْدُاللّٰهِ بْنُ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنه أَنَّهُ حَدَّثَ حَدِيثَيْنِ أَحَدُهُمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْآخَرُ عَنْ نَفْسِهِ قَالَ إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَأَنَّهُ قَاعِدٌ تَحْتَ جَبَلٍ يَخَافُ أَنْ يَقَعَ عَلَيْهِ وَإِنَّ الْفَاجِرَ يَرَى ذُنُوبَهُ كَذُبَابٍ مَرَّ عَلَى أَنْفِهِ فَقَالَ بِهِ هَكَذَا ثُمَّ قَالَ لَلّٰهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ مِنْ رَجُلٍ نَزَلَ مَنْزِلًا وَبِهِ مَهْلَكَةٌ وَمَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ فَوَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ نَوْمَةً فَاسْتَيْقَظَ وَقَدْ ذَهَبَتْ رَاحِلَتُهُ حَتَّى إِذَا اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْحَرُّ وَالْعَطَشُ أَوْ مَا شَاءَ اللّٰهُ قَالَ أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِي فَرَجَعَ فَنَامَ نَوْمَةً ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَإِذَا رَاحِلَتُهُ عِنْدَهُ. (الحديث ٦٣٠٨)[١٩٧٨].

حاریسی کوڕی سوومید -ڕەحمەتی خودای لێبێ- فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود -ڕەزای خوای لێ بێ- دووفەرموودەی گێڕایەوە بۆمان: یەکێکیان فەرمایشتی پێغەمەر بوو، ئەوی تریان قسەی خۆی بوو، ئیبنو مەسعوود فەرمووی: مرۆی موسڵمان، گوناهی خۆی وەك کێوێ دەبینێ، کەلەبنیا دانیشتبێ، مەترسی ئەوەی هەبێ کە بڕوخێ بەسەریا. واتە: موسوڵمان دڵی ڕووناکە هیچ گوناهێ بەبچووك نازانێ، لەبەرئەوە هەمیشە پارێزدەکا لەگوناه. بەڵام بەدکار، گوناهی خۆی بێ ئەهمیەت دەبینێ، دەربەستی نییە بەلایەوە وەك مێشێ بەلای لووتیا بڕواو بەدەستی ئاوایەکی لێ بکا ئاوایە!!

---

[١٩٧٨] أخرجه مسلم في التوبة، باب: في الحض على التوبة و الفرح فيها، رقم: ٢٧٤٤.

ئەوجا ئیبنو مەسعوود فەرموویە وە: خودا پتر شادمان دەبێ بەتەوبەی بەندەی خۆی، کاتێ پەشیمان دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا، هەتا ئەو پیاوە، کە لەهەوارێ دادەبەزێ، شوێنێکی تالووکەی لێدەبێ، نان و ئاوەکەی بەسەر وڵاخەکەیەوە دەبێ، سەرێ دەنێتەوە، تاوێ دەخەوێ، سەرخەوێ دەشکێنێ، کاتێ خەبەری دەبێتەوە، لەخەو هەڵ دەستێ، دەڕوانی وڵاخەکەی بەنان و ئاوەکەیەوە رۆیشتووەو نەماوە! جاکاتێ بەدوای دا دەگەڕێ و لێی نائومێد دەبێ و گەرماوتوونێتی زۆری بۆ دێنێ، یا ئەوەی کە حەزی خودای لەسەر بوو بەسەری دێ، وە دەگاتە حاڵی مردن. لەبەرماندوویی و شەکەتی و توونێتی و برسێتی، دەڵێ: بابگەڕێمەوە بۆ جێگەکەی پێشووی خۆم، دەگەڕێتەوە بۆئەوێ، لەوێ دەنوێ، لەپاشا کەخەبەری دەبێتەوە و سەری هەڵ دەبڕێ، دەبینێ وڵاخەکەی بەنان و ئاوەکەیەوە لەدیاری لەلایا ڕاوەستاوە، خودا بەتۆبەی بەندەی خۆی شادمانتر دەبێ، هەتا ئەم پیاوە لێقەوماوە بەدۆزینەوەی وڵاخەی بەنان و ئاوەکەیەوە، لەو بیابانە چۆڵ و هۆڵەدا. (تاج/٩ ز/٩٠ ل/٢٥٨ ژ/١-باسی گەورەیی تەوبەو پەشیمانی) + (ریاض/١ ز/٢ ل/٢٢ ژ/١٥/٣).

## دەست دانان لەژێر کوڵمی ڕاستا

١٩٧٩- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ. (الحديث ٦٣١٤ أطرافه في: ٦٣١٢، ٦٣٢٤، ٧٣٩٤)[1979].

---

(1979) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث حذيفة في القول عند النوم خاتمة كتاب الدعوات ج/١٢ ص/٥٣٢ ط.ج. -المترجم-

حوزەیفـەی کـوڕی یـەمان -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: گـەلێ جـار حـەزرەت -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- کەبەشـەو دەچـووە سـەرپێخەفەکەی، دەستی ڕاستی دەنایە ژێر کوڵمی ڕاستی و ئەوجا دەیفـەرموو: (اللَّهُـمَّ بِاسْـمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا: خودایە! بە پیرۆزی ناوی تۆ دەمرمو دەژیم) کاتـێ کەلەخـەویش خەبەری دەبۆوە دەیفەرموو: (الحمدُ لِلّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ: سـوپاس بـۆ ئەوخودایـەی کەلـەم خـەوە خەبـەری کردینـەوە، لـەپاش ئـەوە کەخـەوی لێ خـستین، هـەموومان لەئـەنجاما دەچـینەوە دیـوانی خـودا خـۆی! (ریاض/٢ ل/٢٩٧) = ز/١٢٧ ژ/٤/٨١٧.

## نوستن لەسەر لای ڕاست

١٩٨٠- عَنْ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهما قَـال: كـان رسـول الله صَـلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إذا أَوَى إلى فِرَاشِهِ نَامَ على شِقِهِ الأَيْمَنِ، ثم قَـال: (اللَّهُـمَّ أَسْـلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ لَا مَلْجَا وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ آمَنْتُ بِكِتَابِـكَ الَّـذِي أَنْزَلْـتَ وَبِنَبِيِّـكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ). (الحديث ٦٣١٥ تقدم طرفه في رقـم: ١٧٨ تجريـد= ٢٤٧ فـتح الباري = بەرگی/١ ل/١٩٥ بالكامل)[1980].

## نزاکردن کاتێ لەخەو خەبەری بۆوە

١٩٨١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّه عَنهمَا قَالَ بِتُّ عِنْدَ مَيْمُونَةَ فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَى حَاجَتَهُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ ثُمَّ نَامَ ثُمَّ قَـامَ فَـأَتَى الْقِرْبَـةَ فَـأَطْلَقَ شِنَاقَهَا ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءًا بَيْنَ وُضُوءَيْنِ لَمْ يُكْثِرْ وَقَـدْ أَبْلَـغَ فَـصَلَّى فَقُمْـتُ فَتَمَطَّيْـتُ

---

[1980] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: ما يقول عند النوم و اخذ المضجع، رقم/٢٧١٠.

كَرَاهِيَةَ أَنْ يَرَى أَنِّي كُنْتُ أَتَّقِيهِ فَتَوَضَّأْتُ فَقَامَ يُصَلِّي فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ فَأَخَذَ بِأُذُنِي فَأَدَارَنِي عَنْ يَمِينِهِ فَتَتَامَّتْ صَلَاتُهُ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ فَآذَنَهُ بِلَالٌ بِالصَّلَاةِ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ وَكَانَ يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي بَصَرِي نُورًا وَفِي سَمْعِي نُورًا وَعَنْ يَمِينِي نُورًا وَعَنْ يَسَارِي نُورًا وَفَوْقِي نُورًا وَتَحْتِي نُورًا وَأَمَامِي نُورًا وَخَلْفِي نُورًا وَاجْعَلْ لِي نُورًا .
(الحديث ٦٣١٦ سبق طرفه في: ٩٨ تجريد = ١١٧ فتح الباري = بەرگی/١ ل/١١٩ + رقم/١١٢ ت = ١٣٨ ف = بەرگی/١ ل/١٣٧ + ژ/١٨٣ تجريد = ١٣٨ فەتح = بەرگی/١ ل/١٥٩)[١٩٨١]:

ئیبنو عەباس -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: شەوێ لەماڵی مەیموونەی پوورم بووم، کە هاوسەری پێغەمەر بوو، لەوێ نووستم، خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- هەستا، دەستی بەئاو گەیاند، ئەوجا هەردوو دەستو دەموچاوی خۆی شۆرد و ئەوجا خەوت، لەپاشا هەڵسا بۆشەو نوێژ، چوو بۆلای کوندەکە، دەمبێنەکەی کردەوە، ئەوجا خۆی لەئاوی کوندەکە بەبێ ئەوە کەسێ یاریدەی بدا دەسنوێژێکی مامناوەندی، نە زۆر تەواو، نەزۆر کەم و کورتی گرت، ئەوجا دەستی کرد بەنوێژ کردن، جا منیش بۆئەوەی کەنەبادا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وابزانێ کە من لەوماوەدا سەرەنجی ئەوم داوەو تەماشایم کردووە، کەهەڵسام دەستم کرد بە خۆکشان و خۆبادان بەم دیو و ئەو دیودا، وەك کەسێ تازە لەخەو هەڵسابێ ئاوا، جا دەسنوێژێکم گرت، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هەڵسا نوێژی تری دابەست، منیش چووم لەلای چەپیەوە نوێژم لەپشتیەوە بەجەماعەت دابەست، جا حەزرەت - دروودی خوای لەسەر بێ- بەدەستی راستی گوێچکەی گرتمو بردمی بۆلای راستی خۆی، هەتا لەلای ڕاستیەوە لەجەماعەتەکەدا ڕابوەستم، جا تەواوی

[١٩٨١] اخرجه مسلم في صلاة المسافرين و قصرها، باب: الدعاء في صلاة الليل و قيامه، رقم:٧٦٣.

شەونوێژەکەی کەبوو بەسیازدە رکات ئیتر راکشایەوەو خەوتەوە، لەناو خەوەکەیدا دەستی کرد بە پرخە پرخ، چونکە زۆرجار کەپێغەمەر دەخەوت پرخە پرخی دەکردو، لەناو خەوەکەیدا پفی دەکرد، ئیتر ڕاکشا هەتا بیلال هات ئاگاداری کردەوە کەکاتی نوێژی بەیانی یە، بفەرموو وەرە بۆ نوێژ، ئیتر هەر بەدەسنوێژی شەونوێژەکەی نوێژی بەیانیشی کرد، وە دەسنوێژی تری نەگرتەوە. لەنزاو پاڕانەوەکەی شەوانەیشیا دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُوراً، وَ فِي بَصَرِي نُوراً، وفِي سَمْعِي نُوراً، وَعَنْ يَمِينِي نُوراً، وعن يَسَارِي نوراً وَفَوْقِي نُوراً، وَتَحْتِي نُوراً، وَ أَمَامِي نُوراً، وَخَلْفِي نُوراً، واجْعَلْ لِي نُوراً: ئەی پەروەردگارم! پڕدڵ و زمان و گوێچکەو چاوم لەنوورو رووناکی بکە، هەروەها سەرو ژێرو راستو چەپو بەردەمو پشتم، هەروەها دڵ و دەروونو هەناوم لە نوور کەیلکەو نوقم و غەرقی ناو نوورم بفەرموو). (تاج/١ ل/٥٠٣ ز/١٨٤ ژ/٢-م/د/ت – خوێندنی قورئان و نزاو پاڕانەوە لەشەودا).

١٩٨٢– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ ثُمَّ يَقُولُ: بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ. (الحديث ٦٣٢٠ طرفه في: ٧٣٩٣)[١٩٨٢].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرموویی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: کاتێ یەکێ لەئێوە دەیەوێ بچێتە ناو نوێنەکەیەوە، بابەچمکی ناوەوەی جلەکەی، یا بە هەرشتێکی تر، نوێنەکەی بتەکێنێ، چونکە ئێوە نازانن کەلەپاش ئێوە نوێنەکە چی تری تێ دەچێ، لەوانەیە مارێ، یا دووپشکێ، یا گەزندەیێ، یا ئازارێکی تری تێ چووبێ، جا کە

---

[١٩٨٢] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: ما يقول عند النوم و اخذ المضجع، رقم: ٢٧١٤.

نوێنەکەی هەڵ تەکانە ئەوجا بابڵێ: بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْها بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّلِحِينَ: ئەی پەروەردگارم! بە پیرۆزی ناوی پیرۆزی تۆ، تەنیشتی خۆم لەسەر ئەم نوێنە دادەنێم و دەخەوم، وە بەپشتی تۆ بەرزی دەکەمەوەو هەڵ دەسم لەخەو، خودایە: ئەگەر گیانم گل دەدەیتەوەو لەم خەوەدا گیانم دەکێشی، ئەوا بەڕەحمەتی خۆت رەحمی پێ بکە، وە ئەگەر بەرەڵای دەکەیتەوە و لەم خەوە خەبەرم دەکەیتەوە ئەوا بیپارێزە و بەوەی کە ئاگاداریی بەندە باشەکانی خۆتی پێ دەکەی ئاگاداری ئەویش بکە. (تاج/٨ ل/٢٦ ز/٨ ژ/٣ — دەستووری نزای نووستن).

## جەخت کردن لەنزادا

١٩٨٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي إِنْ شِئْتَ لِيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ فَإِنَّهُ لَا مُكْرِهَ لَهُ. (الحديث ٦٣٣٩ طرفه في: ٧٤٧٧)[١٩٨٣]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەحەزرەتەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: کەستان مەڵێن، لەکاتی نزاو پاڕانەوەدا، خودایە! ئەگەر خۆت ئارەزوو دەکەی لێم خۆشبە: خودایە: ئەگەر خۆت ئارەزوودەکەی رەحمم پێبکە، داواکەتان یەك لایی بکەنەوەو سوور بن لەسەری و بەجەخت داوا لەخودا بکەنو ئەگەر و مەگەر لەدووعا و پاڕانەوەدا مەکەن، بەڵکوو بەبێ بەندو مەرجو تەعلیق بەشتێکەوە، داوای شت لەخودا بکەن، وەك ئەوە بڵێن: خودایە: لەگوناهمان خۆشبە، زیندوومان سەلامەتکە، لەمردوومان خۆشبە،

---

[١٩٨٣] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: العزم بالدعاء، ولا يقل: إن شيئت... رقم/٢٦٧٩.

شیفای نەخۆشمان بدە، دڵو ماڵو وڵاتمان ئاوەدان بفەرموو، چونکە کەس زۆری لەسەر خودانییە، تۆ بڵێیت و نەڵێیت، خودا ئەگەر مەیلی لەسەر شتێ نەبێ نایکا. (تاج/٩ ل/١٨٦ ز/٦٧ ژ/١٠ – دەستوورو یاسای نزاو پاڕانەوە).

١٩٨٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ فَيَقُولُ قَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي. (الحديث ٦٣٤٠)[1984].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: نزاو پاڕانەوەو دۆعاتان گیراو قبوڵ دەبێ، بەمەرجێ پەلە پەل نەکەن، وەك ئەوە بڵێن: من هەر دووعا دەکەم و هەرگیرانەبوو!. واتە: بەردەوام بوون لەسەر دووعاو کۆڵ نەدان لەپاڕانەوە نیشانەی گیرابوونیەتی. (تاج/٩ ز/٦٧ ل/١٨٦ ژ/١١) + (ریاض/٣ ل/١٠٧٠ ز/٢٥٢ ژ/٤).

## نزای کاتی خەمو خەفەت

١٩٨٥– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّه عَنهمَا قَالَ كَانَ أَنَّ رسول الله صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كان يقول عِنْدَ الْكَرْبِ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ العرش العظيم لا إله إلا الله رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الكريم. (الحديث ٦٣٤٥ أطرافه في: ٦٣٤٦، ٧٤٢٦، ٧٤٣١)[1985].

ئیبنو عەباس -ڕەزای خودا لەخۆیو باوکی- دەفەرموێ: دەستوری پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وابوو: لەکاتی سەخڵەتی و دڵتەنگیو مەینەتدا دەیفەرموو: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ العَظِيمُ الحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ العَرْشِ العَظِيمِ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرْضِ وَرَبُّ العَرْشِ الكَرِيمِ: خودای

[1984] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء.. باب: بيان انه يستجاب لكم مالم.. رقم/٢٧٣٥.

[1985] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: دعاء الكرب، رقم/٢٧٣٠.

بەهـەق بـەس يـەزدانی پاکـە، کـە خودايـەکی گـەورەو خـاوەن حـيلم‌و حەوسەڵەیە، خودای بەهەق هەر یەزدانی پاکە، کە خاوەنی عەرشی مەزنـە، کە تەخت‌و بارەگای حوکمڕانی خۆیەتی، خودای بەهەق بەس یـەزدانی پاکـە، کە خاوەنی یەك بەیەکی گشت ئاسمانـەکان و زەمینـە، کـە خـاوەنی عـەرش‌و بارەگـای نـازداری خودایـە). (ریـاض/٣ ل/١٠٧١ ز/٢٥٢ ژ/٧ = چـاپی دووەم ل/٣٤١ ژ/١٥٠٢/٧/٧ + = تاج/٩ ل/٢١٤ ز/٧٢ ژ/١ – نزاکانی مەینەتبار).

## چۆنێتی پەناگرتن بەخوا

١٩٨٦– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قال: كانَ رسول الله صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَعَوَّذُ مِـنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ. وَدَرَكِ الشِّقَاءِ وسوءِ القضاء، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ. (الحديث ٦٣٤٧ طرفه في: ٦٦١٦)[١٩٨٦]:

ئەبو هورەیەر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: یاساو دەستووری پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- وابوو: ئاوا زۆرتـرین کـات پـەنای دەگـرت بـەخودا: دەیفـەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَهْدِ الـبَلاَءِ وَ دَرَكِ الـشِّقَاءِ وَسُـوءِ القَـضَاءِ وَشَـمَاتَةِ الأَعْـدَاءِ: خودایـە: پـەنادەگرم بـەتۆ لەبـەڵای بڕسبڕو، لـە توشـبوونی نەگبـەتی‌و، لەیەخـەگرتنی چـارە ڕەشـی‌و، لــە چارەنووسـی خـراپ‌و، لەپێخۆشـبوون‌و شـادەکامیی دوژمنـان. (تـاج/٩ ل/٢٠٧ ز/٧١ ژ/١-ش/ن) + (ریاض/٣ ل/١٠٥٤).

١٩٨٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ النبيّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ اللَّهُمَّ فَأَيُّمَا عَبْدٍ مُؤْمِنٍ سَبَبْتُهُ فَاجْعَلْ ذَلِكَ لَهُ قُرْبَةً إِلَيْكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. (الحديث ٦٣٦١)[١٩٨٧]:

---

[١٩٨٦] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: التعوذ من سوء القضاء. رقم/ ٢٧٠٧.

[١٩٨٧] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب: من لعنه النبيُّ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَمَ او شبه ..رقم/٢٦٠١.

ئـەبو هـورەیرە -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم ژنـەوتم لەزاری پیرۆزی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: ئەی خودایە! هەرموسوڵمانێ، لەبەر هەر هۆیێ، جمێنـێکم پـێدا، یا نـەفرەتو لەعنـەتێکم لێکرد، یاهـەر ئـازارێکی تـرم دا، ئـەوەی بـۆ بکـە بەکـەفارەتی گونـاە و بـەهۆی نزیکبوونەوە لەخۆت لەرۆژی قیامەتدا.

١٩٨٨- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَأْمُرُ بِهؤُلاَءِ الكَلِماتِ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِـنَ الْجُبْنِ وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ وَأَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ فِتْنَـةِ الـدُّنْيَا يَعْنِـي فِتْنَـةَ الدَّجَّالِ وَأَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ عَـذَابِ الْقَبْـرِ). (الحـديث ٦٣٧٠ أطرافـه في: ٢٨٢٢، ٦٣٦٥، ٦٣٧٤، ٦٣٩٠)[1988].

سەعدی کوڕی ئـەبو وەقـاص -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: پێغەمـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی پێمان دەکرد کەئەم ڕستەو وشانە لـەنزاو پاڕانەوەماندا بڵێین و پەنابگرین بە خوالێیان: اللَّهُمَ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ البُخْـلِ، وَ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ، وَ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْزَلِ العُمُرِ، وَ أَعُوذُ بِكَ مِـنْ فِتْنَـةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَـذَابِ القَبْـرِ: خودایـە: پـەنا دەگـرم بـەتۆ لـە ڕەزیلـی و چرووکی و، لەترسنۆکی و لـەوەی کـە بگەمـە تەمـەنی کەسیفی، هـەروا پـەنا دەگرم بە تۆ لە ئاژاوە گەورەکەی جیهان، واتە: لەجـەجاڵ، و پـەنادەگرم بـەتۆ لە سزای گۆڕ.

١٩٨٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْهَا أَنَّ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَـانَ يَقُولُ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ وَالْمَـأْثَمِ وَالْمَغْـرَمِ وَمِـنْ فِتْنَـةِ الْقَبْـرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى وَأَعُوذُ بِكَ مِـنْ فِتْنَـةِ

---

[1988] قال النووي في رياض الصالحين: (رواه البخاري)(رياض/٣ ل/٢٨٥ ژ/١٤٢١/١٤).
-المترجم-

الْفَقْرِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ اللَّهُمَّ اغْسِلْ عَنِّي خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ). (الحديث ٦٣٧٧ سبق طرفه في رقم/٤٤٧ تجريد = ٨٣٢ فتح الباري = بەرگی/١ ل/٤٢٦)[١٩٨٩]:

عائیشه -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرموی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەستووری وابوو دەیفەرموو: خودایە: پەنادەگرم بەتۆ لەتەمەڵی و تەوەزەلی و، لەتەمەنی کەسیفی و ئیفتادەیی و، لەگوناهباری واتاوانباری و لەقەرزاری و قەرزکوێری و، لەئاژاوە و فەرتەنەی ناوگۆڕو، لەسزای گۆڕو، لەگرفتار بوون بەئاگری دۆزەخ و، لەسزای ئاگری دۆزەخ و، لەشەڕی ئاژاوەو ئاشووبی دەوڵەمەندیی ماڵی غەزەب، هەروەها پەنادەگرم بە تۆ لەگرفتاری هەژاری، کەمرۆ تووشی ئاژاوە دەکا، پەنادەگرم بەتۆ لەفەرتەنەی ججاڵە کوێر، خودایە: لەباتی من، بەرەحمەت و سۆز و میهرەبانی خۆت گوناهەکانم بەئاوی بەفرو تەرزە بشۆرەوە، وەك چۆن شتێ بەئاو بەئاوی بەفرو تەرزە بشۆردرێ، تەواو پاك دەبێتەوە ئاوا، دڵم لەتاوان پاك بکەرەوە، وەك بلووری بێ گەرد و بلووری پاکی سپی، هەروەها لەگوناه دوورم بخەرەوە وەك دووریی خۆرهەڵات و خۆرئاوا لەیەکتری. (تاج/٩ ز/٧١ ل/٢٠٨ ز/٣ — ش/د/ت/ن — ئەو گوتە حەدیسی یانەی کە بەکاردەهێنرێن بۆ پەناگرتن بەخودای گەورە).

---

[١٩٨٩] أخرجه مسلم في المساجد و مواضع الصلاة، باب: ما يستعاذ منه في الصلاة، رقم/٥٨٩.

# نزای کۆکیر - جوامع الدعاء

۱۹۹۰– عَنْ أَنسٍ رَضِي اللّٰهُ عَنه قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ النَّبِيِّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ. (الحديث ٦٣٩٩ طرفه في ٦٣٩٨)[١٩٩٠]:

۱۹۹۱– عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري رَضِي اللّٰهُ عَنه عَنِ النَّبِيِّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي هَزْلِي وَجِدِّي وَخَطَايَايَ وَعَمْدِي وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي). (الحديث ٦٣٨٩ – سبق طرفه في: ١٦٤١ تجريد = ٤٥٢٢ فتح = بەرگی/٤ ل/٤١٨ لەوێ ڕابورد)[١٩٩١]:

ئەبو موسا ی ئەشعەری -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- گەلێ جار ئەم نزایەی دەکرد، دەیفەرموو: اللهم اغفر لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَ إِسْرَافِي فِي أَمْرِي، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللهُمَّ اغْفِر لِي هَزْلِي وَجِدِّي، وَخَطَايَايَ، وَعَمْدِي، وكُلُّ ذلِكَ عِنْدِي: ئەی پەروەدگارم: خۆشبەلێم، خۆشبە لە تاوانم، لەنادانی و نەفامیم، لە زیادەڕەوی و پێلێهەڵبڕینم لەهەموو کارێکا، لەوەی کەتۆ خۆت باشتری دەزانی لەمن، خودایە: تاوانەکانم هەموو بپۆشە، چ بەعەمد و ئەنقەست بن، چ بە نەزانی بن، چ بە گاڵتەوەبن، وە ئەم جۆرە تاوانەشم هەموو هەن. (تاج/٩ ل/١٩٥ ز/٧٠ ژ/٣ – نزای پڕواتا).

۱۹۹۲– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰه عَنه أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ وَكُتِبَ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ وَلَمْ

---

[١٩٩٠] و اخرجه مسلم من طريق اسماعيل بن علية عن عبدالعزيز (فتح الباري – ج/١٢ ص/٤٨٧ شرح الحديث ٦٣٨٩) –المترجم–

[١٩٩١] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب/ التعوذ من شر ما عمل، رقم/٢٧١٩.

يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ إِلَّا رَجُلٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْهُ. (الحديث ٦٤٠٣ طرفه في: ٣٢٩٣)[١٩٩٢].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: هەرکەسێ هەر ڕۆژێ سەد جار بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٍ) هەرخودا خودایەو بەس، هاوبەشی نییە، موڵك و پاشایی و سوپاس هەر بۆخۆیەتی، وەخودا تەواناى هەموو شتێکی هەیە، هەرکەسێ هەر ڕۆژێ سەدجار ئەم یادە پیرۆزە بڵێ، خێری ئازادکردنی دە بەندە (کۆیلە)ی هەیە، وەسەد چاکەی تریشی بۆ دەنوسرێ، وە سەد خراپەیشی لێ دەکوژێتەوە، وە ئەوڕۆژەیش هەتا ئێوارێ ئەو زیکرە دەبێ بەپەرژین و پەنا بۆی و دەیپارێزێ لەشەیتان وە کەسیش ئەو ڕۆژە کردەوەی باشتری نەهێناوە بۆ دیوانی خودا، مەگەر کەسێ کەلەو یادو زیکرەی زیاتر کردبێ!.

١٩٩٣- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ، و ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهما، قَالا في هذا الحديثِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: مَنْ قَالَ عَشْراً كَانَ كَمَنْ أَعتَقَ رَقَبَةً مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ. (الحديث ٦٤٠٤)[١٩٩٣].

ئەبو ئەیوبی ئەنصاریو ئیبنو مەسعوود —ڕەزای خودایان لێبێ- فەرموویان لەم فورموودەیەدا، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی (کەسێ دەجار لەم زیکرە بڵێ وەك کەسێ وایە کە گەردنی کۆیلەیەکی لەکۆتی دیلیو بەندەیی ئازادکردبێ، کەئەو کۆیلەیە لەبنەڕەتدا لەنەوەی حەزرەتی ئیسماعیل باپیرەگەورەی پێغەمەر بێ، دیارە کە ئازادکردنی کۆیلەی وا

---

[١٩٩٢] أخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة: باب: فضل التهليل و التسبيح والدعاء، رقم: ٢٦٩١.

[١٩٩٢] أخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: فضل التهليل و التسبيح و الدعاء، رقم:٢٦٩٣.

کەلەنەوەی ئیسماعیل پێغەمەر بێ -دروودی خوای لەسەر بێ- خێری زیاترە، لەئازاد کردنی کۆیلەی ئاسایی.

١٩٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰه عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَالَ (سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ) فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ. (الحديث ٦٤٠٥)[١٩٩٤]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: هەرکەسێ، هەر ڕۆژێ، سەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ) پاکیو پیرۆزی و بێگەردی لەهەموو نەنگو کەمو کوڕییەك و سوپاسو ستایش، هەر بۆیەزدانی پاکە، هەرکەسێ، هەر ڕۆژێ سەدجار ئەم یادە بڵێ، گوناه و تاوانەکانی لێ هەڵ دەروەن، با بەوێنەی کەفی دەریاش گوناهی زۆربن. (ریاض/٣ ل/١٠٤١ ز/٢٤٨ ژ/١ - باسی ویرد خوێندنی بەیانیان و ئێواران = چاپی دووەم ل/٣٠٨ ژ/١/١٤٥١).

روونکردنەوە:

زاناکان دەفەرموون: مەبەست لەوتاوان و گوناهانەی کە خودای گەورە بەهۆی گوتنو کردنی ئەم جۆرە زیکرو ویردانەوە، لەبەندە دەیانسڕێتەوە، ئەو جۆرە گوناە و تاوانەیە کە پەیوەندیان بەمافی خوداوە هەبێ، نەك گوناهێ کە پەیوەندی بە مافی بەندەوە هەبێ. وەکی تریش بەئەزموون دەرکەوتووە کەسانێ کە خوو بگرن بەخواپەرستی و زیکرو یادکردنی خوداوە، بەتایبەتی ئەم جۆرە یادە پیرۆزانە، دوورترین کەسن لەگوناە و نافەرمانی خودا، هەروا بەبەرچاوەو بەتەجرەبە و ئەزموون دەرکەوتووە کە درۆزن و پیاو خراپ و دزو حیزو خوێنڕێژ و خراپەکاریش دوورترین کەسن لەیادو

---

[١٩٩٤] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: فضل التهليل و التسبيح و الدعاء، رقم: ٢٦٩١، ٢٦٩٢.

زیکری خوا بەتایبەتی لەکردنی ئەم جۆرە زیکرە تایبەتییانە، کابرای زۆرداری ملهوڕ، نەك هەر ئەم زیکرانەناکا بەڵکوو گاڵتەیشی پێ دێ، مەگەر کەسێ کەخودا هیدایەتی بداو تەوبەی راستیی بکا، ئەوانەش بەخوا زۆر کەمن، چونکە بە راستی گوناە و تاوانی زۆر بەرەبەرە وادڵو دەروونی مرۆڤ رەقو رەش دەکەن، هەتا لووتیان نەتەقێ بەبەردی ئەلحەد و گۆڕپچەدا سەرهۆش خۆیان نایەنەوە!

زۆرمان دی، کەلەگەڵ ئێمەدا فەقێ بوون، نوێژکارو باشکار بوون، بەلام بەبەرە تێکەڵاوی دنیا بوون، گوناە و تاوان دڵی رەشو رەق کردن، وەك گەردە لوولێ فتنگلاشکەیی لوول بدا، ئاوا لافاوی گوناە و تاوان ڕاپێچی کردن، هەتا فریای شایەتمانی سەرەمەرگ نەکەوتن، بەدەم سەرخۆشیو بەدمەستی یەوە گیانیان دەرچووا.

## گەورەیی یادی خوا

١٩٩٥- عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللّٰه عَنْه قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ. (الحديث ٦٤٠٧)[١٩٩٥]:

ئەبو مووسا -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: وێنەی کەسێ کەزیکرو یادی خودا بکا، وەك مرۆڤی زیندوو وایە، وێنەی کەسێ کەزیکرو یادی خودا نەکا، وەك مرۆڤی مردوو وایە. (تاج/٩ ل/١٤١ ز/٥٨ ژ/٣ – باسی گەورەیی یادو زیکری خودا).

١٩٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ لِلّٰهِ مَلَائِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ فَإِذَا وَجَدُوا قَوْمًا

---

[١٩٩٥] اخرجه مسلم في صلاة المسافرين و قصرها، باب/ استحباب صلاة النافلة في بيته...رقم/٧٧٩.

يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَنَادَوْا هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ قَالَ فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا قَالَ فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ مَا يَقُولُ عِبَادِي؟ قَالُوا يَقُولُونَ يُسَبِّحُونَكَ وَيُكَبِّرُونَكَ وَيَحْمَدُونَكَ وَيُمَجِّدُونَكَ قَالَ فَيَقُولُ هَلْ رَأَوْنِي؟ قَالَ فَيَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ مَا رَأَوْكَ قَالَ فَيَقُولُ وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي؟ قَالَ يَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيدًا وَتَحْمِيدًا وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحًا قَالَ يَقُولُ فَمَا يَسْأَلُونِي؟ قَالَ يَسْأَلُونَكَ الْجَنَّةَ قَالَ يَقُولُ وَهَلْ رَأَوْهَا؟ قَالَ يَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُ فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا؟ قَالَ يَقُولُونَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصًا وَأَشَدَّ لَهَا طَلَبًا وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً قَالَ فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ؟ قَالَ يَقُولُونَ مِنَ النَّارِ قَالَ يَقُولُ وَهَلْ رَأَوْهَا؟ قَالَ يَقُولُونَ لَا وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُ فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا؟ قَالَ يَقُولُونَ لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا فِرَارًا وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً قَالَ فَيَقُولُ فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ قَالَ يَقُولُ مَلَكٌ مِنَ الْمَلَائِكَةِ فِيهِمْ فُلَانٌ لَيْسَ مِنْهُمْ إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ قَالَ هُمُ الْجُلَسَاءُ لَا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ.(الحديث ٦٤٠٨)[١٩٩٦].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: خودای گەورە چەشنە فریشتەیەکی تایبەتی هەیە، ئیشیان ئەوەیە بەرێو بانا دەسووڕێنەوەو بەشوێن ئەهلی زیکردا دەگەڕێن، جا هەرکاتێ دییان کەوا کۆمەڵێ یادی خودا دەکەن‌و کۆڕی زیکریانت دابەستووە، قاو لەیەکتری دەکەن‌و بەیەکتر دەڵێن: وەرن بەلای کاری خۆتانەوە، ئەمە ئەوەیە کە ئێوە بۆی دەگەڕێن. فەرمووی: ئیتر کەڵەکە دەکەن لەدەوریان و هەتا ئاسمانی خوارو بەباڵ دەخولێنەوە، بەدەوریاندا، جا پەروەردگاریان لێیان دەپرسێ (هەرچەن خۆی باشتر حاڵەکە دەزانێ)، دەفەرموێ: ئەم بەندانەی من دەڵێن چی؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- فریشتەکان دەفەرموون: (سبحان الله) دەکەن‌و تۆبەپاك و پیرۆز و بێخەوش دەزانن‌و (الله أكبر) دەکەن‌و خودای خۆیان بەگەورە دەگرن‌و (الحمد

[١٩٩٦] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: فضل مجالس الذكر، رقم: ٢٦٨٩.

لله) دەكەن‌و سوپاسی تۆدەكەن‌و بەهەموو جۆرێ بەشان‌و شكۆی تۆدا هەڵ دەدەن، جا دەفەرموێ: ئایا ئەمانەمنیان بینیوە؟ دەفەرموون: نەبەخوا نەتیان دیوە، جا دەفەرموێ: ئەی ئەگەر بم بینن چۆنە؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموون: ئەگەر بتبینن باشتر بەندەییت دەكەن‌و باشتر سوپاس و ستایش‌و باسی گەورەییت دەكەن‌و، پتر تەسبیحاتت دەكەن‌و، زیاتر باسی بێ خەوشیت دەكەن، جا خودا دەفەرموێ: ئەی باشە داوای چیم لێدەكەن؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموون: داوای بەهەشتت لێدەكەن. فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئایا دیویانە؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموون: نەبەخودا ئەی خودایە! نەیان دیوە. فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئەی ئەگەر بیبینن چۆنە؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموون: ئەگەر بیبینن باشتر سوور دەبن، لەسەری و باشتر هەڵپەی بۆدەكەن‌و زیاتر حەزی لێدەكەن، دەفەرموێ: ئەی لەچی دەترسن‌و خۆیانی لێ دەپارێزن؟ فەرمووی: دەفەرموون: لەئاگر دەترسن‌و پەنا دەگرن بەخودا لێی. فەرمووی: دەفەرموێ: ئایا ئاگریان دیوە؟ فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموون: نەبەخودا نەیان دیوە، دەفەرموێ: ئەی ئەگەر بیبینن چۆنە؟ فەرمووی: دەفەرموون: ئەگەر بیبینن زیاتر لەدەستی هەڵدێن‌و باشتر كۆی لێدەكەنەوە. فەرمووی: ئەوجا دەفەرموێ: دەئێوە بەشایەت بن ئەوا من لێیان خۆش بووم، جا فریشتەیێ لەفریشتەكان دەڵێ: كابرایەكیان لەناو دایە لەوان نییە، پیاوێكی خراپە، بۆ زیكری خودا نەهاتبوو؟ دەفەرموێ: كۆمەڵی كۆڕی وا، هاونیشینیان لەبەر خاتری ئەوان لەبەدبەختی رزگاری دەبێ‌و بەهۆی ئەوانەوە ئەویش خۆش بەخت دەبێ! (ریاض/٣ ل/١٠٣٣ ز/٢٤٧ ژ/١ = چاپی دووەم ل/٣٠٠ ژ/١/١٤٤٧ - ش- باسی بەهرەو خێری كۆڕی زیكر.. + تاج/٩ ل-١٣٨ ز/٥٨ ژ/٢-ش/ت-باسی گەورەیی یادو زیكری خودا).

# پـايـانیٚ - الخَاتِمَةُ

مامۆستای عەسقەلانی -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: نامەی نـزاو دووعا، سەدو چل و پێنج فەرموودەی بـەرزەوە کـراوی واتیـادا، چل‌و یـەکیان بـێ ڕشـتـەن، واتــە: معلقــن، و ئـــەوانی تریــان پەیوەســـتن -موصــول-ن، دووبارەکانیان سەدو بیست‌و یەك فـەرموودەن، پوختەکـەیان (١٤٥ - ١٢١ = ٢٤) دەکاتــە بیـست و چـوار فـەرمووده. موسـلیمیش ئـەم پوختەیـەی تـەخریج کردووە وەك بوخاری، بێجگە لەمانەیان کەهەشت فەرموودەن:

١. فەرموودەی شداد (سید الاستغفار = ژمـارە/١٩٧٦ تەجریـد = ٦٣٠٦ فـتح الباری).

٢. فەرموودەی ئەبوهورەیرە: (في عدد الاستغفار کل یوم = ژمـارە = ١٩٧٧ تەجرید=٦٣٠٧ فتح الباری).

٣. فەرموودەی حوزەیفە: في القول عند النوم= ژمارە/١٩٧٩ تەجرید=٦٣١٤.

٤. فەرموودەی ئەبو زەڕ: اللهم باسمك أموت و أحيا. =٦٣٢٥ فتح الباری.

٥. فـەرموودەی: صلوا کما صلینا وجاهدوا کما جاهدنا...= ژمـارە/٦٣٢٩ فتحالباری/ریوایەتەکەی ئەبودەرداء و بەس.

٦. فەرموودەی ئیبنوعەباس: في اجتناب السجع=رقم/٦٣٣٧ فتح الباری.

٧. فەرموودەی جابیر لەبارەی استخارەوە = رقم/٦٣٨٢ فتح الباری.

٨. فەرموودەی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری: من قال عشرا کان کمن اعتق... رقم/١٩٩٣ تجرید/٦٤٠٤ فتح الباری.

هــەروەها عەســقەلانی دەفــەرموێ: نــۆ بیـستراو -أثـری صــەحابەو تابیعینیشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٨٤- نامەی دڵنەرمکارەکان
# كتاب الرقاق

١٩٩٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّٰه عَنهما قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ. (الحديث ٦٤١٢)[1997]:

ئیبنو عەباس -ڕەزای خوای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: دوو بەهرەی گەورەو گرانبەها هەن، زۆرکەس لەو دوو بەهرەیەدا بەهەڵەدا چوون‌و هەرزان فرۆشیان کردوون، وەك کەسێ لەسەودایەکا تێ بشکێ ئاوا، یەکەمیان لەشساخی‌و تەندروستییە، دووەمیان دەست بەتاڵییە، کەسێ لەشی ساخ بێ‌و دەستی بەتاڵ بێ‌و، تێنەکۆشێ بۆ ڕەزای خودا، بۆ سوودی هەردوو جیهان، ئەوە ئەو دوو نیعمەتەی تاڵانفرۆش کردووە! (تاج/٩ ل/٢٨٦ ز/٩٤ ژ/٢ + ریاچ/١ ل/١٠٦ ز/١١ ژ/٣/٩٧).

١٩٩٨- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰه عَنهما قَالَ أَخَذَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَنْكِبِي فَقَالَ كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ إِذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تَنْتَظِرِ الْمَسَاءَ وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ لِمَرَضِكَ وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ. (الحديث ٦٤١٦)[1998]:

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- سەشانی گرتم‌و فەرمووی: لەم جیهانەدا خۆت بەئاوارە دابنێ،

---

[1997] قال الإمام النووي في رياض الصالحين: (رواه البخاري). -المترجم

[1998] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عمر : (كن في الدنيا كأنك غريب..) فتح الباري/١٣ ص٣١٠ ط/ج خاتمة كتاب الرقاق). -المترجم

یاخۆت بەڕێبوار و ڕەفتەنی بزانە! بەڵکوو لەوە پتریش، وای دانێ کەمردووی ناو گۆڕستانی، کەواتە: لەم کاروانسەرایەدا پشتی لێ مەکەرەوەو بەماڵی خۆتی مەزانە! ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- خۆشی دەیفەرموو: ئێوارێ بەتەمای بەیانی مەبە، بەیانی بەتەمای ئێوارێ مەبە، کاتێ لەشت ساخە هەوڵ بدە بۆکاتی نەساغیت، ژیانت بەهەل بزانەو، هەوڵو کۆششی تیابدە بۆ پاش مردنت. (تاج/٩ ل/٢٨٦ ز/٩٤ ژ/١ + ریاض/٢ ل/٥٢ ز/٥٥ ذ/٤٧١/٥/٥).

١٩٩٩- ٥٩٣٨ عَنْ عَبْدِاللّٰهِ رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ خَطَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَطًّا مُرَبَّعًا وَخَطَّ خَطًّا فِي الْوَسَطِ خَارِجًا مِنْهُ وَخَطَّ خُطَطًا صِغَارًا إِلَى هَذَا الَّذِي فِي الْوَسَطِ مِنْ جَانِبِهِ الَّذِي فِي الْوَسَطِ وَقَالَ هَذَا الْإِنْسَانُ وَهَذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ أَوْ قَدْ أَحَاطَ بِهِ وَهَذَا الَّذِي هُوَ خَارِجٌ أَمَلُهُ وَهَذِهِ الْخُطَطُ الصِّغَارُ الْأَعْرَاضُ فَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا وَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا.(الحديث ٦٤١٧)[١٩٩٩]:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر - دروودی خوای لەسەر بێ- خەتێکی چوار گۆشەی کێشاو، لە ناوئەوخەتە چوارگۆشەیەوە، خەتێکی تری درێژی ڕکێشا هەتا دەرەوە، ئەنجا لەدیوی ناوەوە، چەند خەتێکی تری وردی لەسەر خەتەکەی ناوەوە کێشا، ئەوجا فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەمە وێنەی مرۆڤو هیوایەتی، ئەم خەتەیان کەوا لەناو خەتە چوارگۆشەکەدا و خەتە وردەکانی والەسەر، ئەمەیان وێنەی ئادەمیزادەو، ئەم خەتە چوار گۆشەشیان وێنەی ئاکامەکەیەتی، ئەوەتانێ بەری لێبڕیوەتەوەو لەهەر چوارلاوە ئابلۆقەی داوە، یا فەرمووی: گەمارۆی داوەو دەوری گرتووە، ئەم خەتەیشیان کە دەرچووەتە دەرەوە هیواکەیەتی، ئەم خەتو کێرکێرە وردیلانەیش دەردو بەڵاو مەینەتن، گریمان ئەگەر لەهەندێ لەم دەردو ئازارانەیش قوتاری بوو لەهەندێ تریان

---

[١٩٩٩] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن مسعود في الخط المربع طبعة جديدة:) فتح الباري/١٣ ص/٣١٠ خاتمة كتاب الرقاق). -المترجم-

قوتاری نابێ، سەرنجام پێش ئەوەی کەبگات بەئاواتی خۆی، یەکێ لەم دەردو بەڵایانە وەك مار دەیگەزێ. (تاج/٩ ل/٣٠٤ ز/٩٧-باسی: زینهار: خۆتان بپارێزن چاو برسێتی و هیوای دوو رو درێژی + ریاض/٢ ل/١٣٤ ز/٦٥ ژمارە/٥٧٧/٤ – باسی بیرکردنەوە لەمردن و هیواکورتی).

ئەم شکڵە ئەو وێنەیە:




بەم بۆنەیەوە بەندە گووتومە:

بەقەد نووحیش بژی رۆژێ ئەمەن هەردێتە کۆتایی

دەبێ شینی لەبۆ بکرێ ئەوەی کەبۆی کرا شایی

هەتا دەکرێ بکەن چاکەو مەکەن کارێ خراپ دەرچێ

تکام لێتان بەهیچ جۆرێ بەژینی وامەبن بایی

٢٠٠٠– عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ خَطَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُطُوطًا فَقَالَ هَذَا الْأَمَلُ وَهَذَا أَجَلُهُ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ جَاءَهُ الْخَطُّ الْأَقْرَبُ. (الحديث ٦٤١٨)[٢٠٠٠]:

ئەنەسی کوڕی مالیك -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- چەند خەتێکی کێشا، فەرمووی: ئەم یەکەیان ئادەمیزادەو، ئەمەشیان هیواو ئاواتەکەیەتیو، ئەمەشیان ئاکامەکەیەتی،

---

[٢٠٠٠] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أنس في الخط (فتح/١٣ ص/٣١٠ –المترجم-.

لەوکاتەدا کەئاوا خەریکەو هەرساتەی لەسەر باریکەو، بەدوای هیوای دووردو درێژدا وێڵە، لەپڕخەتە نزیکەکەیان دەگاتە سەری‌و مردن پڕی پیادەکاو یەخەی پێ دەگرێ و دەمرێ.! (ریاض/٢ ل١٣٤ ز/٦٥ ژ/٥٧٦/٣).

٢٠٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنه عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: أَعْذَرَ اللَّهُ إِلَى امْرِئٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ حَتَّى بَلَّغَهُ سِتِّينَ سَنَةً. (الحديث ٦٤١٩)[٢٠٠١]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئەوکەسەی کەخودا ئاکامی دوابخا، هەتا تەمەنی دەگاتە شەست ساڵ، ئیتر ئەوە خودا بیانووی بڕیوەو بەهانەی ئەوەی نەماوە، کەبڵێ: ئەگەر تەمەن بەبەریەوە هەبێ، فەرمانەکانی خودا بەجێ دەهێنم و تەوبە دەکەم!. (تاج/٩ ل/٣٠٦).

٢٠٠٢- وعنهُ رَضِي اللَّه عَنْه قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَا يَزَالُ قَلْبُ الْكَبِيرِ شَابًّا فِي اثْنَتَيْنِ فِي حُبِّ الدُّنْيَا وَطُولِ الْأَمَلِ. (الحديث ٦٤٢٠)[٢٠٠٢]:

دیسان فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئادەمیزاد هەتا پیرتر ببێ ئەم دوو ڕەوشتەی تیادا گەنجتر دەبێتەوە: خۆشەویستیی جیهان‌و هیوای دوورودرێژ. (تاج/٩ ز/٩٧ ل/٣٠٣ ژ/٢).

٢٠٠٣- عَنْ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ الْأَنْصارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَال: قَال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَنْ يُوَافِيَ عَبْدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ

---

[٢٠٠١] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة: (اعذر الله إكى امريء) (فتح/١٣ ص/٣١٠ -خاتمة كتاب الرقاق). -المترجم-

[٢٠٠٢] اخرجه مسلم في الزكاة، باب: كراهة الحرص على الدنيا رقم: ١٠٤٦.

اللّٰهِ إِلَّا حَرَّمَ اللّٰهُ عَلَيْهِ النَّارَ. (الحديث ٦٤٢٣ طرفه في رقم: ٣٩ تجريد= ٤٢ فةتح= بەرگى/١ ل/٥٩)(٢٠٠٣):

عيتبانى كوڕى ماليكى ئەنصارى -ڕەزاى خواى لێ بێ- فەرمووى: خۆشەويست -دروودى خواى لەسەر بێ- فەرمووى: هەربەندەیێ لەرۆژى قيامەتدا، كەدێ بۆ ديوانى خودا، لەگەڵ خۆى وشەى پيرۆزى (لاَ إِلَـهَ إلاّ اللّـهَ) بهێنێ، وە لەگوتنى ئەو وشەيە، مەبەستى رەزاى خوداى گەورە بووبێ، مسۆگەر كە خودا ئاگرى دۆزەخى لێ حەرام دەكا).

٢٠٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَقُولُ اللّٰهُ تَعَالَى مَا لِعَبْدِي الْمُؤْمِنِ عِنْدِي جَزَاءٌ إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا ثُمَّ احْتَسَبَهُ إِلَّا الْجَنَّةُ. (الحديث ٦٤٢٤)(٢٠٠٤):

ئەبو هوريرە- رەزاى خوداى لێ بێ- لەخۆشەويستەوە، دەفەرموێ -دروودى خواى لەسەر بێ- (خوداى گەورە دەفەرموێ: كاتێ لەبەندەى موسوڵمانى خۆم، خۆشەويستەكەيى لێ دەسەنمەوەو گيانى دەكێشم، وەك مناڵو براو خۆشەويستى ترى مرۆڤ ، كە ئەم جۆرە كەسانە بەسروشت لەجيهانا لەلاى مرۆڤ زۆر خۆشەويستن، ئەويش ئارامو سەبر لەسەر ئەم كۆستكەوتنە بگرێو ناسوپاسىو ناشوكرى لەسەر نەكاو، بيكا بە توێشووى قيامەتى، ئەوە لەپاداشتى ئەوەدا بەهەشتى دەدەمێ ). (ريـاض/١ ز:٣ ل-٥٤ ژمارەى فەرموودە:٨/٣٢).

---

(٢٠٠٣) سبق في رقم: ٣٩ تجريد - بەرگى/١ ل/٥٩. -المترجم-

(٢٠٠٤) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة: نا مالعبدى المؤمن عندي جزاء. فتح/١٣ ص/٣١٠ ط.ج- خاتمة كتاب الرقاق. -المترجم-

٢٠٠٥- عَنْ مِرْدَاسٍ الْأَسْلَمِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ الْأَوَّلُ فَالْأَوَّلُ وَيَبْقَى حُفَالَةٌ كَحُفَالَةِ الشَّعِيرِ أَوِ التَّمْرِ لَا يُبَالِيهِمُ اللَّهُ بَالَةً. (الحديث ٦٤٣٤ طرفه في: ٤١٥٦)(٢٠٠٥).

میرداس ئەسلەمی -ڕەزای خوای لیٚ بیٚ- لەخۆشەویستەوە -دروودی خوای لەسەر بیٚ- دەفەرمویٚ: ( پیاوچاکان یەك لەشوێنی یەك بەرودوا لەدنیا دەردەچن، تادەمێنێتەوە خوێری‌و سەرسەرییەکان، کەوەك سەرکۆزەری خەرمانی جۆ وان، یافەرمووی: کەوەك بنبێژنگ‌و بنبۆڵ‌و پووچەڵی خورما وان، یەك تۆسقاڵ چییە خودای گەورە دەربەستیان نایەت‌و گوێیان پیٚ نادات!). (تاج/٩ ل-٣١١ ز:٩٨ ژمارە:٦ - باسی بەهرەی هەژاری‌و هەژاران ) + (ریاض/٤ ز:٣٧٠ ژ:١٨٢٨/٢١).

ڕوونکردنەوە:

١- میرداسی کوڕی مالیکی ئەل- ئەسلەمی، لەکۆمەڵەی پەیمانی بەیعەتول شەجەرەیە، لەئەنجاما لەکوفە نیشتەجیٚ بوو، ومبەخەڵکی ئەویٚ دادەنرا، یەك فەرمودەی هەیە کە ئەم فەرموودەیەی ئێرەیە، قەیسی کوڕی ئەبو حازم لەووەوەگێڕاویەتەوە).

٢- بەپێی فەرمایشتی شەرحەکان، ئەم فەرموودیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کەیەکیٚ لەمەرجەکانی هاتنی قیامەت‌و نیشانەکانی ئەوەیە: پیاو چاك نامێنن، دەمێننەوە خراپ‌و گەندوپیسەکان، بەرە بەرە وەك کەرو گاو ئاژەڵیان لیٚ دیٚ، بەبەرچاوی یەکەوە لەیەکتر هەڵدێن!

(٢٠٠٥) لم يوافقه مسلم على تخريج حديث مرداس: يذهب الصالحون الأول ... راجع بەرگی/٤ ل/٤٠٥ ژمارە:٢٩. -المترجم-

٢٠٠٦- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّه عَنهمَا يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لَابْتَغَى ثَالِثًا وَلَا يَمْلَأُ جَـوْفَ ابْـنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ. (الحديث ٦٤٣٨)[٢٠٠٦].

ئیبنو عەباس- ڕەزای خودا لەخۆی و بابی- فەرمووی بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت دیفەرموو: ئەم ئادەمیزادە ئەوەندە چاوچنۆك و بەتەماعە، بەهیچ شتێ تێرناخواو چاوی تێرنابێ، گریمان پڕبەشیوێ زێڕی هەبێ، حەز دەكا بیكا بە دووشیو، پڕ بە دووشیو سامان و زێڕی هەبێ حەز دەكا كە بیكا بەسێ شیو، وەهەروەها هەتا پتری هەبێ هەوڵ و هەڵپە بۆ پتر دەكا!! ئیتر مەگەر گڵ چاوی ئادەمیزاد پڕبكا. ئادەمیزاد مەگەر بەگڵی گۆڕ تێربخوا، مەگەر بەمردن تەماعی نەمێنێ، هەركەسێكیش لەهەر گوناهێ تەوبە بكا -وەك ئەوە تەوبە لەچاوچنۆكە بكا- خودا تەوبەی گیرا دەكاو، پەشیمانی لەهەموو كەسێ قەبووڵە. (ریاض/١ ل/٤٤ ز/٣ ژ/٢٣/١١ + تاج/٩ ل/٢٩١ ز/٩٤ ژ/١٤).

٢٠٠٧- عَنْ ابْنِ مسعود رَضِي اللَّهُ عَنه قَال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّكُمْ مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا مِنَّا أَحَدٌ إِلَّا مَالُهُ أَحَبُّ إِلَيْـهِ قَالَ فَإِنَّ مَالَهُ مَا قَدَّمَ وَمَالُ وَارِثِهِ مَا أَخَّرَ. (الحديث ٦٤٤٢)[٢٠٠٧].

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر - دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: كامتانماڵی میراتبەرەكەی لەماڵی خۆی خۆشتر دەوێ؟ عەرزیان كرد: قوربان! هەموومان ماڵی خۆمانمان خۆشتردەوێ لەماڵی میراتبەرەكانمان، فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- : دەبزانن ماڵی ئادەمیزاد ئەوماڵەیەتی كەلەپێشخۆیەوە ڕەتی دەكاو، ڕەوانەی دەكا بۆ ئەو

---

[٢٠٠٦] اخرجه مسلم في الزكاة، باب: لو أن لابن آدم واديين لابتغى ثالثا... رقم/١٠٤٩.

[٢٠٠٧] قال النووي في رياض الصالحين، في نهاية هذا الحديث: (رواه البخاري). ويعني ذلك انه من أفراد البخاري. -المترجم-

جیهانی، ماڵی میراتبەرەکانیشی ئەوەیە کە بەچنگەکرێ هەرکۆی دەکاتەوە، هەتا لەپڕ خۆی دەمرێو ماڵەکەی لەپاشی بەجێ دەمێنێ و دەبێ بەهی کەلەپوورگرەکانی! (تـاج/٩ ل/٢٩٤ ز/٩٤ ژ/٢٠) + (ریـاض/٢ ز/٦ ل/١٠٨ ژ/٥٤٥/٢ - باسی سەخاوەتو بەخشینەوە...).

٢٠٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنه أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ أَللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِنْ كُنْتُ لَأَعْتَمِدُ بِكَبِدِي عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْجُوعِ وَإِنْ كُنْتُ لَأَشُدُّ الْحَجَرَ عَلَى بَطْنِي مِنَ الْجُوعِ وَلَقَدْ قَعَدْتُ يَوْمًا عَلَى طَرِيقِهِمِ الَّذِي يَخْرُجُونَ مِنْهُ فَمَرَّ أَبُو بَكْرٍ فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَا سَأَلْتُهُ إِلَّا لِيُشْبِعَنِي فَمَرَّ وَلَمْ يَفْعَلْ ثُمَّ مَرَّ بِي عُمَرُ فَسَأَلْتُهُ عَنْ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَا سَأَلْتُهُ إِلَّا لِيُشْبِعَنِي فَمَرَّ فَلَمْ يَفْعَلْ ثُمَّ مَرَّ بِي أَبُو الْقَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَبَسَّمَ حِينَ رَآنِي وَعَرَفَ مَا فِي نَفْسِي وَمَا فِي وَجْهِي ثُمَّ قَالَ يَا أَبَا هِرٍّ قُلْتُ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ الْحَقْ وَمَضَى فَتَبِعْتُهُ فَدَخَلَ فَاسْتَأْذَنَ فَأَذِنَ لِي فَدَخَلَ فَوَجَدَ لَبَنًا فِي قَدَحٍ فَقَالَ مِنْ أَيْنَ هَذَا اللَّبَنُ قَالُوا أَهْدَاهُ لَكَ فُلَانٌ أَوْ فُلَانَةُ قَالَ أَبَا هِرٍّ قُلْتُ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ الْحَقْ إِلَى أَهْلِ الصُّفَّةِ فَادْعُهُمْ لِي قَالَ وَأَهْلُ الصُّفَّةِ أَضْيَافُ الْإِسْلَامِ لَا يَأْوُونَ إِلَى أَهْلٍ وَلَا مَالٍ وَلَا عَلَى أَحَدٍ إِذَا أَتَتْهُ صَدَقَةٌ بَعَثَ بِهَا إِلَيْهِمْ وَلَمْ يَتَنَاوَلْ مِنْهَا شَيْئًا وَإِذَا أَتَتْهُ هَدِيَّةٌ أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ وَأَصَابَ مِنْهَا وَأَشْرَكَهُمْ فِيهَا فَسَاءَنِي ذَلِكَ فَقُلْتُ وَمَا هَذَا اللَّبَنُ فِي أَهْلِ الصُّفَّةِ كُنْتُ أَحَقُّ أَنَا أَنْ أُصِيبَ مِنْ هَذَا اللَّبَنِ شَرْبَةً أَتَقَوَّى بِهَا فَإِذَا جَاءَ أَمَرَنِي فَكُنْتُ أَنَا أُعْطِيهِمْ وَمَا عَسَى أَنْ يَبْلُغَنِي مِنْ هَذَا اللَّبَنِ وَلَمْ يَكُنْ مِنْ طَاعَةِ اللَّهِ وَطَاعَةِ رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بُدٌّ فَأَتَيْتُهُمْ فَدَعَوْتُهُمْ فَأَقْبَلُوا فَاسْتَأْذَنُوا فَأَذِنَ لَهُمْ وَأَخَذُوا مَجَالِسَهُمْ مِنَ الْبَيْتِ قَالَ يَا أَبَا هِرٍّ قُلْتُ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ خُذْ فَأَعْطِهِمْ قَالَ فَأَخَذْتُ الْقَدَحَ فَجَعَلْتُ أُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ فَأُعْطِيهِ الرَّجُلَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ فَيَشْرَبُ حَتَّى يَرْوَى ثُمَّ يَرُدُّ عَلَيَّ الْقَدَحَ حَتَّى انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَدْ رَوِيَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ فَأَخَذَ الْقَدَحَ فَوَضَعَهُ عَلَى يَدِهِ فَنَظَرَ إِلَيَّ فَتَبَسَّمَ فَقَالَ أَبَا هِرٍّ قُلْتُ لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ بَقِيتُ أَنَا وَأَنْتَ قُلْتُ صَدَقْتَ يَا

رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ اقْعُدْ فَاشْرَبْ فَقَعَدْتُ فَشَرِبْتُ فَقَالَ اشْرَبْ فَشَرِبْتُ فَمَا زَالَ يَقُولُ اشْرَبْ حَتَّى قُلْتُ لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَجِدُ لَهُ مَسْلَكًا قَالَ فَأَرِنِي فَأَعْطَيْتُهُ الْقَدَحَ فَحَمِدَ اللّٰهَ وَسَمَّى وَشَرِبَ الْفَضْلَةَ. (الحديث ٦٤٥٢ سبق طرفه في رقم: ١٨٠٠ تجريد = ٥٣٧٥ فتح الباري = بەرگی/٥ ل/٦٧)[٢٠٠٨].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: بەوخودایەی کەکەسی لەڕەنگ نییە، گەلێ جار وام بەسەرهاتووە لەبەرسانا، لاکەی سەرم هاتووە و خۆم کوتاوە بەزەویدا و لەپێ کەوتووم، یا لەتاو برسێتی بەردم شەتەك داوە بەسەرسکمەوە، وە رۆژێ لەسەر سەرە ڕێی موسوڵمانانندا دانیشتم، لەسەر ئەوڕێگەیەی کە لێیەوە دەچوون بۆ مزگەوت، سابەشکوو بەبیانووی شتێکەوە، یەکێکیان لەگەڵ خۆی بمباتەوەو تێرنانو ئاوم بکا، جا ئەبوبەکر هات ئایەتێکی قورئانم لێپرسییەوە، مەبەستم ئەوە بوو کە ئەوپرسیارە بکەم بەبیانوو هەتا لەگەڵ خۆیدا بمباتەوە تێرم بکا، بەلأم رۆیشت و تێری نەکردم، ئەنجا عومەر ڕەت بوو لەلامەوە، ئایەتێکم لەویش پرسییەوە ئەویش هەروەها، ئەنجا پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەلامەوە ڕەتبوو، کەمنی بینی زەردەخەنەیێ گرتی و تێ گەیشت کەچی لەدڵمایە و ڕەنگم بۆچی وایە: فەرمووی: ئەی ئەبو هیرڕ! گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمەر خودا! سەرم لەڕێتایە، فەرمووی: شوێنم کەوە. ئیتر ئەوپێش کەوتو منیش شوێنی کەوتم، تا گەیشتە ماڵەوەو چووە ژوورەوەو روخسەتی بۆ منیش خواستو منیش چومە ماڵەوە خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- روانی واهەندێ شیر لەجامێکا دانراوە، فەرمووی: ئەم شیرەتان لەکوێ بوو؟ گوتیان: هی ماڵی فیسارەپیاوە، یا فیسارە ژنە بەدیاری بۆتۆ هاتووە. فەرمووی: ئەبو هیرڕ! گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمەری خودا: سەرم لەڕێتایە، فەرمووی: بگەرە دانیشتوەکانی صوففە بانگیانکە بۆم. ئەبو هورڕەیرە فەرمووی: دانیشتوەکانی

---

[٢٠٠٨] سبق طرفه في رقم: ١٨٠٠ تجريد = ٥٣٧٥ فتح الباري. —المترجم

صوففه ئەوانه بوون کەمیوانی ئیسلام بوون، کەسوکارو ماڵو منال و خانه خوێو ئەمانەیان نەبوو، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەگەر خێر (صەدەقە)ی بۆ بهاتبایه دەینارد بۆ ئەوان و خۆی دەستی بۆی نەدەبرد، بەڵام ئەگەر دیاری بۆ بهاتبایه دەینارد بەشوێنیاناو خۆشی لێی دەخواردو بەشی ئەوانیشی لێ دەدا، منیش ئەمجاره کە ناردمی بەشوێنیاندا ئەمەم لەشان گران بوو، چونکی لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەم تۆزە شیرە چییه بۆئەم حمکه دانیشتوانی صوففەیه، ئەم کەم و ئەوان زۆر بەچی دەردێکیان دەخوات. ئەمە بەمن ڕەواتربوو کەژەمێکی لێبخۆمەوەو، هەناوێکم تێ بێتەوه پێی، خۆ کە ئەوانیش هاتن، خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانم پێدەکاو، دەبێ من شیرەکە بەسەریاندا بگێڕم، جاکەوابێ دەبێ چی لەم شیرە بەمن بڕێ، بەڵام فەرمانی خوداو فەرمانی پێغەمەری خودا چاری نییه و دەشێ جێبەجێ بکرێ، بۆیه چووم بانگم کردن، ئەوانیش هاتن و لەدەرگاوە روخصەتی چوونە ژوورەوەیان خواستو ڕێگە خوازی یان کردو، خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگەی دانیشتنی دانو، لەماڵەوە دانیشتن و کۆڕیان بەست لەهۆدەکەدا، فەرمووی: ئەی ئەبو هیرڕ. گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمەری خودا! فەرمووی: جامە شیرەکە هەڵگرەو بگەڕێ بەسەریانەوەو شیریان پێبدە بابخۆنەوە، منیش جامەکەم هەڵگرتو گەڕانم بەسەریانەوە، دەمدا بەرهەر پیاوێ لێی دەخواردەوە تاتێر شیری دەخواردەوە، ئەوجا جامەکەی دەدامەوە، هەتا پیاوگەلەکە، یەك لەدوا یەك تێر شیریان خواردەوە، هەتا گەیشتمەوە سەر پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- جا جامەکەی لێ وەرگرتمو لەسەر بەری دەستی خۆی داینا و سەیرێکی منی کردو زەردەیەك گرتی، لەوەی کەهات بەخەیاڵی مندا، کە گوایە شیرەکە بەشمان ناکات، فەرمووی: ئەی ئەبوهیرڕ. گوتم: بەڵێ قوربان! فەرمووی: ماینەوە خۆمو خۆت، گوتم: بەڵێ راست دەفەرموویت ئەی پێغەمەری خودا! فەرمووی: دەی

دانیشه بخۆرەوە. منیش دانیشتمو لەشیرەکەم خواردەوە، فەرمووی: دیسان بخۆرەوە، دیسان خواردمەوە، ئیتر هەر دەیفەرموو: (پتریش بخۆرەوە) تاخۆم گوتم: ئیتر ناخۆمەوە، بەوکەسەی کەتۆی کردووە بەم پێغەمەرە ڕاستو دروستە و ئەم ئایینە راستەی لەگەڵدا ڕەوانەکردووی، کەیەزدانی پاکە، ئیتر جێگەی ناکرێتەوە بۆم!.

فەرمووی -دروودی خوای لەسەر بێ- دەبیدە بەمنیش، منیش جامەکەم داپێی، جا سوپاسی خودای کرد لەسەر ئەوە کەئەو جامە شیرە پیتو فەڕێکی وای تێ کەوت کەبەشی دەوری حەفتا کەسی کرد، ئەوجا ناوی خودای هێناو ماوەکەی کەلەجامەکەدا مابوو خواردەوە. (تاج/١٠ ز/١ ل/٢ ژ/١- باسی کۆمەڵەی صوففە = ئەهلی صوففە).

٢٠٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اللَّهُمَّ ارْزُقْ آلَ مُحَمَّدٍ قُوتًا. (الحديث ٦٤٦٠)[٢٠٠٩].

ئەبو هوریرە- رەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر- دروودی لەسەر- دیفەرموو: خودایە! رزقو رۆژی خێزانو کەسوکاری موحەمەد ئەوەندە بدە کەسەرو بەرپێی بژینو بەس. (ریاض/٢ ل-٧٣ ز:٥٦ ژمارەی فەرموودە: ٥٠١/١١ ـش)

٢٠١٠-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَنْ يُنَجِّيَ أَحَدًا مِنْكُمْ عَمَلُهُ قَالُوا وَلَا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ وَلَا أَنَا إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِرَحْمَةٍ سَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَاغْدُوا وَرُوحُوا وَشَيْءٌ مِنَ الدُّلْجَةِ وَالْقَصْدَ

[٢٠٠٩] اخرجه مسلم في الزكاة، باب: في الكفاف و القناعة و في أوائل الزهد و الرقاق، رقم: ١٠٥٥.

الْقَصْدَ تَبْلُغُوا. (الحديث ٦٤٦٣ طرفه في رقم/٣٧ تجريد = رقم/٣٩ فتح الباري = بەرگی/١ ل/٥٦). (قَال العيني: الحديث من أفراده –المترجم–)[٢٠١٠]:

ئـەبو هـورەيرە -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: خۆشەویـست -دروودی خوای لەسەر بێ- فـەرمووی: کەسـتان کـردەوەی خـۆی رزگـاری ناکـات). یـاران عەرزیان کرد: هـەتا تـۆیش؟ ئـەی پێغەمـەری خـودا! فـەرمووی: هـەتا منـیش بـەکردەوەی خـۆم ناچـمە بەهەشـت، مەگـەر خـودا بەبـەرگی ڕەحمـەتی خۆیدامپۆشێو نوقمی ڕەحمەتی خۆیم بکـا، هـەوڵو تەللايـەکی ڕێكو پێکـی مامناوەنـدی بـدەنو لـەکاری خێـرا درێغـی مەکـەنو ئەوەنـدەی بۆتـان دەلـوێ بەڕاساڵی کۆتایی لەکردنی کـاری چاك مەکـەن، ئێـوەش وەك ڕێبـواری چالاك لـەم سـێکاتەدا تێکۆشـن و خواپەرسـتیو بەنـدەگی خۆتـان بکـەنو بیکـەن بەدەسمایـەو سـەرمایەی خۆتـان: سـەرلەبەیانیان و سـەرلەئێواران و دەمـەو پارشێو! میانەکاربن میانەکار دەگەنـە هـەوار، کـاروانی ئەگـەر میانەڕەونـەبێ، هـەم خـۆی هـەم ولاخـەکانی دەپـڕووکێنو لـەپێ دەکـەون. (ریـاض/١ ل/٩٧ ژ/٨٦/٢/ زنجيرە ژمارە: ٨-باسی ڕاساڵی، واتە: ئیستیقامەت).

٢٠١١– عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عنها أنها قالت: سئل الـنبي صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ أيُّ الأعمالِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قال: أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَـلَّ. (الحـديث ٦٤٦٥ سبق طرفه في رقـم: ٩٠٩ تجريـد = ١٩٦٩ فـتح= بـەرگی/٢ ل/٢٩٠) + (بڕوانـە/ ژمارە/٩١٠ تەجرید = بەرگی/٢ ل/٢٩١)[٢٠١١]:

عائیشە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: لەپێغەمەر -درودی خوای لەسەر بێ- پرسیارکرا: کام کردەوە زۆر خۆشەویستە لەلای خودای گەورە؟ فەرمووی: هـەرکارێکی چـاکە خاوەنەکـەی بـەردەوام بـێ لەسـەری، ئـەوە لـەلای خـودا

---

[٢٠١٠] اخرجه مسلم في صفات المنافقين و احكامهم، باب: لن يدخل احد الجنة بعمله..رقم/٢٨١٦ (راجع رقم/٣٧ تجريد). -المترجم-

[٢٠١١] راجع رقم: ٩٠٩ تجريد. -المترجم-

خۆشەویستترین کردەوەی چاکەی ئەوچاکە کارەیە، با ئەوکردەوەیە کارێکی کەمیش بێ. (تاج/١ ل/٦٤ ز/١٠ ژ/٧-ش/ت).

٢٠١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّه عَنْه قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الرَّحْمَةَ يَوْمَ خَلَقَهَا مِائَةَ رَحْمَةٍ فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعًا وَتِسْعِينَ رَحْمَةً وَأَرْسَلَ فِي خَلْقِهِ كُلِّهِمْ رَحْمَةً وَاحِدَةً فَلَوْ يَعْلَمُ الْكَافِرُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الرَّحْمَةِ لَمْ يَيْئَسْ مِنَ الْجَنَّةِ وَلَوْ يَعْلَمُ الْمُؤْمِنُ بِكُلِّ الَّذِي عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الْعَذَابِ لَمْ يَأْمَنْ مِنَ النَّارِ. (الحديث ٦٤٦٩ طرفه في: ٦٠٠٠)[٢٠١٢]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لەپێغەمەر - دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: ئەورۆژەی کەخودا رەحمەتو سۆزو بەزەیی دروست کرد، کردی بەسەد بەشەوە، نەوەدو نۆ بەشیانی لای خۆی هێشتۆتەوە، هەڵی گرتوون بۆ رۆژی قیامەت، لەو رۆژە سەختەدا رەحمیان پێدەکا بەبەندەکانی خۆی، وەتاقەیەك بەشیانی ناردۆتە خوارەوە بۆناو زەوی، ئیتر ئەمەی کەدەیبینن دروستکرا وان لەناو خۆیانا هەموو رەحم بەیەکتری دەکەنو، بەزەیی یان بەیەکترییدا دێتەوە، ئەمە هەمووی بەشێکە لەوتاقە بەشە. جائەگەر بێبڕوا واتە: کافر — دەیزانی کە خودا چەنێ رەحمەتی زۆرە لەبەهەشت نائومێد نەدەبوو، هەروەها ئەگەر بڕواداریش دەیزانی کەخودا چەنێ بێ باکەو چەنێ سزای زۆر و تۆڵەی سەختی لەلا هەیە، کەس لەچوونە ناوئاگری دۆزەخ دڵنیانەدەبوو. (ریاض/٢ ل/٩ ز/٥٣ ژ/١/٤٤٣-باسی کۆکردنەوەی ترس و هیوا) + (تاج/٩ ز/٩ ل/٢٦ ژ/١ + تاج/٩ ل/٢٧٤ ز/٩٣ ژ/٢+٣+٤).

---

[٢٠١٢] و الحديث من أفراده (العيني/٢٣ ص/٦٧). —المترجم

٢٠١٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ. (الحديث ٦٤٧٤ – طرفه في: ٦٨٠٧)[٢٠١٣]:

سەهلی کوڕی سەعد -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: هەرکەسێ زامنێی زمانی و زامنێی داوێنی خۆیم بۆبکا، لەشەڕو خراپە ئەم دوو ئەندامەی خۆی بپارێزێ، منیش خۆم دەبم بەزامنێی بەهەشت بۆی! واتە: موسوڵمانی داوێنپاك و زمانپاك بەهەشتیە. (تاج/١٠ ز/٢ ل/٨ ژ/٤ + تاج/٣ ز/٩٢ ل/٢٣٧ ژ/٢) + (ریاض/٣ ز/٢٥٤ ل/١١٠٣ ژمارە/١٥١٣- باسی غەیبەت و پاشەملە -ش).

٢٠١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَرْفَعُهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَاتٍ وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لَهَا بَالًا يَهْوِي بِهَا فِي جَهَنَّمَ. (الحديث ٦٤٧٨ طرفه في: ٦٤٧٧)[٢٠١٤]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ -دروودی خوای لەسەر بێ- وارێ دەکەوێ کەبەندەیێ قەسەیێ دەکا، لەو جۆرە قسانەی کەدەبن بەمایەی رەزای خودا، ئەوەندەیش دڵی ناداتێ، بەهۆی گوتنی ئەوقسەیەوە، خودا ئەوبەندەیێ چەندین پایە بەرز دەکاتەوە، وەهەروەها ڕێ دەکەوێ کەبەندەیێ قسەیێدەکا، لەوجۆرە قسانەی کەدەبن بەهۆی تووڕەیی و ڕەنجاندنی خودا، ناچێتە بنجو بناوانی و بەباشی لێی ورد نابێتەوە، تابزانێ

---

[٢٠١٣] أ- متفق عليه: البخاري (٦٤٧٤، ولم أجده في مسلم هامش رياض الصالحين. تخريج حديث رقم/٣/١٥١٣. -المترجم-

ب- ولم يوافقه مسلم على تخريج حديث سهل بن سعد: من لم يضمن لي. فتح/٣ ص/٣١٠. -المترجم-

[٢٠١٤] قال النووي في رياض الصالحين: (رواه البخاري) يعني من أفراده. -المترجم-

قسەکەی کوێدەگرێتەوە، کەچی بەهۆی ئەوقسەیەوە دەخزێتە ناوئاگری دۆزەخەوە!. (تاج/١٠ ز/٢ ل/٧ ژ/١-پاراستنی زمان + ریاض/٣ ز/٢٥٤ ل/١١٠٥ ژمارە/٦/١٥١٥).

٢٠١٥- عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَثَلِي وَمَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْمًا فَقَالَ رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَيَّ وَإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ فَالنَّجَاءَ النَّجَاءَ فَأَطَاعَتْهُ طَائِفَةٌ فَأَدْلَجُوا عَلَى مَهْلِهِمْ فَنَجَوْا وَكَذَّبَتْهُ طَائِفَةٌ فَصَبَّحَهُمُ الْجَيْشُ فَاجْتَاحَهُمْ. (الحديث ٦٤٨٢ طرفه في: ٧٢٨٣)[٢٠١٥]:

ئەبو موسا -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: نموونەی منو ئەم ئایینە پیرۆزەی کەخوا بەمنا ناردوویەتی، وەك نموونەی پیاوێکی ڕاستگۆ وایە، کەبە دڵسۆزی هۆزەکەی خۆی لە مەترسییەکی گەورەی نزدیك هۆشیار بکاتەوە، بچێتە ناویان و بڵێ: بەچاوی خۆم ئەو سوپایەم دی، کە هاتووە بۆسەر ئێوە، وەمن ترسێنەرێکی ڕاستو دروست و پەتیم بۆ ئێوە، دەی هەتازووە خۆتان رزگارکەن، درەنگە درەنگ!! جا کۆمەڵێ لەهۆزەکەی بڕوای پێبکەن و بەگوێی بکەنو رزگاریان ببێ، بەم شێوەیە: لەسەرەتای شەوەوە لەسەرەخۆشە وڕەوی بکەنو خۆ قوتارکەن، کۆمەڵێکی تریشیان هۆشیار کردنەوەکەی بەردرۆبزانن و باوەڕ بە ئامۆژگاریەکانی نەکەن وبێئاگا پشتی لێبکەنەوە، هەتا لەگەڵ بەیانا سوپاکەبدا بەسەریانا و تەفرو تونایان بکەنو بەفەتارەتیان بەرن.

٢٠١٦- عَنْ عَبْدِاللَّهِ رَضِيَ اللَّه عَنْه قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْجَنَّةُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ وَالنَّارُ مِثْلُ ذَلِكَ. (الحديث ٦٤٨٨)[٢٠١٦]:

---

[٢٠١٥] اخرجه مسلم في الفضائل، باب: شفقة صَلى اللهم عَلَيهِ وَسَلمَ على امته، رقم/٢٢٨٣.

[٢٠١٦] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث: الجنة اقرب إلى احدكم -خاتمة كتاب الرقاق ج/١٣ ص/٣١٠. -المترجم-

عەبدوڵلا -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: هەرکەسێ لەئێوە بگری بەهەشتی لێوە نزیکترە لە بەنپێڵاوی کەوشەکانی، دۆزەخیش هەروەها. (ریاض/٢ ز/٥٣ ل/٣١ ژ/٣/٤٤٥-کۆکردنەوەی ترس‌و هیوا لەدڵا).

روونکردنەوە:

واتە: کەس نازانێ بەهۆی چییەوە خوالێی دەڕەنجێ، یابەهۆی چییەوە خوا لێی خۆش دەبێ، کەواتە: مرۆڤ تادەتونێ کاری خێر زۆر بکا، سا بەشکوو بەهۆی یەکێکیانەوە خوالێی خۆش بێ، وەهەروەها تادەتوانێ لەخراپە، لەگەورەو بچووکی، لەکەم‌و لەزۆری، دووربێ، نەبادا خوانەخواستە، بەهۆی یەکێکیانەوە ببێ بەدۆزەخی؟ (تاج/١٠ ز/١٤ ل/٤٨ ژ/٣-ترسی خودای گەورە).

٢٠١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ: حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ وَ حُجِبَتِ الجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ. (الحديث ٦٤٨٧)[٢٠١٧].

ئەبوهورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئاگری دۆزەخ بەئارەزووبازی پەرژین کراوە، بەهەشتیش بەبێ دڵی کردنی دەروون پەرژین کراوە. (تاج/١٠ ل/٤٧ ز/١٤ ژ/٢-ش/ت).

٢٠١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي الْمَالِ وَالْخَلْقِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ. (الحديث ٦٤٩٠)[٢٠١٨].

---

[٢٠١٧] اخرجه مسلم في أول كتاب الجنة وصفة يفعها و اهلها رقم/٢٨٢٢، ٢٨٢٣.

[٢٠١٨] أخرجه مسلم في الزهد و الرقاق، رقم: ٢٩٦٣.

ئـەبو هـورەیرە -ڕەزای خـوای لێ بـێ- لەخۆشەویـستەوە -دروودی خـوای لەسەر بـێ- دەفـەرموێ: ئەگـەر تەماشـای کەسـێکتان کـرد، کەلـەماڵو سـامانو شێوە جوانیـدا، بـاوی هـەبوو بەسـەر ئێـوەوە، باتەماشـای خـوار خۆشـتانەوە بکـەن، نـەبادا بـەهۆی ئـەوەوە خۆتـان بەمەغـدوور بـزانن‌و، ئـەونازو بـەهرەو نیعمەتەی کە خواپێی بەخشیون بەکەم بزانن‌و سەبارەت بەوە تووشی هەڵەو ناسوپاسی ببن!. (تاج/٩ ز/٩٦ ل/٢٩٩ ژ/٢+ل-٣٠٠ ژ/٣).

٢٠١٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً. (الحديث ٦٤٩١)[٢٠١٩].

ئیبنو عەباس -ڕەزای خوا لەخۆیو بابی بێ- فەرمووی: لەفەرموودەیـەکی قودسـیدا، کـە پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- دەیگێڕێتـەوە لـەخودای گـەورەو پـیرۆزەوە، فـەرمووی: خـودای گـەورە دەفـەرموێ: خـودا هـەموو چاکەیەك‌و هەموو خراپەیەکی لە (لوح المحفوظ) نوسیوەو بەم شێوەیە روونی کردۆتەوە، بۆ هەموو کەسێ: ئەگەر کەسێ ویستی چاکەیێ بکاو بۆی نـەکرا، ئـەوە خـودا لـەلای خـۆی چـاکەیەکی تـەواوی بـۆ دەنوسـێ، وەئەگـەر کەسـێ ویـستی چاکەیێ بکـاو لەهـەمان کاتـدا کـردی ئـەوە خـودای سـەردارو سـەروەر لەلای خـۆی لـە دە چاکەوە تـا حـەوت سـەد چاکە، تـا ئەوەنـدەی خـودا خـۆی حەزدەکا چاکەی بۆ دەنوسـێ، وەئەگـەر کەسـێ ویـستی خراپـەیێ بکـات بـەڵام نـەیکرد ئـەوە خـودا لـەلای خـۆی چاکەیەکی تـەواوی بـۆ دەنووسـێ، وەئەگـەر

[٢٠١٩] اخرجه مسلم في الايمان، باب: إذا هم العبد بحسنة كتبت ...رقم/١٣١.

کەسێ ویستی خراپەیێ بکا، وەکردی، ئەوە خودا بەیەك خراپە دەینووسێ لەسەری. (ریاض/١ ز/١ ژ/١١/١١ ل/١٦-ش. باسی: نیازو نیاز پاکی...).

٢٠٢٠- عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْه قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَدِيثَيْنِ قَدْ رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا وَأَنَا أَنْتَظِرُ الْآخَرَ حَدَّثَنَا أَنَّ الْأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ ثُمَّ نَزَلَ الْقُرْآنُ فَعَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ وَعَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ ثُمَّ حَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِ الْأَمَانَةِ قَالَ يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْوَكْتِ ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْمَجْلِ كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ فَنَفِطَ فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا وَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ ثُمَّ أَخَذَ حَصًى فَدَحْرَجَهُ عَلَى رِجْلِهِ فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ لَا يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الْأَمَانَةَ حَتَّى يُقَالَ إِنَّ فِي بَنِي فُلَانٍ رَجُلًا أَمِينًا حَتَّى يُقَالَ لِلرَّجُلِ مَا أَجْلَدَهُ مَا أَظْرَفَهُ مَا أَعْقَلَهُ وَمَا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ وَمَا أُبَالِي أَيَّكُمْ بَايَعْتُ لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ دِينُهُ وَلَئِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا أَوْ يَهُودِيًّا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ سَاعِيهِ وَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ لِأُبَايِعَ مِنْكُمْ إِلَّا فُلَانًا وَفُلَانًا. (الحديث ٦٤٩٧ طرفاه في: ٧٠٨٩، ٧٢٧٦)[٢٠٢٠].

حوزەیفە -رەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەری خودا – دروودی خودای لەسەر بێ -دوو فەرمایشتی لەبارەی سپاردەوە پێمان فەرموو، یەکێکیانم بەچاوی خۆم دی کەهاتە دی، کەبریتی بوو لە هاتنی سپاردە (ئەمانەت) وە چاوەنواڕی ئەوی تریشیانم کە بێتە دی، بریتی یە لەنەمانی ئەمانەت، واتە: سپاردە. یەکەم: ئەوە بوو فەرمووی پێمان: ( ئەمانەت –واتە: سپاردە– کەهاتە خوارەوە، لەناخی دڵی پیاو چاکان وەك چینی سەحابەو تابیعین بەسروشت سپاردە پەروەر بوون، بەرە بەرە قورئانیش دەهاتە خوارەوە، سوننەتی پێغەمبەریش لەدوا ئەو دەهات، ئیتر ئەوانیش

[٢٠٢٠] أخرجه مسلم في الايمان، باب: رفع الأمانة و الإيمان من بعض القلوب، رقم/١٤٣.

بەفێربوونی قورئان‌و بەزانینی شەریعەت، سپاردەیان بەباشی‌و بەجوانی پەروەردەکرد).

فەرمایشتی دووەم ئەوە بوو باسی نەممانی ئەمانەتی بۆ کردین، فەرمووی -درودی خوای لەسەر بێ- (کاتێ ئەمانەت هەڵ دەگیرێ بەرەبەرە نامێنێ، پیاو دەبێ خەوی لێ دەکەوێ، لەو خەوەدا سپاردە لەدڵی وەردەگیرێتەوە، بەرەبەرە شوێنەکەیشی لەناو دڵا کوێر دەبێتەوە، لەسەر ئەم شێوەیە:

یەکەمجار شوێنەکەی وەك نیتکەیەکی ڕەش دەمێنێتەوە، دووەمجار کەخەوی لێ دەکەوێ ئەوەیشی کە ماوە لەدڵیا ئەوەیش دەڕواو هیچی نامێنێ، ئیتر شوێنەکەی وەك تلۆقی لێ دێ، نووری ئەمانەت، ڕووناکی ی سپاردە، کە لەدڵ بار دەکا، وەك ئەو پشکۆیە وایە کەبینێیت بەقاچی خۆتاو، شوێنەکەی هەڵتۆقێ، سەیر دەکەیت قاچت بلۆق دەکاو، بلۆقەکەو شوێن بلۆکەو، تاماوەیێ دەمێنێ، بەلاّم پشکۆکە نەماوەو سکڵەکە دیار نییە، ئەمانەتیش کە لەدڵ باری کرد ئاوایە!

ئەوجا بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستە کە پتر، چەوێکی هەڵگرت‌و تلاینەوە بەسەر قاچی خۆیاو، نیشانی دا کەپشکۆکە ئاوابنێ بەقاچی خۆیا. فەرمووی: ئیتر بەرە بەرە کەس متمانە بەکەس ناکا، تاوای لێ دێ، خەڵك مامەڵەو سەودا لەگەڵ یەکتری دەکەن، بەلاّم خەریك دەبێ کەکەس ئەمانەت بەجێ نەهێنێ، تاوای لێ دێ پیاوی ئەمین‌و دەستپاك واکەم دەبێ، دەڵێن: لەناوفیسارە خێڵدا پیاوێکی دەستپاکی ئەمین ماوە! وای لێ دێ دەبێ بەپاشاگەردانییەکی وا، قسەو گوتاریان بایەخی نامێنێ، پیاوی واپەیدا دەبێ سەنگی دەنکە خەرتە لەێی چییە، باوەڕوئیمان لەدڵیا نییە، کەچی پێی دەڵێن: ئای لەم شا پیاوە، چەندە ژیرو هۆشیارە، یاچەندە سەلارو ناسك‌و نازدارە، یاچەندە بەجەرگ‌و ڕەشیدو ئازایە! (بەڕاستی ئێستا ڕێك وایە).

حوزەیفە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەیفەرموو: ئەو سەردەمە نەماوە کەمن دەربەست نەبووم، کەلەگەڵ هەر کامێکتانا مامەڵەو سەودام بکردایە، ترسم نەبوایە، چونکە مامەڵە کارەکە ئەگەر خۆی موسڵمان بوایە، ئایین و دینەکەی نەیدەهێشت کەگزیو ناپاکیم لێ بکا، خۆئەگەر گاورو جوولەکەش بوایە، سەرکارەکەی سەری، نەیدەهێشت کەگزیو ناپاکیم لێ بکا! بەلام ئەمڕۆ مەگەر لەگەڵ فیسارە کەس و فیسارەکەس بتوانم مامەڵەو سەودا بکەم و لێیان دلنیابم!) . ( تاج/١٠ ل/٦٩ ز/١٨ ژ/١ ش/ت باسی سپاردە هەڵ دەگیرێ) + (ریاض/١ ل/١٨٣ ز/٢٥ ژ/٢/٢٠٠ باسی فەرمانکردن بەدانەوەی ئەمانەت — سپاردە-)

٢٠٢١– عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَجِدُونَ النَّاسَ كَإِبِلٍ مِائَةٍ لَا يَجِدُ الرَّجُلُ فِيهَا رَاحِلَةً. (الحديث ٦٤٩٨)[٢٠٢١]:

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: (ئەو خەڵکە بێ متمانەن، متمانەیان پێ ناکرێ، مەگەر چۆنەها، هەروەك چۆن لەسەرد وشتردا، وشترێکی رەسەنت دەست ناکەوێ کەدەست بدا بۆ سواری ئاوا!).

٢٠٢٢– عَنْ جُنْدَبٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ يُرَاءِ يُرَاءِ اللَّهُ بِهِ وَمَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ.(الحديث )[٢٠٢٢]:

جوندوب -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ( هەرکەسێ بۆ ناوبانگ و شۆرەت چاکەوخودا پەرستی بکا، خودا لەجیهانا دەیکا بەپەندو، لەقیامەتیشا بێ پاداشتی دەکا،

---

[٢٠٢١] أخرجه مسلم في فضائل الصحابة، باب: قوله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الناس كإبل مائة...)، رقم/٢٥٤٧.

[٢٠٢٢] أخرجه مسلم في الزهد و الرقاق، باب: من اشرك في عمله غير الله: رقم/٢٩٨٦.

وەهەرکەسێ بۆ ڕواڵەتو ریابازیی هەرکارێ بکا، خودا لەڕۆژی قیامەتدا پەردەی لەروو هەڵ دەماڵێو ریابازییەکەی ئاشکرا دەکا). ( تاج/١ ل/٧٣ ز/١٣ ژ/١ ش/ت هەڕەشە کردن لەریا کاری وریابازی).

٢٠٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ اللَّهَ تبارك وتعالى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنَا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ نَفْسِ الْمُؤْمِنِ يَكْرَهُ الْمَوْتَ وَأَنَا أَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ. (الحديث ٦٥٠٢)[٢٠٢٣]:

ئەبو هوریرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: کەسێ گەڕ بکا بەخۆشەویستێکی منو دوژمنایەتی بکا لەگەڵ دۆستێکی من دا، یاشەڕ پێ بفرۆشێ، ئەوە دوژمنایەتی لەگەڵ مندا دەکاو شەڕ بەمن دەفرۆشێ، کەواتە باخۆی ئامادە بکا بۆ شەڕکردن لەگەڵ خۆمدا، من خۆم شەڕی تێ دەبەستمو لەجیاتی ئەو دۆستە نازدارەم بۆی دەچمە مەیدانی جەنگو شەڕی لەگەڵ دەکەم، وە عەبدو بەندەی من بەهیچ شتێکی باشو خۆشەویست وەك ئەوە خۆی لەمن نزیك ناکاتەوە، کەوەك بەکردن ئەو شتانەی فەرزو پێویستم کردووە لەسەری خۆی لەمن نزیك بکاتەوە، باشترین هۆکار بۆ نزیکبوونەوە لەخوای پەروەردگار، جێ بە جێ کردنی فەرزەکانە وەبەرە بەرە بەندەی من بەکردنی سوننەتەکان خۆی لەمن نزیك دەکاتەوەو خۆی دێنێتە پێشەوە، هەتا خۆشەویست دەبێ لەلام، جاکاتێ بەندە، بەکردنی عیباداتی جوان،

---

[٢٠٢٣] لم يوافقه مسلم على حديث أبي هريرة، (من عادى الي وليا..). (فتح/١٣ ص/٣١٠ خاتمة كتاب الرقاق – طبعة جديدة). -المترجم-

گەیشتە ئەو پایەی کەببێ بەخۆشەویستو دۆستی من، ئیتر خۆم دەبم بەگوێو چاوو دەست پێ بۆی! هەرچی بەدڵی من نەبێو بۆ ڕەزای من نەبێ، نەگوێ ی دەداتێو نەتەماشای دەکاو نەدەستی بۆ دەباو نەبۆی دەچێ! ئیتر منیش بێ دڵی ئەو ناکەمو دڵی ناشکێنم، هەرچیم لێ داوابکا، بەبان چاو دەیدەمێو بەدەستی خۆم دەیدەمێو بەپێ ی خۆم بۆی دەبەم، ئەگەر پەنام بۆ بێنێ پەنای دەدەم، لە کردنی هیچ شتێ وەك ئەوە سێو دوو ناکەم، وەك ئەوە کە لە کێشانی گیانی موسوڵمانا، سێو دوو دەکەم، چونکە ئەو حەزی لەمردن نییە، وەمنیش هەرچەند حەزم لەبێ دڵی ئەو نییە بەڵام مردنیش کارێکی ناچارییە، هەردەبێ ببێ). (ریاض/١ ز/٤٧ ژ/٣٨٦/١/ = ل/٣٠١ چاپی دووەم + ز/١١ ژ/٩٥ ل/١٠٥ -باسی تێکۆشانو لێبڕان بۆ خوا، باسی نیشانەی خۆشەویستی خوا).

٢٠٢٤- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ. (الحديث)[٢٠٢٤]:

ئەم فەرموودەیە لە ریاض الصالحین دا، لەعائیشە وە ئاوایە: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر –دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی– فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: هەرکەسێ حەز بەدیداری خودا بکات، خودایش حەز بەدیداری ئەو دەکا، وەهەرکەسێ حەز لەدیداری خودا نەکات، خودایش حەز لەدیداری ئەو ناکاتو حەزی لەچارەی نییە، عائیشە فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: جا خۆئەی پێغەمبەری خودا! کەسمان حەز لەمردن ناکەین، گوایە دەبێ خوداش حەز لەئێمە نەکا؟

---

[٢٠٢٤] أخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب/ من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه... رقم/٢٦٨٣.

خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (مەبەست ئەمە نییە کە تۆ تێ ی گەیشتویت، بەلاّم مەبەست ئەوەیە کاتێ موسوڵمان لەسەرە مەرگا فریشتەی —ڕەحمەتی خودای لێبێ- مـوژدەی ڕەحمەتو ڕەزامەندییو ڕێزلێگرتنی خودای دەدەنێ لەگەڵ نازو نیعمەتو بەهرەی بەهەشتا، ئیتر ئەویش هیچی وەك ئەو دنیا پێ خۆش نابێ، وەحەز لەدیداری خودا دەکاو، خوداش حوز بەدیداری ئەو دەکا، ناموسوڵمانیش کاتێ کەمردن قورتمی دەگرێ، وەموژدەی سزای سەختی خودای پێ دەدرێ، ئیتر هیچی تری وەك ئەو جیهان پێ ناخۆش نابێ، وەحەز لە دیداری خودا ناکاو، خوداش حەز لەچارەی ئەو ناکا). (ریاض/٤ ل/١٣٣٦ ز/٣٧٠ ژ/١٨٤٨/٤١ -موسلیم).

٢٠٢٥- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيِ اللَّهُ عَنْها قَالَتْ: كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْأَعْرَابِ جُفَاةٌ يَأْتُونَ النبِي صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَسأَلُونَهُ: مَتَى السَّاعَةِ، فَكَانَ يَنْظُرُ إِلَى أَصْغَرِهِمْ فَيَقُولُ: إِنْ يَعِشْ هَذَا لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ سَاعَتُكُمْ (يعني موتهم). (الحديث ٦٥١١)[٢٠٢٥]:

عائیشە — ڕەزای خوای لێ بێ — فەرمووی: گەلێ جار پیاو گەلێکی سارا نشینی عەرەب، کەبەسوشتو شكو ڕەقن، دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەر — دروودی لەسەر — پرسیاریان لێ دەکرد: کاتێ قیامەت کەی دێ؟ ئەویش تەماشای هەرە بچکۆلەکەیانی بەتەمەن دەکردو دەیفەرموو: ( ئەگەر ئەم کوڕە بژی، بەر لەوەی پیر ببێ کاتی قیامەتی ئێوە دێ). هیشامی کوڕی عوروە دەیفەرموو: واتە: کاتی مردنی ئێوە دێ. (تاج/١٠ ل/٢٧٥ ز/١٠٥ —باسی نیشانەی داهاتنی قیامەت).

٢٠٢٦- ع عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَكُونُ الْأَرْضُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُبْزَةً وَاحِدَةً يَتَكَفَّؤُهَا الْجَبَّارُ بِيَدِهِ كَمَا يَكْفَأُ

---

[٢٠٢٥] اخرجه مسلم في الفمن و أشرط الساعة، باب/ قرب الساعة، رقم/٢٩٥٢.

أَحَدُكُمْ خُبْزَتَهُ فِي السَّفَرِ نُزُلًا لِأَهْلِ الْجَنَّةِ فَأَتَى رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ بَارَكَ الرَّحْمَنُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ أَلَا أُخْبِرُكَ بِنُزُلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ بَلَى قَالَ تَكُونُ الْأَرْضُ خُبْزَةً وَاحِدَةً كَمَا قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَظَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَيْنَا ثُمَّ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ ثُمَّ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكَ بِإِدَامِهِمْ قَالَ إِدَامُهُمْ بَالَامٌ وَنُونٌ قَالُوا وَمَا هَذَا قَالَ ثَوْرٌ وَنُونٌ يَأْكُلُ مِنْ زَائِدَةِ كَبِدِهِمَا سَبْعُونَ أَلْفًا. (الحديث ٦٥٢٠)[٢٠٢٦]:

ئەبو سەعیدی خودری -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ڕۆژی دەستا خێز (قیامەت) گۆی زەوی دەبێ بەیەك كولێرە، خودا وەندی بەزەبرو زەنگ، بەدەستی خۆی ئەم دەستاو ئەو دەستی پێ دەكا، وەكوو چۆن یەكێ لەئێوە لەسەفەرا، كولێرە بنئاگرە لەبن ئاگردا دەبرژێنێو، كە دروستی دەكا، ئەم دەستەو ئەو دەستی پێ دەكا، هەتا تۆزێ پان ببێتەوە ئاوا، خودا ئەم كولێرەی گۆی زەوی یە دەكا بەنانی میوانداریی بۆ بەهەشتیەكان، لەئێستگای مەحشەردا بەر لەچوونە بەهەشت، وەك بەركولێ دەیخۆن! لەو كاتەدا، پیاوێكی جوولەكە هات گوتی: ئەی باوكی قاسم! خودا پێت فەڕ بەسەرتا بڕێژێ، باعەرزت بكەم كە لەڕۆژی قیامەتا یەكەم زیافەتی بەهەشتیەكان چییە؟ فەرمووی: (ئادەی بلێ) گوتی: گۆی زەوی دەبێ بەتاقە كولێرەیەك. جوولەكەكەش فەرمایشتەكەی پێغەمەری، سەبارەت بەبوونی زەوی بەكولێرە دووبارە كردەوە. پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- تەماشایەكی واتا بەخشی ئێمەی كردو تەواو پێكەنی، هەتا خرێ پاشینەكانی وەدەركەوتن، چونكە قسەی جوولەكەكە گوتەی تەورات بوو، ڕێكی فەرمایشتەكەی پێغەمبەر بوو، پاشان جولەكەكە گوتی: باپێت بلكێمو عەرزت بكەم كەپێخۆرەكەشیان چییە؟!، كابرای جووە گوتی: پێخۆرەكە یان بالامو نوونە، هاوڕێیان فەرموویان: بالام چییەو نوون چییە؟

---

[٢٠٢٦] أخرجه مسلم في صفات المنافقين و أحكامهم باب/منزل أخل الجنة، رقم: ٢٧٩٢.

كابراى جووه گوتى : بالام گاجووتەو نونيش ماسىو نەهەنگە، لەپارچە گۆشتە زيادەكەى جگەرى ئەم دوانە، كە خۆشترين پارچە يانە، حەفتا هەزار بەهەشتى لێ ى دەخۆن). (تاجى كوردى/١٠ ل/٣٦٠ ز/١١٨ ژ/٣ -باسى حەشر لەسەر زەوييەكى نوێ دەكرێ) + (تاج/١٠ ل/٤٧١ ز/١٤٧ ژ/١ باسى يەكەم خۆراكو يەكەم خواردنەوەى خەڵكى بەهەشت) + (تاجى كوردى/٦ ل/١١ ز/٣ ژ/٧ -تەفسيرى سوورەتى بەقەرە).

٢٠٢٧- عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ قَالَ سَهْلٌ أَوْ غَيْرُهُ لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لِأَحَدٍ. (الحديث ٦٥٢١)[٢٠٢٧]:

سەهلى كوڕى سەعد -ڕەزاى خواى لێ بێ- فەرمووى: ژنەوتم لەزارى پيرۆزى پێغەمەر خۆى -دروودى خواى لەسەر بێ- دەيفەرموو: ( ڕۆژى قيامەت، مەردوم هەموو لەسەر زەمينێكى سپى مەيلەو سوور، حەشر دەكرێن، كەوەك كولێرەى باراشى پاك كراوى بێژراوەى بێ سۆسو كەپەك وايە).

سەهل -يايەكێكى تر- لەگێڕەرەوەكانى ئەم فەرموودەيە فەرمووى: (ئەو زەوى يە، زەوى يەكى ترى نوێ يە جيايە لەم عەردەى ئێستاى خۆمان، كەئێستا لەسەرى دەژين لەبەر ئەوە نيشانەى خاوەنێتىو پەيوەندىو دياريكردنى جێگەو ڕێگەى پێوە نييە، بەهەر چوارلادا هەتا چاو بڕكا، دەشتێكى سافى بێ بەرزىو نزمىو بێ نيشانەو شوێنەوارە). (تاج/١٠ ل/٣٦٠ ز/١١٨ ژ/٢ ش-حەشر لەسەر زەوييەكى نوێ دەكرێ).

٢٠٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلَاثِ طَرَائِقَ رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ وَثَلَاثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ

---

[٢٠٢٧] أخرجه مسلم في صفات المنافقين و أحكامهم باب: في البعث و النشور و صفة الأرض، رقم/٢٧٩٠.

وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ وَتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ تَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا وَتَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا. (الحديث ٦٥٢٢)[٢٠٢٨]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (تۆزێ لەپێش بەرپابوونی قیامەتدا، حەشرێ لەجیهاندا دەبێ، لەم حەشرەدا مەردوم بەسێ کۆمەڵ کۆدەکرێنەوە، دەستەی یەکەم: پێشەنگەکانن، ئارەزوومەندی دیداری خودانو لەڕابووردوویان بێزارن، چونکە ئەوەندە تامەزرۆی دیداری خودان، لەهەموو شتێکی تر بێزارن.

دەستەی دووەم: ئەوانەن کە دووکەس ، یا سێ کەس، یاچوار کەس، یاپێنج کەس، یاشەش کەس، یاحەوت کەس، یاهەشت کەس، یا نۆکەس، یادەکەس، بەسەرەو بەنۆرە بەرودوا سواری یەك وشتر دەبن، یاخود دووکەس دووکەس، یاسێ کەس سێ کەس، پێکەوە لەپاشکۆی یەکتری یەوە سواری یەك وشتر دەبنو... تاد. وەهەرچی لەمانە مایەوە ئەوە دەستەی سێیەمنو، ئایەخی هەرسێ دەستەکەن، ئەمانە پیادەن بەپێ دەڕۆن، ئاگر وەك شوان دەیانداتە بەرو وەك ڕات بەرەو سارای مەحشەرییان دەخوڕێ، ئیتر چەند ڕۆژ بەڕێوەبن ئاگرەکەش لەگەڵیاناە، لەهەرکوێ شەو بکەنەوە ئاگرەکەش بەدیاریانەوە شەو دەکاتەوە، لەهەر کوێ نیوەڕوان وچان بگرن، ئاگرەکەش لەوێدا لەگەڵیانا وچان دەگرێ، لەهەر کوێ بەیان بکەنەوە هەروەها، وەلەهەر کوێ ئێوارەیان لێ بێ هەروەها -ش. (تاج/١٠ ز/١١٧ ل/٣٥٨ ژ/٤).

٢٠٢٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَتْ: قال رسول الله صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا. قالت عائشة: فقلتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ الرِّجَالُ وَ

---

[٢٠٢٨] اخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمها، باب/ فناء الدنيا وبيان الحشر يوم القيامة، رقم/٢٨٦١.

النِّسَاءُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ فَقَالَ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يهمهم ذاك. (الحديث ٦٥٢٧)[٢٠٢٩]:

عائیشه – ڕەزای خودای لێ بێ – فەرمووی: پێغەمبەر- دروودی لەسەر – فەرمووی: ( ئێوە ئەی بەرەی ئادەمیزاد! لەڕۆژی قیامەتا بەرووتو قووتیو بەپێخاوسیو بەسوننەت نەکراوی، حەشر دەکرێنو کۆدەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوە.

عائیشە فەرمووی: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوان

و ژنان پێکەوە دەبن، خۆ ئەوە تەماشای شەرمگای یەکتری دەکەن! ئایا وایە یانا؟ فەرمووی: (لەبەر دیژواری هەڵوێستو سەختی ئەو دەمە، کێ دەیپەرژێتە سەر شتی وا، کێ وەك خودا لەقورئانا دەفەرموێ: (لكل امرى منهم يومئن شأن يغنيه -٣٧/٨٠ – واتە: لەو ڕۆژەدا بارودۆخو هەڵوێست واشڵۆقو سەختو سەخڵەت دەبێ، کەس نایپەرژێتە سەر کەس، هەرکەسێ ئالاوە بەدەردی خۆیەوە نایپەرژێتە سەر شتی وا، مشووری کاری خۆی دەخواتو بەس!) . (تاجی کوردی/٧ ل/٢٣٧ ز/٦٣ -تەفسیری سوورەتی عەبەسە ژ/٣) + (ریاض/١ ل/٣١٨ ز/٥٠ ژ/٤١١/١٦ –ترسان لەقاری خودا –ش).

٢٠٣٠– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّه عَنْه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَعْرَقُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَذْهَبَ عَرَقُهُمْ فِي الْأَرْضِ سَبْعِينَ ذِرَاعًا وَيُلْجِمُهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ آذَانَهُمْ. (الحديث)[٢٠٣٠]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (لەڕۆژی ژیانەوەدا ئەو خەڵکە دەکەونە سەخڵەتیەکی

---

[٢٠٢٩] أخرجه مسلم في الجنة و صفة نضيمها، باب: فناء الدنيا، وبيان الحشر يوم القيامة، رقم/٢٨٥٩.

[٢٠٣٠] أخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمها، باب/ في صفة يوم القيامة، رقم/٢٨٦٣.

واوە ئارەق دەکەن، ئارەقێکی زۆر زۆر، تەنانەت حەفتا باڵ ئارەقیان بەناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە، وەکی تریش پەنگاوی ئارەقی لەشیان وائەوق دەکاتەوە، هەتا دەگاتە لالغاویان، گەلێ جار دەگاتە بناگوێ یان!) . (ریاچ/١ ل/٣١٤ ژ/٨/٤٠٣ ش).

٢٠٣١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ. (الحديث )[٢٠٣١]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتا، یەکەم شت کە ئادەمیزاد لەسەری دادگایی مەحکەمە دەکرێ، مەسەلەو پرسی خوێن ڕشتن و پیاکوشتنە. لەگێڕانەوەیەکی تاج دا دەفەرموێ: (یەکەم شت کەبەندە لەسەری بەرپرسیی (موحاسەبە) دەکرێ، مەسەلەی خوێن ڕشتنی ناهەق و کوشتنە). (تاجی کوردی/٣ ل/٢٠٠ ز/٨١ ژ/٢-ش/ت/ن) + (ریاض/٤ ل/١٣٣٤ ز/٣٧٠ ژ/١٨٤٥/٣٨).

٢٠٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّةِ إِلَى الْجَنَّةِ وَصَارَ أَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ أُتِيَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ ثُمَّ يُذْبَحُ ثُمَّ يُنَادِي مُنَادٍ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لَا مَوْتَ وَيَا أَهْلَ النَّارِ لَا مَوْتَ فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ وَيَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ. (الحديث)[٢٠٣٢]:

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- ڕەزای خودا لەخۆی و بابی - فەرمووی: خۆشەویست - دروودی خودای لەسەر - فەرمووی: ( کاتێ بەهەشتیەکان لەبەهەشتا جێگیر دەبن و تیادا دا دەمەزرێن، وەهەروەها دۆزەخیەکانیش لەدۆزەخ دا مۆڵ ئەدرێن، ئەوجا جاتڕچییەك جاڕ هەڵ دەداو

---

[٢٠٣١] أخرجه مسلم في القسامة، باب/ المجازاة بالدماء في الآخرة ...، رقم/١٦٧٨.

[٢٠٣٢] أخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمها، باب: النار يدخلها الجبارون، ٢٨٥٠.

بەدەنگی بەرز بانگ دەکا: ئەی دانیشتوانی بەهەشت! گوێ بگرن، ئەوانیش گوێ قولاخ دەکەن و دەنوارن، دیسان بانگی دۆزەخیەکان دەکاو دەڵێ: ئەی خەڵکی دۆزەخ! گوێ بگرن، ئەوانیش گوێ قولاخ دەبن و دەنوارن! ئەوجا مردن دێنن، لەشێوەی بەرانێکی تەودا، لەسەر شوورەکەی نێنوانی بەهەشت و دۆزەخ کەپێی دەگوترێ ئەعراف، ڕایدەگرن، جارچییەکە بەهەردوولا دەڵێ: ئەمە دەناسن؟ دەڵێن: بەڵێ ئەمە مردنە، هەموویان بەباشی چاویان لێیەتی، جایە حیای کوڕی زەکەریا بەرانەکە پاڵ دەخاو سەری دەبڕێ، ئەنجا جارچیش بانگەواز هەڵ دەدا: ئەی خەڵکی بەهەشت! خۆشی لەئێوە، موژدەتان لێ بێ، ئیتر مردن نەما، هەتا هەتایە لەبەهەشتا بەخۆشی دەژین! وە ئەی خەڵکی دۆزەخ! قوڕبەبانی چاوتان، دەرگای ئومێدتان بەئێجگاری لێ داخرا، ئیتر مردنیش نەما، هەتا هەتایە ئەمە شوێنتانە! جابە هەشتیەکان بەم بۆنە خۆشەوە ئەوەندەی تر کەیفخۆش و شادمان دەبن و، دۆزەخیەکانیش بەهۆی ئەم ڕووداوە دڵ ئەزینەوە ئەوەندەی تر خەمبارو خەفەتبار دەبن). (تاج/٧ ل/١٩ ز/٢ ژ/٢ ش/ت -تەفسیری سوورەتی مەریەم).

٢٠٣٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لِأَهْلِ الْجَنَّةِ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ فَيَقُولُونَ لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ فَيَقُولُ هَلْ رَضِيتُمْ فَيَقُولُونَ وَمَا لَنَا لَا نَرْضَى يَا رَبِّ وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ فَيَقُولُ أَلَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ فَيَقُولُونَ يَا رَبِّ وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ فَيَقُولُ أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلَا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا. (الحديث ٦٥٤٩ – طرفه في: ٧٥١٨)[٢٠٣٣]:

ئەبو سەعیدی خودری -ڕەزای خوای لێ بێ- ووی: خۆشەویست -درووودی خوای لەسەر بێ- ووی: خودای پاك و پیرۆزو مەزن، بەبەهەشتیەکان

[٢٠٣٣] اخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمها، باب: إحلال الرضوان على أهل الجنة، رقم: ٢٨٢٩.

دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەی بەهەشتینە! ئەوانیش بەیەك دەنگ دەڵێن: بفەرموو ئەی پەروەردگارمان! هەمیشە ئێمە بەندەی کە مەربەستەین‌و ئامادەین بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانت، سەرچاوەی گشت خێرو خۆشی‌و بەهرەیی، والە هەردوو دەستی توانایی تۆدا، خودای گەورە دەفەرموێ: ئایا بەش‌و بارەی باشی خۆتان لەبەهەشتا رازین‌و پێی خوشنوودن؟ دەڵێن: ئەی بۆ ڕازی نابین، لەم بەش‌و بارە باشە، کەتۆداوتە بەئێمە دەبێ باشتر هەبێ؟ کێی تر بەش‌و بارەی وا زۆر باشی پێ دراوە؟ خودا دەفەرموێ: ئەدی دەڵێن چی ئەگەر لەوەیش باشترتان پێ خەلات بکەم؟ دەڵێن: جاشتی واهەیە دەبێ چی شتێ هەبێ کەلەوە باشتر بێ؟! دەفەرموێ: (خۆشنودی و رەزامەندیی خۆمتان دەدەمێ‌و لێزەمەی لێڕازیبوونی خۆم دا دەبارێنم بەسەرتانداو لەناو بەهەشتی ریزوانی خۆما جێتان دەکەمەوەو ئیتر بەهۆی ئەوەوە هەتا هەتایەو هەرگیزاو هەرگیزو قەت قەت‌و ببڕای ببڕای لەم ڕۆ بەدواوە لێتان نارەنجێم). (ریاض/٤ ل/١٤٠٦ ز/٣٧٢ ژ/١٨٩٤/١٥ -ش - ب+م = ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم -رەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ-).

٢٠٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَا بَيْنَ مَنْكِبَيِ الْكَافِرِ فِي النَّارِ مَسِيرَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ لِلرَّاكِبِ الْمُسْرِعِ. (الحديث ٦٥٥١)[٢٠٣٤]:

ئەبو هوریرە -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەرفەرموێ: (لەشی دۆزەخیەکان ئەوەندەزل‌و گەورەیە، تەنانەت بەینی هەردوو سەرشانی ناموسوڵمان، لەدۆزەخ دا، سێ ڕۆژە رێیگەیە، بەڕۆیشتنی سواری خێراو تیژ ڕەو). (تاجی کوردی/١٠ ل/٤٩٨ ژ/١ ز/١٥٢).

---

[٢٠٣٤] اخرجه مسلم في الجنة، وصفة نعيمها، باب: النار يدخلها الجبارون و الجنة يدخلها الضعفاء، رقم:٢٨٥٢.

روونكردنەوە:

لەفەرمایشی دانەری تاجول ئوصوول‌و شێخی عەسقەلانی‌و مامۆستای عەینی‌و زانایان دەردەکەوێ کە: (کۆمەڵێ فەرموودەی بەهێز هەیە، کەمێ لەناو خۆیانا جۆرە جیاوازی یەکیان هەیە، قسە لەچۆنێتی‌و گەورەو بچووکی ئەندام‌و لەشی بێباوەڕان دەکەن لەناو دۆزەخا، وەك هەندێ فەرموودە باسی ئەوە دەکا کەهەندێ لەناموسوڵمانەکان زۆر زەبەلاح‌و فیلەتەنن، تەنانەت کاکیلەیەکیان بەقەد کێوی ئوحود دەبێ، یالەنەرمەی گوێ ی ناموسڵمانەوە، هەتا سەرشاخ، ماوەی حەوت سەد ساڵە ڕێگەیە، یائەستووریی پێستەکەی سێ ڕۆژە ڕێگەیە، یان ئەستوور پێستەکەی چل‌و دووباڵە، کابرایەکی زەبەلاح، یا جێ قنگی ناموسڵمان لەناو ئاگری دۆزەخ دا، بەقەد نێوانی رەبەزەو مەدینە دەبێ، یابە قەد نێوانی مەککەو مەدینە دەبێ، یازمانی ناموسڵمان، فرسەخێ، دوو فرسەخ رادەخرێ، خەڵکی بەسەریدا دەڕۆن‌و بەپێ دەیشێلن، وەهەندێ فەرموودەی تر باسی ئەوە دەکەن، کەجەستەی دەعیە زل‌و خۆبەزلزانەکان زۆر بچکۆلەن، وەك دەفەرموێ: خۆبەزلزانەکان، کاتێ حەشر دەکرێن، لەڕۆژی قیامەتدا، بەقەد مێرووچەیەك دەبن، لەسەر شەکڵ‌و شێوەی پیاو دەبن. وەگەڵێ فەرموودەی تری لەم بابەتانە هەیە، کەباسی چۆنێتی‌و چەندێتی ئەندام‌و لەش‌و قەبارەی ناموسوڵمانان لە دۆزەخادەکەن، لەگەڵ هەندێ جیاوازی لەهەندێ لایەنەوە، لەناو ئەم فەرموودانەدا، ئەمەیش قەیدی نییە چونکە:

١. لەپلەی یەکەما، مەبەست لەم دەربڕینانە، ئەوەیە کە موسوڵمان لەحاڵی شڕی بێباوەڕان حاڵی ببێ، کەلەدۆزەخا چەندە سزایان سەختە، وەشەیتان‌و دەستەی شەیتان تەفرەی نەدەن‌و لەقارو بێباکی خودای گەورە بترسێ‌و، هەمیشە ئەو ڕۆژە ڕەشەو ئێش‌و ئازارو سزای دۆزەخی لەبەر چاوبێ.

٢. سـزای دۆزەخیـەکان لـەدۆزەخ دا هـەموو وەکـوو یـەك نـین، بـەڵکوو جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوانی چەندیو چۆنی ی سزای دۆزەخیەکاندا، سزای فیرعەونو نەمروودو شەددادو ئەبو جەهل، گەلێ قورسو سەختترە، لەسزای ناموسوڵمانێکی رەشۆکی، کەنەداوای خوایەتی کردبێ، نـەزوڵمو زۆری لەکەسێ کردبێ، تەنیا لەسەر بێباوەڕیەکەی سزا بدرێ.

٣. گەلێ جار جۆری سزاو چۆنێتی لەشو جەستەیان، ئاماژەیە بۆ تاوانـەکانی جیهانیـان، وەك حەشـرکردنی دەعیـە زلان، لەسـەر شـێوەی پیـاوێ بەقـەد میرووڵەیی بێ!

٤. بۆیـە جەسـتەو ئەندامـەکانی بـێ بـاوەڕان گـەورە دەکـرێن، هـەتا بـەپێ ی ئەوە سزاو ئازار زیاتر بچێژن.

٥. ئەم جۆرە جیاوازی یانە هەموو تەئویل کراون، لەبەر ئەوە هـیچ کێشەیی دروسـت ناکـەن، بـۆ نمونـە دەڵـێن: هەنـدێ بێبـاوەڕ بـەپێ ی تاوانەکـەی، ئەسـتوری چـەرمەکەی سـێ ڕۆژە ڕێگـەیـە، وەهەنـدێکی تـر، ئەسـتووریی پێستەکەی چلو دوو باڵە، بـەپێ ی تاوانەکـەی، وەهەنـدێ تـر پێـنج ڕۆژە ڕێگەیە لەبەر هەمان هۆ...تاد.

٦. کەسێ بەچاوی ژیری، سەرەنجی حاڵی ژیـانی زۆرینـەی دروسـتکراوان بـدا، لەم جیهانی یەکەمەدا، کەبەتانو پۆی مەینەتو خـەمو خەفـەتو ئـێشو ئازارو کارەساتی دڵتـەزێن چنراوەو تـەنراوە، بـۆی دەردەکـەوێ کەلایـەنی تاریکی ژیان، نموونەیە کە لەژیانی ناو دۆزەخ، ئـەو هەمکـە ئـێشو ئـازارو ترس بارەو دەربارەو هـەزار هـەزار بـارە دەبنـەوە، تابلۆیـەکن لـەتابلۆکانی ژیـانی دۆزەخ، یـەك چـرکە نییـە لـەم ژینـەدا، کـەئێشو ئـازارو خـەمو خەفـەتو مەینـەت، وەك قیـسپ نـەبارێ، وابەبەرچـاوەوە کەڕۆژانـە بەملیۆنـەها ڕۆح دەکێـشرێ، لـەش بـێ سـەردەکرێ، کۆرپـە لەبـەر دایـك هەڵدەگرێ، گیانلەبـەرانی بـێ تـاوان دەبـن بـەژێر هەرەسـی بوومەلـەرزەو

رووخانی دارو پەردەوەوە، لافاوی مەرگ، بەهەزارویەك ناوەوە، گیانی نازداران دروێنە دەکا، ڕۆژانە بەهەزاران لاوو پیرو کچو کوڕو ژنو پیاو دەبن بەداوی شێر پەنجەو دەردی کوشندەی ترەوە، هەر موبتەلایە، بەسالّ، بەدەسالّ لەژێر باری ئیشو ئازاری گولّو گەڕیو دەردی بێ دەرمانا دەتلێتەوە، ئەم هەموو ئاژەڵە لەقەسابخانەکانا سەردەبڕێن، ئەم هەموو مەڵو مۆرو ئاسكو بزنو مەڕە، بەردەوام، گورگو شێرو پڵنگو هەڵوو داڵ، پەلپەلیان دەکەنو چاو و دڵو جەرگیان لەت لەت دەکەن! تەنانەت دەریاکان بەو زلیو پانیو پۆڕییەی خیان، سوور بوون بەخوێنی ماسی سك هەڵدڕاو و نەهەنگی شەقوپەقکراو، بەهاران ئەم هەمکە گیانلەبەرە خنجیلانە لەدایك دەبن، بەهەزارو یەك شێوە ڕازاونەتەوە، کەچی لەپایزا نا بەبێ تاوان، وەیشوومەو گەردەلوولی سەرماو سۆڵە، لەبەهەشتی ژین وە دەریان دەنێ!.

دەی ئەم کۆمێدی یە سەرمەدییە، ئەم شانۆی مەرگەساتەئەم بەردەوامبوونی ئەم هەموو ئێشو ئازارو ئەشکەنجەیە، بەلگەیە لەسەر بێ باکی ی خودا، هەروەك نموونەیەکە لەژیانی ناو دۆزەخی ئەو جیهان. خواپەنامان بدا. (بڕ/تاج/١٠ ل/٤٩٧ ز/١٥٢ ژ/ ١+ ٢+٣+٤+٥ ز/١٥٥ ژ/١+٢+٣).

٢٠٣٥- عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلّٰى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنَ النَّارِ بَعْدَ مَا مَسَّهُمْ مِنْهَا سَفْعٌ فَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ فَيُسَمِّيهِمْ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَهَنَّمِيِّينَ. (الحديث)[٢٠٣٥]:

ئەنەسی کوڕی مالیك- ڕەزای خودای لێ بێ - فەرمووی: خۆشەویست- دروودی لەسەر بێ- فەرمووی: (کۆمەڵێ دۆزەخی لەدۆزەخ دەردەچن، کەلەوەو بەر ئاگری دۆزەخ مۆری پیادا ناونو داخی کردوونو کردوونی

---

[٢٠٣٥] اخرجه مسلم من حديث ابي سعيد، وزاد فيه: فيدعون الله فيذهب عنهم هذا الاسم (عيني/٢٣ ص/١٣٣، فتح/١٣ ص٢٥٤ ط.ج). -المترجم-

بەسووتە مەرِۆ، جائەمانە کەدەچنە ناو بەهەشت، بەهەشتیەکان پێیان دەڵێن لە ناو بەهەشتا: کۆنە دۆزەخی یەکان! جالە خوا دوا دەکەن ئەم ناوەیان لەکۆڵ دەکاتەوە).

٢٠٣٦- عن النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ رَضِي اللَّهُ عَنهُ يَخْطُبُ قال سَمِعْتُ النبي صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَرَجُلٌ تُوضَعُ فِي أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَتَانِ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ. (الحديث ٦٥٦٢)[٢٠٣٦].

نوعمانی کوڕی بەشیر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: لەخۆشەویستم بیست دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەتا، ئەو کەسەی کەلە هەمووان سزای سووکترە، کابرایەکە دوو پشکۆ ئاگر دەخەنە سەر هەر دوو بەری پێ ی، مێشکی پێیان دێتە کوڵ، وەك مەنجەڵو حەوجۆشی سەر ئاگر). (تاج/١٠ ز/١٥٥ ل/٥٠٧ ژ/١+٢+٣).

تێبینی: لەو دوولیستەدا، کە لەسەرەتای بەرگی دووەمو بەرگی چوارەمەوە، بۆ ژیاننامەی هاوەڵانی پێغەمەرو هەندێ لەپیاوانی رشتەکان نووسراون، لەزۆرینەی ژمارەکانا ئاماژە بۆ ژمارەی تەجریدەکەو فەتح کراوە ئاوا: (٢٨/٣٠ ئەبو زەڕی غیفاری = ژمارە/٢٨ تەجرید = ژمارە/٣٠ فەتحولباری). لەهەندێ ژمارەیش دا، ئاماژە بۆ ژمارەی تەجریدەکە بەتەنیا کراوە، یا بۆ ژمارەی فەتحەکە بەتەنیا کراوە، کەواتە: ئەگەر تەرجەمەی حاڵی کەسایەتی یەکە لەژمارەی تەجریدەکەدا نەبوو، تەماشای ژمارەی فەتحی فەرموودەکە بکرێ.

٢٠٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَدْخُلُ أَحَدٌ الْجَنَّةَ إِلَّا أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ لَوْ أَسَاءَ لِيَزْدَادَ شُكْرًا وَلَا يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ إِلَّا أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ لَوْ أَحْسَنَ لِيَكُونَ عَلَيْهِ حَسْرَةً. (الحديث ٦٥٦٩)[٢٠٣٧].

---

[٢٠٣٦] اخرجه مسلم في الايمان: باب: اهون اهل النار عذابا رقم/٢١٣.

ئـەبو هـوریره -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هـەموو کەسـێ لەبەهەشتا، بە چاوی خـۆی جێگـەی خۆی لەناو دۆزەخا دەبینێ، پێی دەڵێن: ئەم شوێنی تۆ بوو، ئەگەر خراپـەکار بوویتایە، هـەتا زیـاترو باشـتر سوپاسـی خـودا بکا، لەسـەر ئـەو بـەهرەو نـازو نیعمەتەی کە واتیادا، هەروەها گشت دۆزەخییـەکانیش، کەدەچـنە نـاو دۆزەخ هەرکەسەیان لەناو بەهەشـتا جێگـەی خـۆی نیـشان ئـەدرێ، پێـی دەڵێن: ئـەم شـوێنە خۆشـە جێگـەی تـۆ بـوو، ئەگـەر ڕێگـەی راسـتت بگرتایـەو لـەجیهانا ئیمانت بهێنایەو کاری باشت بکردایە، هەتا پتر داخ‌و خـەم‌و خەفـەت بخوات‌و ئاهی سەرد هەڵکێشێ). (تاج/١٠ ز/١٥٧ ل/٥١٠ ژ/٣).

٢٠٣٨- عن عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عَمْرٍو رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما قَالَ: قال رَسُـولُ اللّٰـهِ صَـلَّى اللّٰهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ وَمَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ الْـوَرِقِ وَرِيحُـهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ فَمَنْ شَرِبَ مِنْـهُ فَلَـا يَظْمَـأُ بَعْـدَهُ أَبَـدًا. (الحديث ٦٥٧٩)[٢٠٣٨]:

عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمر -ڕەزای خوادایـان لێ بـێ- فـەرمووی: پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (ئەندازەی گەورەیی حەوزی کەوپـەری من ڕێ ی مانگە ڕێ یەکـە، ئاوەکـەی لەچڕی شـیر تـرە، بـۆنی لـەبۆنی میـسك خۆشترە. گۆزەڵەو شـەربەکانی دەوری,کـە ئاویـان لێ دەخۆنـەوە,لـە ئەسـتێرەی ئاسمان زۆرترن,ئەوەی ئاوی کەوسەریان پێ بخواتەوە,هـەرگیز تینـووی نـابێ). (تاجی کوردی/١٠ ز/١٢٧ ل/٣٨٣ ژ/٤+١+٢+٣+٥+٦+٧).

---

[٢٠٣٧] لم يوافقه مسلم على تخريج ابي هريرة (لا يدخل الجنة اري مقعده..) (فتح/١٣ ص/٣١٠ خاتمة كتاب الرقاق). -المترجم-

[٢٠٣٨] اخرجه مسلم في الفضائل، باب: إثبات حوض نبينا صلى اللهم عَلَيْهِ وَسَلمَ و صفاته، رقم/٢٢٩٢.

٢٠٣٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهم عَنهمَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَمَامَكُمْ حَوْضٌ كَمَا بَيْنَ جَرْبَاءَ وَأَذْرُحَ. (الحديث ٦٥٧٧)[٢٠٣٩].

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (حەوزێ لەدەرگای بەهەشتا والە پشتیانەوە، لەجەرباوە هەتا ئەزروح دەبێ). (تاج/١٠ ل/٣٨٢ ز/١٢٧ ژ/١ -ش).

٢٠٤٠- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ قَدْرُ حَوْضِي كَمَا بَيْنَ أَيْلَةَ وَصَنْعَاءَ مِنَ الْيَمَنِ وَإِنَّ فِيهِ مِنَ الْأَبَارِيقِ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ. (الحديث ٦٥٨٠)[٢٠٤٠].

ئەنەس کوری مالیك -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ( ئەندازەی حەوزەکەی من لەهەندێ شوێنیا، لەئەیلەوە کەوا لەشام، هەتا صەنعاو دەبێ کەوا لەیەمەن (ئێستە پێتەختی کۆماری یەمەنە) وەك ژمارەی ئەستێرەی ئاسمانیش پیالەو جامو مەسینەو سوراحی وا لەسەر). (تاج/١٠ ل/٣٨٣ ز/١٢٧ ژ/٣).

٢٠٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ بَيْنَا أَنَا قَائِمٌ إِذَا زُمْرَةٌ حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ فَقَالَ هَلُمَّ فَقُلْتُ أَيْنَ قَالَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهِ قُلْتُ وَمَا شَأْنُهُمْ قَالَ إِنَّهُمُ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى ثُمَّ إِذَا زُمْرَةٌ حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ فَقَالَ هَلُمَّ قُلْتُ أَيْنَ قَالَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهِ قُلْتُ مَا شَأْنُهُمْ قَالَ إِنَّهُمُ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى فَلَا أُرَاهُ يَخْلُصُ مِنْهُمْ إِلَّا مِثْلُ هَمَلِ النَّعَمِ. (الحديث ٦٥٨٧)[٢٠٤١].

---

[٢٠٣٩] اخرجه مسلم في الفضائل، باب: إثبات حوض نبينا و صفاته، رقم/٢٢٩٩.

[٢٠٤٠] اخرجه مسلم في الفضائل، باب: إثبات حوض نبينا و صفاته، رقم/٢٣٠٣.

[٢٠٤١] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي هريرة فيمن يدفع عن الحوض (فتح/١٣ ص٣١٠ ط.ج خاتمة الرقاق). -المترجم-

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (جارێ لەخەوما، لەسەر حەوزی کەوپەرم ڕاوەستا بووم، بۆ پێشوازی لەهاتوانی ئۆمەتم، کە دێن بۆ دێنی منو نۆشین لەئاوی حەوزی کەوپەرم، ئەوەندەم زانی کۆمەڵێ خەڵك هاتن، کەهاتنە پێشەوە ناسیمنەوە، کەچی فریشتەیێی لەشێوەی پیاوێکا، کەوتە نیوانی منو نێوانی ئەوانەوەو، نەیهێشت پتر بێنە بەرەوە، ئەوجا فەرمووی بەو کۆمەڵە: دەی وەرن، منیش بەفریشتەکەم گوت: دەیانبەیری بۆ کوێ؟ فەرمووی: بەخودا دەیانبەرم بۆ دۆزەخ. گوتم: بۆ چییان کردووە، کەوا دەیانێری بۆ ئەو شوێنە؟ فەرمووی: ئەمانە لەپاش تۆ پاشەو پاش لەدین وەرگەڕا بوونو پاشگەز بوو بوونەوەو لەتۆ هەڵ گەڕابوونەوە، هەروا لەدوا ئەمانە کۆمەڵێ تریش دێن، ئەوانیش هەروا، خۆشەویست فەرمووی: (جا وابزانم زۆر کەم لەم کۆمەڵانە قوتاریان دەبێ، وەك چۆن وشترێ بەرەڵا کرابێ و پشت گوێ خرابێ، کەم وا دەبێ ئەو وشترە رزگاری ببێو سەری تیا نەچێو لەناو نەچێ). (تاج/١٠ ل/٣٨١ ز/١٢٦ ژ/٤).

٢٠٤٢- عن حارثة بن وهب رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قال: سمعت النبي صَلَّى اللّٰهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و ذكر الحوض فقال: كما بين المدينة و صنعاء. (الحديث ٦٥٩١)[٢٠٤٢]:

حاریثەی کوڕی وەهب -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: جارێ پێغەمبەر - دروودی خوای لەسەر بێ- باسی حەوزی کەوپەری بۆمان دەکرد، گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (حەوزەکەم لەمەدینەوە هەتا صەنعای یەمەن دەبێ). (تاج/١٠ ل/٣٨٣ ز/١٢٧ ژ/٢ -ش).

---

[٢٠٤٢] اخرجه مسلم في الفضائل، باب: إثبات حوض نبينا صَلَّى اللهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و صفاته، رقم: ٢٢٩٨.

روونکردنەوە:

باسی حەوزی کەوثەر، لەتاج داوا لەبەرگی/٥ ل/٣٨٧ هەتا ل/٣٨٣، ئەصڵە عەرەبی یەکە، کەبریتی یە لەتەواوی زنجیرەی/٢٢٥،٢٢٦،٢٢٧، کەئەم سێ زنجیرەیە لەبارەی ئەم حەوزەوە، بەرێز: ٥+ ٧+ ٣= ١٥ پازدە فەرموودەیان لەخۆ گرتووە، ئەم پازدە فەرموودەیە، ئەگەر بەریز لەیەکەوە هەتا پازدە ژمارەیان بۆ دابنرێ، ژمارە/٢+٣+٦+٧+٨ ئەم پێنجەیان موتتە فەقوعەلە یهین، واتە شێخی بوخاری و شێخی موسلیم ریوایەتیان کردوون، بوخاری لەصەحیحی بوخاریداو موسلیم لەصەحیحی موسلیم دا، کە ئەم دوو کتێبە پیرۆزە لەپاش قورئان دروستترین پەڕاوی سوننەتن. ژمارە/٤+٩+١٤ ئەم سێ یەشیان بوخاری گێڕاونیە تەوە. ژمارە/١٠+١١ ئەم دووەشیان موسلیم ریوایەتی کردوون. مامۆستای عەسقەلانی –ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: (قورگوبی و قازی عەیاج دەفەرموون، بەپێ ی دەفەرموون، بەپێ ی فەرموودەی ساخ ، حەوزەکەی پێغەمەر، کەمەشهوورە بەحەوزی کەوپەر چەسپاوە، پێویستە لەسەر هەموو موکەللەفێ بیزانێو باوەڕی پێی هەبێ، پتر لەسیی سەحابە باسی ئەم حەوزەیان لەپێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە).

## پایانێ - خاتِمَة

مامۆستای گەورەو سەروەر شێخی عەسقەلانی –ڕەحمەتی خودای لێبێ- لەپایانی ئەم نامەی (رقاق) ەدا دەفەرموێ: ( ئەم نامەیە سەدو نەوەدوسێ فەرموودەی واتیادا، سپیو سێ ڕێگە (طریق) یان بێ ڕشتەن، واتە: موعەللەقن، ئەوانی تریان پەیوست (موصول)ن ، دووبارەکانیان سەدو سیی‌و چوار فەرموودەن، پوختەکەیان (١٣٩ – ١٣٤ = ٥٩) پەنجاو نۆ فەرموودەن، موسلیمیش فەرموودەکانی ئەم پوختە یەی وەك بوخاری گێڕاوەتەوە، بێجگە لەمانەیان کەحەڤدە فەرموودەن:

١. فەرموودەکەی ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ-: (کن في الدنيا كأنك غريب )= ژ/١٩٩٨ تەجرید = ٦٤١٦ فەتحولباری).

٢. فەرموودەکەی ئیبنو مەسعود لەبارەی خەتکێشانەکەی پێغەمبەرەوە. = ژ/١٩٩٩ تەجرید = ژ/٦٤١٧ فەتحولباری.

٣. هەروا فەرمودەکەی ئەنەس لەبارەی خەتکێشانەوە = ژمارە: ٢٠٠٠ تەجرید = ژمارە ٦٤١٨ فەتحولباری.

٤. فەرموودەکەی ئوبەیی کوڕی کەعب، سەبارەت بەهاتنی سوورەتی (ألهكم التكاثر )= ژ/٦٤٢٠ فەتحولباری، لەتەجریدەکە دانییە.

٥. فەرموودەکەی ئیبنو مەسعوود: ایکم مال وارثه أحب إليه = ژ/٢٠٠٧ تەجرید = ژ/٦٤٤٢ فەتحولباری.

٦. فەرموودەکەی ئەبو هوریرە( أعن رالله إلى امرىء... )ژ:٢٠٠١ تەجرید = ٦٤١٩ فەتحولباری.

٧. فەرموودەکەی: ( الجنة أقرب إلى أحدكم من شراك نملة...) = ژمارە: ٢٠١٧ تەجرید = ٦٤٨٨ فەتحولباری.

٨. فەرموودەی : ( مالعبدى المؤمن إذا قبضت ضيفه ) = ژمارە: ٢٠٠٤ تەجرید = ژ: ٦٤٢٤ فەتحولباری.

٩. فەرموودەی: ( لو كان لأبن ادم واد من ذهب = ژمارە: ٦٤٣٨ فەتحولباری= حەدیپەکەی ابن الزبیر

١٠. فەرموودەی سەهلی کوڕی سەعد: (من يضمن) = ٢٠١٣ تەجرید = ژ: ٦٤٧٤ فەتحولباری.

١١. فەرموودەی ئەنەس: (إنكم لتعلمون اعمالا = ٦٤٩٢ فةتح).

١٢. فەرموودەی ئەبو هوریرە: (من عادى لى وليا) = ٢٠٢٣ تەجرید = ژ:٦٥٠٢ فەتحولباری.

١٣. فـەرموودەی ئـەبو هـوریره: ( بعثـت أنـا والـساعة كهـاتين )- ژ: ٦٥٠٥ فەتحولباری.

١٤. فەرموودەی ئەبو هوریره: (في بعث النار) = ژماره: ٦٥٣٠ فەتحولباری.

١٥. فەرموودەی عیمرانی کوڕی حوصـەین: (فيدخلون الجنة يـسمون الجهنمـيين) =٦٥٦٦ فەتحولباری.

١٦. فـەرموودەی ئـەبو هـوریره: (لايـدخل أحـد الجنـة إلا أرى مقعـدة)= ٢٠٣٧ تەجرید =

١٧. فەرموودەی ئەبو هوریره: (فيمن يـدفع عـن الحـوض) = ژ: ٢٠٤١ تەجریـد = ٦٥٨٧ فەتحولباری.

هەروا دەفەرموێ: حەڤدە بیستراو – أثر– یشی واتیا، کـەهی سـەحابەکان‌و زانایانی دوا ئەوانە.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٨٥- نامەی چارەنوس - كتاب القدر

٢٠٤٣- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُعْرَفُ أَهْلُ الْجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ قَالَ نَعَمْ قَالَ فَلِمَ يَعْمَلُ الْعَامِلُونَ قَالَ كُلٌّ يَعْمَلُ لِمَا خُلِقَ لَهُ أَوْ لِمَا يُسِّرَ لَهُ. (الحديث ٦٥٩٦ طرفه في: ٧٥٥١)[٢٠٤٣]:

عیمرانی كوڕی حوصەین -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پیاوێ عەرزی حەزرەتی كرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لەجیهانا بەهەشتی لەدۆزەخی جیا دەكرێتەوە، و هەركەسەیان دەناسرێن یانا؟ فەرمووی: (بەڵێ) پیاوەكە فەرمووی: ( كەوتە: كارو كردەوە سوودی چییە، مادەم هەركەسێ لەئێستاوە جێگەی لەبەهەشتا یا لەدۆزەخا دیاری كرابێ؟ فەرمووی: ( هەركەسێ بۆچی دروست كرابێ، ڕێگەی ئەوە دەگرێو كارێ دەكا بیگەیەنێتە ئەوێ). (تاج/١٠ ز:٦ ل/٢١ ژ:٤).

ڕوونكردنەوە:

كەسی چوارەم لەڕشتە -سند- ی ئەم فەرموودەیەدا كەمامۆستای مامۆستای مامۆستاكەی بوخاریە، مەشهورە بە یەزیدی ڕشك. شێخی عەینی لەعومدەدا دەفەرموێ: (ناوی یەزیدی كوڕی سینانی قەسسامە، بۆیە پێی دەگوترێ قەسسام چونكە خانووی لەمەككە دابەش دەكرد، هەروا دەفەرموێ: ڕشك واتە ڕشكی وردە بەچكەی ئەسپێ، كەبەكوردی خۆشمان هەپێی دەگوترێ: ڕشك. هەروا عەینی -ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: دەڵێن: (ئەم یەزیدی ڕشكە ڕێشێكی درێژی گەورەی وای هەبوو، دووپشكێ دەچێتە ناوی، سێ ڕۆژ لەناوەیدا دەمێنێتەوە یەزید پێی نازانێ). هەروا دەفەرموێ:

---

[٢٠٤٣] اخرجه مسلم في القدر باب كيفية خلق الآدمي في بطن امه، رقم: ٢٦٤٩.

ئـەم یەزیـدە لەبوخاریـە ئـەم فـەرموودەی هەیـە لێـرەدا لەگـەڵ گەرەفەکـەی کەژمارە: (٧٥٥١) ە. هەزار رەحمەتی خودای لێ بێ - ئامین.

٢٠٤٤- عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَائِمًا فَمَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلَّا حَدَّثَهُ حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَـهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابُهُ هَؤُلَاءِ وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّيْءُ فَأَذْكُرُهُ كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ. (الحديث ٦٦٠٤)[٢٠٤٤].

حوزەیفـە -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: جـارێ خۆشەویـست -دروودی خوای لەسەر بێ- وتارێکی گرنگی دوورو درێژی دا، هیچ نەما کـەرووی دا بـێ، یاهەتا ڕۆژی قیامەت رووبدا، کەباسـی نـەکا بۆمـان، ئـیتر ئـەوی لـەیادی مابـێ ئـەوا لـەیادی مـاوە (و گەنجینـەی رازو نهێنـی یـەکان بـوو بـەماڵی) ئەوییشی لەیادی چووبێتەوە ئەوا لەیادی چۆتەوە (و ئەنجی نـاو گەنجینـە یـەی بـەفیڕۆ داناوە) مـن بـەش بـەحاڵی خـۆم جـاری وادەبـێ شـتێ لـەو بابەتانـە روودەدا، کەپێغەمەر لەو وتارەدا باسی کردبوون، وەمن ئەو شتەم لەیاد نەما بوو، بەڵام کەروو دەدات وشتەکە دەبینم، ئەوجا یادم دەکەوێتەوەو لـەدڵی خۆمـا دەڵێم: ئای ئەمە ئەوەیە کەپێغەمـەر -دروودی خـوای لەسـەر بێ- لـەو وتـارەدا باسـی کرد بۆمـان، ڕێـك وەك چـۆن گـەڵێ جار وارێ دەکـەوێ مـرۆڤ پیاوێ دەناسـێ، بەڵام لەپاش ماوەیێی ئەو پیاوەی لەبیر دەچێ، هەتا کاتێ دێتەوە بـەر چاوی‌و دەبینـێ، دیـسانەوە دەیناسـێتەوەو دەزانـێ کەئەمـە پیاوەکـەی پێـشووە ئـاوا) (تاج/١٠ ز/٨٨ ل/٢١٦ ژ/١= خەبەردان لەفیتنە گەل...)

---

[٢٠٤٤] اخرجه مسلم في الفتن و أشراط الساعة، باب: أخبار النبي صلى اللهم عليهِ وَسلمَ فيما يكون... رقم: ٢٨٩١.

٢٠٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ النَّذْرَ لَا يُقَرِّبُ مِنِ ابْنِ آدَمَ شَيْئًا لَمْ يَكُنِ اللَّهُ قَدَّرَهُ لَهُ وَلَكِنِ النَّذْرُ يُوَافِقُ الْقَدَرَ فَيُخْرَجُ بِذَلِكَ مِنَ الْبَخِيلِ. (الحديث ٦٦٩٤)[٢٠٤٥]:

ئەبو هوريرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرموێ: ئەو شتەی کەخودا نەینووسیبێ لەچارەی ئادەمیزاد، بەشت نەزرکردن بۆی نابێ، بەلأم وادەبێ نەزرەکە لەگەڵ چارە نووسەکە یەك دەگرێ‌و شتەکە روودەدات‌و ئادەمیزاد وادەزانێ کەئەوە لەبەر نەزرەکەی ئەو رووی داوە، جا بەهۆی ئەمەوەو لەسەر ئەم بنیاتە، شتی لە پیاوی پیسکەو چرووك پێ دەردەهێنم، چونکە ئەگەر وانەبێ ئەو کابرا رژدو چرووکە خێرو نەزرناکا). (تاج/٣ ل/ ٣٣٤ ژ/٢+١ ز/١٣٠ - باسی نەزر).

ڕوونکردنەوە:

مامۆستای عەسقەلانی لەتەرەفی ئەم فەرموودەیەدا کەژمارە/(٦٦٩٤)ە، کەوا لە ل/٤٣٣ ج/١٣ و ل/٤٣٨ دا دەفەرمووێ: ( هذا من الأحاديث القدسية ولكن سقط منه التصريح بنبته إلى الله) واتە: ئەمە فەرموودەی قودسی یەو فەرمایشتی خوای گەورەیە، بەلأم دانەپاڵ خودای لێ پەڕیوە.

٢٠٤٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَا اسْتُخْلِفَ خَلِيفَةٌ إِلَّا لَهُ بِطَانَتَانِ بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْخَيْرِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشَّرِّ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ وَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ. (الحديث ٦٦١١- طرفه في:٧١٩٨)[٢٠٤٦]:

---

[٢٠٤٥] اخرجه مسلم في النذر، باب: النهي عن النذر و انه لا يرد شيئاً، رقم/١٦٤٠.

[٢٠٤٦] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث: ما استخلف من خليفة. فتح/١٣ ص/٣٥٨. —المترجم—

ئـەبو سـەعیدی خـودری -ڕەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی : پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (خودا هەر پێغەمەرێکی ڕەوانە کردبێ، وەهەرکەسێکی کرد بێ بەجێنشین، یاخود بە خاوەن دەسەڵاتی سەر وڵات، مسۆگەر کە دوو تاقمە دەستو پێوەندی بووە: تاقمە یەکیان ڕێگەی چاکەی پێ نیشان دەداو، هانی دەدا لەسەر گرتنی ڕێگەی چاکەو، کردنی کاری باش، تاقمەکەی تریشیان بەپێچەوەانەوە:ی خراپەی پێ نیشان دەداو، گاڵی دەدا لەسەر گرتنی ڕێگەی خراپەو کردنی بێ فەرمانی خودا. پاك‌و پاکیزەیش تەنیا ئەو کەسەیە کەخودای گەورە بیپارێزێو بەسۆزو میهرەبانی خۆی لەخراپە دووری بگرێو بیخاتە سەرشەقامە ڕێگەی یاسانامە خوا دەناکەس بەئازایی خۆی نییە کەپاك‌و پاکیزەیەو لەگوناە و تاوان بەدوورە). (تاجی کوردی/٣ ل/٢٩٣ ز/١٠٨ ژ/١- باسی دڵسۆزی بۆ فەرمانڕەوا).

ڕوونکردنەوە:

١. پەیوەندی ئەم فەرموودەیە بەباتەکەوە کەچارەنووسە لەدوایە کەیدایە، کە دەفەرموێ: کەس بەئازایی خۆی نییە کەپارێزراوە لەتاوان، چونکە شتی وا چارەنووسین خودایی یە ، دیارە ئەم بابەتەش باسی چارەنووسە.
٢. وەرگەڕاوە کە دەقی تەرەفی ئەم فەرموودەیە، کەژمارەکەی لەفەتحولباریدا: (٧١٩٨) ە، والەبەرگی/ ١٣ ل/١٨٩ طبعة قديمة.
٣. عەسقەلانی دەفەرموێ: (لەگێڕانەوەی ئەوزاعی‌و معاویەی کوڕی سلام دا: (من وال) ە، ئەم گێڕانەوەیە گشتی ترە) بۆیە منیش لە تەرجەمەکەدا، وشەی : (خاوەن دەسەڵاتی سەروڵات) م لێ پتر کرد، مەبەستم لەروونکردنەوەی ئەم برگەیە ئەوەیە، کەبەهرەمەندی بەڕێز دڵنیابێ، لەخاڵۆ لەوشە بەوشەی وەرگەڕاوە کوردی یەکە، خوایاربێ دوور دەبێ لەهەواو هەوەسکاری.

٤. لەڕاستیدا ئەم دوو تاقمەیە، مەرج نییە كە دوو تاقمەی دیاریكراوی تایبەتمەند بن‌و شەوو ڕۆژ هاودەم‌و هاونشینی كاربەدەستان بن، جێگەی داخە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، بەتایبەتی لەنیشتمانی ئێمەدا، ڕاگەیاندنی بەهەموو لق‌و بەشەكانیەوە، هەروا هونەرو هونەرمەندا، بەهەموو جۆرەكانیەوە، وەك مۆسقاو مۆسقارو گۆرانی‌و گۆرانی بێژو شانۆو شانۆ نوسان، جێگەی داخە ئەمانە هەموو لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، لەكوردستانی ئازیزدا، بگانەی سووئن، هەرخەریكی پەخشی گەندەڵی رەوشتین، بوون بەبلوێری شەیتان!!

٢٠٤٧- عَنْ عَبْدِاللَّهِ قَالَ كَثِيرًا مِمَّا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحْلِفُ لَا وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ. (الحديث ٦٦١٧ طرفاه في: ٦٦٢٨، ٧٣٩١)[٢٠٤٧].

عەبدوڵلای كوڕی عومەر -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی زۆر جاران پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئاوا سۆندی دەخوارد: (لا ومقلب القلوب = نائەو شتە ناكەم، یاخود نا ئەو شتە وانییە بەهەڵسووڕێنەری دلان!)

---

[٢٠٤٧] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث، ابن عمر: لا و مقلب القلوب، خاتمة كتاب القدر فتح/١٣ ص/٣٥٨. -المترجم-

# پایانێ - خاتمه

عەسقەلانی –ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: نامەی چارەنوس –كتاب القدر– بیستو نۆ فەرموودەی بەرزەوەكراوی وا تیادا، سێ لەمانە بێپشتە (معلق) ن، ئەوانی تریان پەیوەست (موصول) ن. بیستو دوویان دووبارەن، پوختە كەیان حەوت فەرموودەیە: (٢٩-٢٢ = ٧). لەم حەوت فەرموودە پوختەیە موسلیم پێنجیانی گێڕاوەتەوە، ئەم دوانەیانی نەگێڕاوەتەوە:

١- ژمارە: ٢٠٤٦ تەجرید = ٦٦١١ فەتحولباری = فەرموودەی ئەبو سەعید (ماأستخلف من خليفة).

٢- ژمارە: ٢٠٤٧ تەجرید = ٦٦١٧ فەتحولباری = فەرموودەی ئیبنو عومەر: (لا ومقلب القلوب).

لەم پوختەیە كەحەوت فەرموودەن، لەتەجریدەكە دا : (٢٠٤٧- ٢٠٤٢ = ٥) پێنج فەرموودەیان هاتوون، سیانیان متفق علیهن كەژمارە: ٢٠٤٣ و ٢٠٤٤ و ٢٠٤٥ ن، دوانیشیان لەئەفرادی بوخارین كەژمارە: (٢٠٤٧،٢٠٤٦) ن.

هەروا عەسقەلانی دەفەرموێ: ( هەروا لەم نامەیەدا پێنج بیستراو- ئەپەری صەحابەو تابیعینیش واتیادا. والله أعلم.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٨٦- نامەی سوێندو نەزرکردن
# كتاب الإيمان والنذور

(بۆ باسی نەزر بڕ. بەرگی/٣ ل/٣٣٣ ز/١٣٠ هەتا لاپەڕە: کۆتایی زنجیرە/ ١٣٥٠٣٤٨).

٢٠٤٨- عن عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ لِي النبي صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ لَا تَسْأَلِ الْإِمَارَةَ فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ وَائْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ. (الحديث ٦٦٢٢ أطرافه في: ٦٧٢٢، ٧١٤٦، ٧١٤٧)[٢٠٤٨]:

ئەورەحمانی کوڕی سەمموورە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر - دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی پێم: ئەی ئەورەحمان! داوای فەرمانڕوایی (ئەمارەت = ئەمیریی) مەکە، چونکە ئەگەر لەسەر داواکردنی خۆت، فەرمانڕەوایی‌و بەرپرسی وەربگریت لێت دەبێ بەبار، بەڵام ئەگەر بەبێ ئەوە کەخۆت هەوڵی بۆ بدەی بکرێی بەفەرمانڕەوا، یابەسەر کاری سەرکارێ، ئەوا خودا زاڵت دەکا بەسەریا، ئەی ئەو ڕەحمان! ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێ، وەلەپاشا تەماشات کرد کەلەوشتە باشتر هەیە، ئەوە بڕێتی - واتە: کەفارەتی- سوێندەکەت بدەو، ئەوە بکە کەبەباشتری دەزانی).(تاج/٣ ل/٢٧٠ ز/ ژ/١ ش/د/ت/ن).

---

[٢٠٤٨] اخرجه مسلم في الايمان باب/ ندب من حلف يمينا فرأى غيرها خيرا منها ان يأتي الذي هو خير و في الامارة باب: النهي عن طلب ...رقم/١٦٥٢.

روونكردنەوە:

١. بەپێ ی ئەم فەرموودەیە، هەركاتێ كەسێ سوێندی خوارد لەسەر شتێ، كەبیكا، یانەیكا، ئەوە نابێ سوێندەكەی بخات، دەبێ سوێندەكەی بباتە سەر، بەلاّم ئەگەر سوێندی لەسەر كردنی شتێ خوارد كەبیكات، دوایی وابەباشی زانی كەنەیكا، باكەفارەتی سوێندەكەی بداو شتەكە نەكا، وەهەروەها بەپێچەوانەوە ئەگەر سوێندی لەسەر نەكردنی شتێ خوارد.

٢. عەبدو ڕەحمانی كوڕی سەمورە -ڕەزای خوای لێ بێ- بەس ئەم فەرموودەی هەیە لەبوخاریدا، كەلەم سێ شوێنەی تردا دووبارە بۆتەوە:

أ- ژمارەی/٦٧٢٢ لەكەفارەتی ئەیماندا.

ب- ژمارە/٧١٤٦ لەئەحكام دا. ج- ژمارە/٧١٤٧ لە ئەحكام دا. لەموسلیمیش دا فەرموودەی هەیە.

عەبدولرەحمان لەمسلمی فەتحە، واتە: ڕۆژی ئازاد كردنی مەككە موسوڵمان بووە، لەفتوحاتی عێراقدا ئامادە بووە، لەسەر دەستی ئەودا سجستان ئازاد كراوە، لەسەردەمی جێنشینی ی عوپماندا، هەروا كابل لەسەر دەستی ئەودا غەزا كراوەو ئازاد كراوە، لەخزمەت پێغەمەر خۆی دا ئامادەی غەزای تەبووك بووە، خۆی فەرمودەی لەپێغەمەرو لەموعاژی كوڕی جەبەلە وەرگێڕاوە تەوە، ئەم زاتانەیش فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە: ئیبنو عەباسو سەعیدی كوڕی مسێبو محمدی كوڕی سیرینو حەسەنی بەحریو كەسانی تریش. ماڵی پەنجاو یەكی كۆچی لە بەحرە مردووە، رەزای خودای لێ بێ.

٢٠٤٩- عن أبي هريرة رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللّٰهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: نحن الآخرون السابقون يوم القيامة.(الحديث ٦٦٢٤ أطرافه ٢٣٨، ٨٧٦، ٨٩٦،

٢٩٥٦، ٣٤٨٦، ٦٨٨٧، ٧٠٣٦، ٧٤٩٥) وقال رسول الله صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و الله لأن يلج أحدكم بيمينه في أهله آثم له عند الله من أن يعطى كفارته التي افترض الله عليه. (الحديث ٦٦٢٥ طرفه في: ٦٦٢٦)[٢٠٤٩]:

فەرموودەی: ٦٦٢٤ لەم ژمارەیەدا ڕابورد: ٤٦٥ تەجرید= ٨٧٦ فەتحولباری + ٤٧٥ تەجرید = ٨٩٦ فەتحولباری = بەرگی/١ ل/٤٤٠ + بەرگی/١ ل/٤٥١.

فەرموودەی ژمارە/٦٦٢٥ یش واتە: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: بەخودا ئەگەر کەسێکتان لەسەر شتێ سوێند لەکەسوکاری بخواو لەپاشا ووڕکی لێ بگرێو لێی پەشیمان نەبێتەوە، وەلحالْ پەشیمانبوو نەوە لەوشتە باشتر بی، ئەوە پێلێدا گرتنە گوناهی زۆر تر دەگا لەلای خودا، هەتا ئەوەکە سوێندەکەی بشکێنێو ئەو کەفارەتە بدا کەخودا داینـاوە بۆ سوێند لەکاتی شکاندنیدا. (تاج/٣ ل/٣٢٩ ز/١٢٦ ژ/١ -ب/م).

٢٠٥٠- عن عَبْدَاللَّهِ بْنَ هِشَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ إِلَّا مِنْ نَفْسِي فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ نَفْسِكَ فَقَالَ لَهُ عُمَرُ فَإِنَّهُ الْآنَ وَاللَّهِ لَأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْآنَ يَا عُمَرُ. (الحديث)[٢٠٥٠]:

عەبدوللای کوڕی هیشام – ڕەزای خودای لێ بێ – فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەردا بووین، دروودی خودای لێ بێ، دەستی عومەری کوڕی خەتابی گرت، عومەر عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا تۆم لەهەمووشتێ تر خۆشتر دەوێ، بەس نییە، سوێندم بەو کەسە کەگیانی

---

[٢٠٤٩] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: النهي عن الاصرار على اليمين، رقم/١٦٥٥.

[٢٠٥٠] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عبدالله بن هشام: كنا مع النبي صَلَى اللهم عَلَيْهِ وَسَلمَ راجع رقم: ١١ ج/٤ ص/١٩٢ تجريد. الترجمة الكردية. -المترجم-

منی بەدەسە، دەبێ منت لەخودی خۆشت خۆشتر بوێ ئەوسا بەسە بۆ گەیشتن بەپلەو پایەی هەرە بەرز لەم لایەنەوە!). (بڕوانە ژمارە/١٠٨٠ تەجرید = ٢٥٠١ = بەرگی/٣ ل/١٧١ هەتا ١٧٣. ژیانامەی عەبدوڵلای کوڕی هیشامی واتیادا).

٢٠٥١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يقول فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ هُمُ الْأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ هُمُ الْأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ. قلتُ: ما شأنِي أيرَى فيَّ شيءٌ، ما شأنِي؟ فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ وَهُوَ يَقُولُ: فما استطعت أن اسكتَ و تغشاني ماشاء الله، فقلت: من هم بأبي أنت و وأُمّي يا رسول الله؟ قال: الْأَكْثَرُونَ أَمْوَالًا إِلَّا مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا. (الحديث ٦٦٣٨ طرفه في: ١٤٦٠)[٢٠٥١].

ئەبو زەڕ -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەری خودا، دروودی لەسەر بێ، لەسێبەری کابەدا بوو، چووم بۆ خزمەتی، کاتێ گەیشتمە لای لەو کاتەدا دەیفەرموو: (سوێندم بەخودای کابە، کە یەزدانی پاکە، زیانەومەندی هەرە گەورە خۆیانن، سوێندم بەخودای کابە، کەیەزدانی پاکە زیانکردووی هەرە گەورە خۆیانن!) منیش لەبەر خۆمەوە بەخۆمم گوت: ئەوە چیمە، دەبێ شتێکی وا لە مندا هەبێ، کەشایەنی ئەوە بم ببم بەکەسێکی هەرە زەرەرمەند؟

کەلەخزمەتیدا دانیشتم، هەروای دەفەرموو، لەبەر ئەوە نەمتوانی کەبێ دەنگ بم، هەنێ خەیاڵی ناخۆشیش هات بەدڵما لەوەی کەمەیلی خودای لەسەر بوو، وەك ئەوە ئەبێ گوناهێکی وام کردبێ، جاعەرزی حەزرەتم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! بەباوك و دایکمەوە بەقوربانت بم ئەم نەگبەتانە کێن، کەهەرەزیانەو مەندانن؟ فەرمووی: (ئەوانەی کەماڵو سامانیان زۆر زۆرە،

---

[٢٠٥١] أخرجه مسلم في الزكاة، باب/تغليط عقوبة من لايؤدي الزكاة رقم/٩٩٠.

مەگەر كەسێ لەوانە خودا ماڵی باشی زۆری پێ دابێ، ئەویش درێغیلێ نەكاو، بەهەر چوار لادا داغانی بكا، بەڕاستو بەچەپا، لەڕێگەی خودادا بیدا بەمو بەوو بیبەخشێتەوە و بۆكاری خێر درێغی نەكا). (تاج/٩ ز:٩٤ ل/٢٩٠ ژ/١٣) + (تاجی كوردی/١٠ ز/١٩ ل/٧٢).

٢٠٥٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا يَمُوتُ لِأَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ إِلَّا تَحِلَّةَ الْقَسَمِ. (الحديث ٦٦٥٦ طرفه في: ١٢٥١)[٢٠٥٢].

لەئەبو هوریرەوە -ڕەزای خوای لێ بێ- پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ سێ منالی بمرن، ڕەسیدە نەبووبن، مەگەر بۆ ئاهی سوێن بچێتە دۆزەخ) . (ریاض/٣ ل/٩ ژ/٩٥٣/٢/- ٦- چاپی/٢ كوردی).

ڕوونكردنەوە:

پێشەوا نەوەوی -ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: مەبەست لەئاهی سوێن (تحله القسم) لەم فەرموودەیەدا، ئەو سوێنەیە كەلەم ئایەتە پیرۆزەدایا دەفەهمرێتەوە، كەدەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا.(١٩/٧١) سورة مريم ﴾ واتە: كەس نییە لەئێوە كەبەناو دۆزەخا نەڕواو نەچێتە ناوی: ئەم چوونە ناودۆزەخە هەموانی (عمومی) یە، بڕیارێكی خودا نووسەو ڕەتبوونەوەی بۆ نییە. پوختەیێ لەژیانامەی ئیمامی نەوەوی -پرگۆڕی پیرۆزی لەرەحمەتو نووری خودا بێ- ناوو نەسەبی: (الأمام الحافظ، الأوحد، القدوة، شيخ الإسلام، علم الأولياء، محى الدين أبو زكريا يحي بن شرف، الأمام الرباني، الشافعى الثانى).

---

[٢٠٥٢] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب/ فضل من يموت له ولد... رقم/٢٦٣٢.

لەمانگی موحەررەمی ساڵی ٦٣١ کۆچی، لەگوندی نەوا، لەباوك و دایکێکی زۆر باش، لەدایك بووە، گوندی نەوا سەر بەشاری حۆرانە لەسوریا. لەتەمەنی دەساڵیدا دەستی کردووە بەلەبەرکردنی قورئان و خوێندنی پەڕاوەکانی شەرع (فقه) لەو دەمەدا شێخی خواناس: شێخ یاسینی مەڕاکیشی لەوێوە ڕەت دەبێ، دەڕوانێ واکۆمەڵێ منداڵ زۆری لێ دەکەن کەلەگەڵیانا یاری بکات، ئەویش لەدەستیان ڕادەکاو، لەبەر خۆشیەوە قورئان لەبەر دەکا، لەبەر ئەوە شێخ یاسین دەچێ بۆلای باوکی ئیمامی نەوەوی و ئامۆژگاری دەکا، کەئاگای لێی بێ و تەرخانی بکات بۆ خوێندنی ئایینی، ئەویش بەگوێ ی دەکا، لەساڵی (٦٤٩) دا دەچێ بۆ دیمەشق و دەبێ بەفەقێ و لەوێ لەڕەواچیە دادەمەزرێ، بەنانی فەقێیەتی لەقوتابخانەکەی ڕەواچیە دەژی و کەلەتەنیشت مەسجیدول ئەمەوییەوە دەبێ. ئەوجا لە خزمەتی باوکیدا دەچێ بۆ حەج، زۆرینەی کات لەڕێگە نەخۆش دەبێ، چل و پێنج شەو لەمەدینە لەخزمەت پێغەمەردا دەمێنێتەوە، ئەمە ساڵی (٦٥١) کۆچی دەبێ، لەپاش حەجەکە دەگەڕێتەوە بۆ دیمەشق. خۆی دەفەرموێ: لەم ماوەیەدا، ڕۆژانە دوازدە وانەم لە خزمەت مامۆستاکانم دا دەخوێند، ئەو پەڕاوێزو حاشیانەی کە پێویست بوون بۆ ڕوونکردنەوەی واتای دەربڕین و جێگە قورسەکان خۆم دەمنووسینەوەوکتێبەکانم خۆش دەکرد، خودای گەورە پیت و فەڕی خستە کاتەکەم، ویستم کەخەریکی پزیشکی بم، خۆم خەریك کرد بەکتێبی (القانون في الطب) ەوە، کەدانراوی ئیبنوسینایە، بەڵام دڵم تاریك بوو، چەند ڕۆژێ نەمدەتوانی خەریکی هیچ ببم، تەنانەت بەزمییم بەخۆما هاتەوە، تا قانوونەکەم فرۆشت و لەو بیرو بیردۆزمیە پەشیمان بوومەوە، ئیتر خودا دڵی ڕووناك کردمەوەو ئەو حاڵەتەم نەما). لەتەمەنی سیی و چوار ساڵیدا، واتە: لەساڵی (٦٦٥) ك دا دەبێ بە سەرۆکی مەشیخەی دارول حەدیث، وەتاکاتی مردنی لەو پایەدا دەمێنێ. پێشەوانەوەوی هەتا خەیاڵ بڕ بکات خاوەنی

زوهدو وەرع و تەقوا بوو، بەواتای وشە بۆ خودا لێبڕا بوو. شێخ موحیەدین دەفەرموێ: ( گلەییم لا کرد، کەبۆچی واگوزەرانت لەخۆت گران کردووە، لەخواردن و جل و بەرگ و گوزەرانا خۆت جەڕەبابەداوە، تەنانەت ناچێتە حەمامیش، دەترسم کەتووشی نەخۆشی ببیت و لەکارو ئیشت بکات!!).

کەچی فەرمووی: (فیسارەکەس ئەوەندە بەڕۆژوو بوو، وەئەوەندە خواپەرستی کردووە، هەتا پێستی شین هەڵگەڕابوو!). میوەو خەیاری نەدەخوارد، دەیفەرموو: نەبادا جەستەم شێدار بکاو خەوم لێ بخات.)

ئەمەیش کورتەیەکی پوختی ژیاننێتی: (هەتا بڵێیت زاهیدو دنیا نەویست، لەعیبادەت و ژیکرو ئەورادا کولا بوو، شەونوێژێکی زۆری دەگرت، شەوو ڕۆژ خەریکی کتێب دانان و وانە گوتنەوە بوو، بەهەناسە لەخوا بێ ئاگا نەبوو، مانگایەکی باشی هەبوو، هەمووی دەکرد بەخێر، ساڵ دوازدە مانگە بەڕۆژوو بوو، پێنج ڕۆژ نەبێ، ڕۆژی یەکەمی جەژنی ڕەمەزان و چوار ڕۆژەکەی جەژنی قوربان. ئەمەیش خواردن و خواردنەوەی بوو: ئێوارە ڕۆژووی دەشکان و ژەمی نانی ئێوارەی دەخوارد. لەپێش مەلا بانگانیشا، لەجیاتی پارشێو جامێ ئاوی دەخواردەوە).

ئەمەیش ماڵ و حاڵو دارایی و سامانی بوو: (ژنی نەهێناوە، مناڵی نەبوو، لەگۆشەی مزگەوتا دەژیا، گۆزەیەکی هەبوو بۆ ئاو خواردنەوە، حەسیرێ لەسەری دەنوست، مەوجێ لەکاتی خەودا دەیدا بەخۆی دا، مێزەرێکی خام، جبەیەکی خام، دیشداشەیەکی خام، جووتێ سۆڵ و ئاوبێنە و دەست بشۆ!!).

وەفاتی: لەساڵی (٦٧٦) ك. دا گەڕایەوە بۆ نەوا، لەپێشا هەموو ئەو کتێبانەی لەئەوقافی خواستبوو گەڕاندنیەوە بۆی، چوو بۆ سەردانی گۆڕستانی مامۆستاکانی و بۆیان پاڕایەوەو لەسەریان گریا، سەردانی دۆستەکانی خۆشی کردو خواحافیزی لێ کردن، وەسەردانی باوکیشی کرد، ئەوجا دێن بەیتولمەقدیس و خەلیلی کرد لەفەلەستین، ئەوجا گەڕایەوە بۆ

گوندی ئەوا، لەوێ نەخۆش کەوتو مەرگ بوو بەمیوانی لەبیستو چواری مانگی رەجەبی (٦٧٦)ك. واتە: چلو پێنج ساڵو چەند مانگێ ژیاوە. رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ.

٢٠٥٣- وعنه رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: أن النبي صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا وَسْوَسَتْ أَوْ حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ تَعْمَلْ بِهِ أَوْ تَكَلَّمْ *. (الحديث ٦٦٦٤ سبق طرفه في: ١٠٨٦ تجريد = فتح الباري: ٢٥٢٨ = بەرطی/٣ ل/١٧٨)[٢٠٥٣]:

واتاکەی بەتەواوی لەوێ رابورد.

٢٠٥٤- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهم عَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَهُ فَلَا يَعْصِهِ. (الحديث ٦٦٩٦ طرفه في: ٦٧٠٠)[٢٠٥٤]:

عائیشە -رەزای خودای لێ بێ- لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (کەسێ نەزری کرد کەفەرمانبەریی خودا بکا، ئەوە بانە زرەکەی بەجێ بێنێ، بەڵام ئەگەر کەسێ نەزری کرد کەگوناهێ بکا، کەدیارە کردنی گوناه بێ فەرمانی خودایە، ئەوە با ئەو نەزرە جێ بەجێ نەکا). (تاجی کوردی بەرگی/٣ ل/٣٥٣ ژ/٣ ز/١٣٠ -باسی نەزر- ب/د/ت/ن).

٢٠٥٥- عن سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أنه اسْتَفْتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ فَأَفْتَاهُ أَنْ يَقْضِيَهُ عَنْهَا. (الحديث ٦٦٩٨ طرفه في: ٢٧٦١، ٦٩٥٩)[٢٠٥٥]:

---

[٢٠٥٣] اخرجه مسلم في الايمان: تجاوز الله عن حديث النفس... رقم: ١٢٧.

[٢٠٥٤] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عائشة: من نذر ان يطيع الله فليطعه. خاتمة كتاب كفارات الإيمان ج/١٣ ص/٤٨٤. -المترجم

[٢٠٥٥] اخرجه مسلم في النذر، باب: الأمر بقضاء النذر، رقم/١٦٣٨.

ئیبنو عەبباس -ڕەزای خودای گەورە لەخۆی و بابی- فەرمووی: سەعدی کوڕی عوبادە -ڕەزای خودای لێ بێ- لەپێغەمەری پرسی: دایکم نەزرێکی لەسەر بوو، لەپێش ئەوەدا کەجێ بەجێ ی بکا مرد، ئایا دەبێ ئێستا من خۆم بیگێڕمەوە بۆی؟ فەرمووی: (بەڵێ دەبێ ئێستا تۆ بۆی بگێڕەوە). (تاجی کوردی/٣ ل/٣٣٧ ز/١٣١ ژ/١+٢+٣).

ڕوونکردنەوە:

کەسێ هەرخێرێ نەزربکا، وەك گرتنی ڕۆژووی سوننەتو ئازاد کردنو پارەو ماڵ بەخشینەوە، لەپاش مردنی خۆی بۆی قەزا دەکرێتەوە.

٢٠٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ بَيْنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَائِمٍ فَسَأَلَ عَنْهُ فَقَالُوا أَبُو إِسْرَائِيلَ نَذَرَ أَنْ يَقُومَ وَلَا يَقْعُدَ وَلَا يَسْتَظِلَّ وَلَا يَتَكَلَّمَ وَيَصُومَ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرْهُ فَلْيَتَكَلَّمْ وَلْيَسْتَظِلَّ وَلْيَقْعُدْ وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ. (الحديث ٦٧٠٤)[٢٠٥٦]:

ئیبنو عەبباس -ڕەزای خودا لەخۆی و لەبابی- فەرمووی: جارێ پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ووتاری ئەدا، پیاوێکی بینی لەبەر هەتاوەکە ڕەق ڕاوەستابوو، پرسی: بۆچی ئەو پیاوە وا ڕەق ڕاوەستاوە؟). عەرزیان کرد: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە، ئاە(نەزر) ی کردووە، کەبەپێوە لەبەر خۆر ڕەق ڕاوەستێو دانەنیشێو نەچێتە بەر سێبەرو قسە نەکاو لەهەمان کاتدا بەڕۆژووش بێن فەرمووی- دروودی لەسەر بێ-:( فەرمانی پێ بکەو لەزمانی منەوە پێی بڵێ: کە قسە بکاو بچێتە بن سێبەردا دابنیشێ، بەڵام باڕۆژووەکەی تەواو بکا). (تاجی کوردی/٣ ل/٣٣٨ ز/١٣٢ ژ/١ ش/د/ت/ن -نەزرکردنی شتێ کەلەدەستی نەیێ دانامەزرێ).

---

[٢٠٥٦] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث قصة ابي اسرائيل (خاتمة كتاب كفارات الأيمان: ج/١٣ ص/٤٨٤). -المترجم-

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٨٧- نامەی کەفارەتو بریتیی سوێندەکان

# كتاب كفارات الأيمان

٢٠٥٧- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ كَانَ الصَّاعُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُدًّا وَثُلُثًا بِمُدِّكُمُ الْيَوْمَ. (الحديث ٦٧١٢ طرفاه في: ١٨٥٩، ٧٣٣٠):

سائیبی کوڕی یەزید -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: بەسەردینی ی پێغەمەر خۆی -دروودی خوای لەسەر بێ- (مەن) واتە: صاع- موددیکو سێ یەکی مودێك بوو، بەموددی ئەمڕۆکەی ئێوە). (تاجی کوردی/٣ ل/٣٤٦ ژ/١/ ز/١٣٥ -دیاریکردنی ئەندازەی کەفارەتی سوێند).

٢٠٥٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي مِكْيَالِهِمْ وَصَاعِهِمْ وَمُدِّهِمْ. (الحديث ٦٧١٤ طرفاه في: ٢١٣٠، ٧٣٣١)[٢٠٥٨]:

ئەنەسی کوڕی مالیك -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (خودایە! پیتو فەڕو بەرەکەت بخەرە عەیارەو مەنو موددی خەڵکی شاری مەدینەوە).

---

[٢٠٥٨] و الحديث أخرجه مسلم... في المناسك ( عيني/١١ ص/٢٤٩. -المترجم-

# پایانیٚ = خاتمه

مامۆستای گەورەو مەزنم شێخی عەسقەلانی -غەریقی رەحمەتی خودا بیٚ- دەفەرمویٚ: (نامەی ئەیمان‌و نەزرو کەفارەت‌و پاشکۆی ئەم نامەیە، سەدو بیست‌و حەوت فەرموودەی بەرزەوە کراوی واتیادا، بێرشتەکانی (هەڵسپێراوەکانی = معلقەکانی) بیست‌و شەش فەرموودەن، دووبارەکانیان سەدو پازدە فەرموودەن، پوختەکەیان: دوازدە فەرموودەن. پێشەوا موسلیمیش وەك پێشەوا بوخاری —ڕەزاو رەحمەتی خودایان لیٚ بیٚ- ئەم پوختەیەی هەموو گێڕاوەتەوە، بێجگە لەم شەشەیان:

٦) فەرمووەدەی عائیشە لەباوکیەوە: ( ژمارە: ٦٦٢١ فەتح).

٧) فەرموودەی عائیشە: (من نذر أن يطيع الله فليطعه) ٢٠٥٤ تەجرید = ٦٦٩٦ فەتحولباری.

٨) فەرموودەی ئیبنو عەباس، سەبارەت بەداستانەکەی ئەبو ئیسرائیل = ژمارە/٢٠٥٦ تەجرید = ٦٧٠٤ فەتحولباری

٩) فەرموودەی ئیبنو عەباس:(أعوذ بعزتك).

١٠) فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر: (في اليمين الغموس).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٨٨- نامەی فەرائیز (میرات دابەشکردن)
## كتاب الفرائض

نامەی فەرائیزو باسی میراتو کەلەپوور دابەشکردن، لەتاجی کوردیدا، وا لەبەرگی/٣ ل/٣ ز/١ هەتا زنجیرە/١٠ لاپەڕە/٢٤ + بڕوانە: ریاض صالحین/١ ل/١٨٧ ژمارە/٢٠٢/٤ هەتا لاپەڕە/١٩٢ + فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، لاپەڕە/٥٦٣ زنجیرە/٢٤١ هەتا لاپەڕە/٦٠٤ زنجیرە/٢٥٢).

٢٠٥٩- عن ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: ألحقوا الفرائِضَ بأهلها، فمابَقِيَ فَهوَ لأولَى رجلٍ ذكر. (الحديث ٦٧٣٢ أطرافه في: ٦٧٣٥، ٦٧٣٧، ٦٧٤٦)[٢٠٥٩]:

ئیبنوعەباس -ڕەزای خوالە خۆیو بابی بێ- فەرمووی: پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: هەموو خاوەن بەشێ لەکەسو کاری مردوو، بەشی دیاریکراوی خۆی پێ بدەن، بەپێی دەقی قورئانەکە، ئەنجا هەرچی لەوان مایەوە، ئەوە بۆخزمترین کەسە بەمەرجێ کەنێرینە بێت. (تاجی کوردی/٣ ل/١١ ز/٤ ژ/٢ – ش/د/ت).

---

[٢٠٥٩] أخرجه مسلم في الزكاة، باب: اعطاء المؤلفة قلوبهم..رقم: ١٠٥٩.

**روونكردنەوە:**

وەك پیاوێ دەمرێ كچێك و ژنێك و مامێك و ئامۆزایەكی دەبێ، بەپێی دەقی قورئان لەكاتی وادا، كچ نیوەی ماڵی باوكەكەی بۆهەیە، ژنەكەی هەشت یەكی بۆهەیە، واتە: لەهەشت بەش چواری بۆ كچەكە، یەك بەشی بۆ ژنەكە، كۆی بەشی ئەم دوانە یەكسانە بە: ٤ + ١ = ٥. كەواتە: ٨ — ٥ = ٣ بەش دەمێنێ ئەم سێ بەشە دەدرێ بەمامەی مردووەكە، چونكە ئەو نزیكترین خزمی نێرینەیەتی، ئامۆزاكەشی بێ بەش دەبێ، چونكە ئەو بەپلەیە دوورترە لەمردووەكە.

٢٠٦٠- عن أبي موسى رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أنه سئل عن ابنة و ابنة ابنٍ و أختٍ، فقال: للإبنةِ النصف و للأختِ النصفُ، وأتِ ابن مسعود فسيتابعني، فسئل ابن مسعودٍ، وَ أخبر بقول أبي موسى فقال: لقد ضللتُ إذا، وما أنا من المهتدين أقضي فيها بما قضي النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: للابنةِ النصفُ ولإبنة الابنِ السّدس تكملة الثلثين، وما بقي فللأختِ، فأخبر أبو موسى بقول ابن مسعود، فقال: لا تسألوني مادام هذا الحبر فيكم. (الحديث ٦٧٣٦ طرفه في: ٦٧٤٢)[٢٠٦٠].

هوزەیلی كوڕی شەرەحیل -ڕەحمەتی خودای لێبێ- فەرمووی: پرسیاركرا لە ئەبومووسای ئەشعەری -ڕەزای خوای لێ بێ- مردوویەك هەیە كچێك و كچێكی كوڕ و خوشكێكی هەیە، كەلەپوورەكەیان چۆن لێ دابەش دەكرێ؟ فەرمووی: نیوەی لەبۆ كچەكەیەتی و ئەو نیوەكەی تریشی بۆ خوشكەكەیەتی، كچی كوڕەكەی هیچی ناكەوێ. بشچۆ بۆلای ئیبنو مەسعوود،

---

[٢٠٦٠] انفرد البخاري بتخريج حديث ابن مسعود في توريث بنت الابن. (كتاب الفرائض — خاتمة — ج/ ١٣ ص/٥٥١ فتح). -المترجم-

بۆ دڵنیایی تەواو لەویش بپرسە، دەبینی ئەویش هەروەك من دەڵێ و لەم پرسیارەدا پەیڕەوی من دەكا. جا پرسیاركرا لە ئیبنو مەسعوود، وە قسەكەی ئەبو مووساشیان گێڕایەوە بۆی، ئەویش فەرمووی: ئەگەر وابێ. دەبێ من ڕێگەی شەرعم هەڵەكردبێ و لەم لایەنەوە سەرم لێشێوا بێ، چونكە ئەم وەڵامە هەڵەیە، بەپێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمەرەوەیە، شتی وایش وەك ئەم ئایەتە وایە كەدەفەرموێ: ﴿قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾ لەبەرئەوە من لەم پرسیارەدا، وەك پێغەمەر خۆی بڕیار ئەدەم و حوكم دەكەم: بۆ كچەكە نیوە هەیە، بۆ كچی كوڕەكەش شەش یەك هەیە، كە بەهەردوولا دەكەنە دووسێ یەكی تەواو، كە دوو سێ یەك بەشی دیاریكراوی دوو كچ و زیاترە، وە هەرچیش لەوان مایەوە بۆ خوشكەكەیە، جا چوینەوە بۆلای ئەبو مووسا و قسەكەی ئیبنو مەسعوود مان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: ئێوە كە ئەم زانا گەورەیەتان والەناوا، لەمن مەپرسن، لەو بپرسن، پرسیارەكەتان وەڵام دەداتەوە. (تاجی كوردی/٣ ل/٧ ز/٣ ژ/٣- باسی بەشە كەلەپووری مناڵ).

٢٠٦١- عن أنس بن مالك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: ابن أخت القوم من أنفسهم. (الحديث ٦٧٦٢)[٢٠٦١].

خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: خوشكە زای پیاو یەكێكە لە كەسوكارەكەی. (تاجی كوردی/٣ ل/٢٢ ز/٩ ژ/٢ – باسی دانی كەلەپوور بەخاڵوان (ذەویلئەرحام).

---

[٢٠٦١] اخرجه مسلم في الزكاة، باب: اعطاء المؤلفة قلوبهم على الاسلام، رقم/١٠٥٩.

٢٠٦٢- عن أنس بن مالك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: مولى القومِ من أنفسهم. (الحديث ٦٧٦١)[٢٠٦٢]:

ئەنەسی کوڕی مالیك -ڕەزای خوای لێ بێ- خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئازاد کراوی هەموو کەسێ بەیەکێك لەخۆیان دادەنرێ و میرات و کەلەپوورەکەی لەپاش مردنی بۆ ئەوانە، ئەگەر میراتبەری خزمی نەبوو. (تاج/٣ ل/١٩ ز/٨ ژ/٢).

٢٠٦٣- عن سعد رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: سمعت النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقول: من أدعى إليَ غير أبيهِ، وهو يعلم أنّهُ غير أبيهِ، فالجنة عليه حرامٌ. (الحديث ٦٧٦٦ سبق طرفه في: رقم: ١٥٩٣ تجريد = ٤٣٢٦ فتح الباري = بەرگی/٤ ل/٣٣٩. أنظر رقم/١٣٩٥ تجريد فذكر ذلك لأبي بكرة فقال: وأنا سمعته أذناي و وعاه قلبي من رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الحديث ٦٧٦٧ تقدم طرفه في: ١٥٩٣ تجريد = ٤٣٢٧ فتح الباري = بەرگی/٤ ل/٣٣٩). (انظر رقم/١٣٩٥ تجريد = ٣٥٠٨ فتح الباري = بەرگی/٤ ل/٨٣)[٢٠٦٣]:

روونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە پێویستی بە روونکردنەوەیەکی تایبەتە، پیاوێ هەبوو ناوی زیادی کوڕی باوکی بوو، یەکێ بوو لە سەرکردەکانی ئیمامی عەلی، دایك برای ئەبو بەکرە بوو، دایکی کەنیزەك بوو، ئەبوسوفیان لەسەردەمی ئیمامی

---

[٢٠٦٢] أشار في التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول إلى تخريج البخاري لهذا الحديث فقط و انفراده به من دون مسلم. -المترجم-

[٢٠٦٣] اخرجه مسلم في الإيمان باب: بيان حال إيمان من رغب عن أبيه ... رقم/٦٣.

عومەردا، گوتی: من دەزانم ئەم زیادەکێ سکی دایکی پڕی پڕکردووە، ئەگەر بمەوێ ناوی ئەوکەسە دەبەم، بەڵام لەعومەر دەترسم. مەبەستی ئەبوسوفیان ئەوەبوو، کە زۆڵە و لەخۆیەتی، لەوپیاوە نییە کە مێردی دایکی زیادبووە، جالەکاتی شەڕو هەراکانی نێوانی ئیمامی عەلی‌و معاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا، زیاد سەرکردەیەکی ئازای بەناو بانگ بوو، عەلی کردبووی بەسەرکاری سەروڵاتی فارس، موعاوییە پەیوەندی پێیەوە کرد، وە هەڵیگێڕایەوە لەعەلی، وەکردی بەبرای خۆی‌و ناوی نا زیادی کوڕی ئەبو سوفیان‌و کردی بە فەرمانڕەوای سەر بەصرە، ئەوجا کردی بەهی کووفە و ڕێزێکی زۆری گرت، زیاد پیاوێکی زۆر ڕەوانبێژ بوو. جا بەم بۆنەیەوە ئەبو عوسمانی نهدی ئەم فەرموودەیەی پێغەمەری لەسەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە گێڕایەوە بۆ ئەبو بەکرە و گلەیی لێ کردو فەرمووی: ئەمە چی بوو کردتان؟ ئەبوبەکرەش فەرمووی: گوناهی منی تێدانییە، منیش ئەم فەرموودەیەم بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ژنەوتووە و بەدڵ تێی گەیشتووم. (بۆ ڕوونکردنەوە بڕ: ژمارە/٩٣٥ تەجرید = ب/٣ ل/١٠).

٢٠٦٤- عن أبي هريرة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: لا ترغبوا عن آبائكم، فمن رغب عن أبيه فهو كفرٌ. (الحديث ٦٧٦٨)[٢٠٦٤]. (بڕ: ژمارە/١٣٩٥ و ١٣٩٦ لەبەرگی/٤ ل/٣٣٩).

---

[٢٠٦٤] أخرجه مسلم في الإيمان، باب: بيان حال ايمان من رغب عن أبيه...رقم/٦٢.

# پایانێ = خاتمه

ماملۆستای عەسقەلانی -ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: نامەی فەرائیض چلو سێ فەرموودەی بەرزەوەکراوی واتیادا، تەنیا فەرموودەکەی تەمیمی داری بێپشتەیە، کە دەفەرموێ: (من أسلم على يديه رجل) ئەوانی تر هەموو پەیوەست (موصول)ن، دووبارەکەیان سیی‌و حەوت فەرموودەن، پالفتە (پوختە)کەیان: (٤٣ – ٣٧ = ٦) شەش فەرموودەن. ئیمامی موسلیم تەنیا ئەم دوانەیانی گێڕاوەتەوە:

١. فەرموودەی ئەبو هورەیرە: (في الجنين غرة) = رقم/٦٧٤٠ فەتح.

٢. فەرموودەی ئیبنوعەباس: (ألحقوا الفرائض بأهلها) = ٢٠٥٩ تەجرید = ٦٧٣٢ فەتحولباری. بەڵام ئەم فەرموودانەی تری لەئەفرادی ئیمامی بوخارین -ڕەحمەتی خودای لێبێ-.

أ. فەرموودەی موعاز، سەبارەت بە بەشەمیراتی خوشك‌و کچ = ٦٧٣٤ + طرفه في ٦٧٤١ فتح الباری. لەتەجریدەکەدا نییە.

ب. فەرموودەی ئیبنوعەباس سەبارەت بەمیراتگرتنی کچی کوڕ = ٢٠٦٠ تەجرید = ٦٧٣٦ فەتحولباری.

ج. فەرموودەی ئیبنوعەباس: (إن أهل الإسلام لا يسيبون) = ٦٧٥٣ فەتحولباری. لەتەجریدەکەدا نییە.

د. تەعلیقەکەی تەمیمی داری: (هو أولى الناس بمحياه و مماته = بەتەعلیقێ وا لەپێش ژمارە/٦٧٥٧ فەتحولباری).

هەروا دەفەرموێ: بیست و چوار بیستراو (اثر)ی صەحابەو کەسانی تری دوا ئەوانیشی واتیادا.

ئەمانەیش ژمارەی ئەو فەرموودانەن، کە لەسەراسەری ئەم (پەڕاوە = تەجریدە)دا، پەیوەندی بەزانستی کەلەپوورەوە هەیە:

١. ژمارە/ ١٤٣ تەجرید = ١٩٤ فەتحولباری = ب/١ ل/١٦٤.

٢. ژمارە/٦٢٢ تەجرید = ١٢٩٥ فەتحولباری = بەرگی/٢ ل/٤٧.

٣. ژمارە/٩٣٣ تەجرید = ٢٠٤٨ فەتحولباری = بەرگی/٣ ل/٥ هەتا ل/٧.

٤. ژمارە/١٠٠٩ تەجرید = ٢٢٨٩ فەتحولباری = بەرگی/٣ ل/٩٠.

٥. ژمارە/١٠٤٩ تەجرید = ٢٣٩٩ فەتحولباری = بەرگی/٣ ل/١٤٣.

٦. ژمارە/١٠٤١ تەجرید = ٢٧٦٤ فەتحولباری = بەرگی/٣ ل/٢٧٢.

٧. ژمارە/١١٤٣ تەجرید = ٢٧٧٦ = بەرگی/٣ ل/٢٧٤.

٨. ژمارە/١١٤٥ تەجرید = ٢٧٨٠ فەتح = بەرگی/٣ ل/٢٧٥.

٩. ژمارە/١٢٥٨ تەجرید = ٣٠٩٤ فەتحولباری. ب/٣ ل/٣٧٩.

١٠. ژمارە/١٣٩٥ تەجرید = ٣٥٠٨ فەتحولباری = بەرگی/٤ ل/٨٣.

١١. ژمارە/١٥٣٩ تەجرید = ٤٠٣٤ فەتحولباری = بەرگی/٤ ل/٢٧٣.

١٢. ژمارە/١٦٥٠ تەجرید = ٤٥٧٧ فەتحولباری = بەرگی/٤ ل/٤٣١.

١٣. ژمارە/١٩٢٨ تەجرید = ٦٠١٤ = بەرگی/٥ ل/...

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٨٩- نامەی تۆڵەی تاوان، که ناسراون بەحەددە شەرعییەکان - کتاب الحدود

ئەم باسە لەتاجول ئوصولدا، دەکەوێتە بەرگی سێیەم لاپەڕە/١٩٩ زنجیره/٨١ هەتا زنجیره/١٠١ ل/٢٦٦ + فیقهی ئاسان، بەرگی سێیەم، لاپەڕە/٨٠٥ زنجیره/٣١٨ هەتا/لاپەیڕە/٨٣٩ زنجیره/٣٣٤ + تەجریدی بوخاری، بەرگی/٥ ل/......نامەی خواردنەوەکان، ژمارە/١٨٤٠، ١٨٤١، ١٨٤٢، ١٨٤٣، ....تاد.

٢٠٦٥- عن أبي هريرة رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ أتي النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ برجل شرب، قال: (اضربوه) قال ابو هريرة: فمنا الضارب بيده، و الضارب بنعله و الضارب بثوبه، فلما انصرف قال بعض القومِ: أخزاك الله، قال: لا تقولوا هكذا، لا تعينوا عليه الشيطان. (الحديث ٦٧٧٧، طرفه في: ٦٧٨١)[٢٠٦٥]:

ئەبو هورەیره -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: کابرایەکیان هێنا بۆلای پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئارەقی خواردبۆوە، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئادەی لێی دەن. ئیتر ئێمەش دەسمان کرد بەلێدانی، هەمان بوو بەدەستی لێی دەدا، چەن شەقازللیەکی لێدەدا، هەمان بوو بەجلەکەی لێی دەدا جلەکەی لوول دەکردو پیاودا دەماڵی، کاتێ کابراکە

---

[٢٠٦٥] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث أبي هريرة: (اتى النبيُ صَلى اللهُ عَليهِ وَسَلمَ برجل قد شرب الخمر). (خاتمة كتاب الحدود – فتح/١٤ ص/١٦٣ طبعة جديدة). -المترجم-

رۆیشت، هەندێ کەس گوتیان: خواروو زەردو شەرمەسارت کا، بۆ ئیشێ دەیکەیت!.

پێغەمەریش -درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: نا، وا مەڵێن، مەبن بە کۆمەکی شەیتان لەسەری!. (تاجی کوردی/٣ ل/٢٥٢ ز/٩٦ – باسی: حەددی: بادەنۆش: ئارەقنۆش. ژ/ ٢+ ١ +٣ +٤ - ب/د = بوخاری و ئەبوداوود).

٢٠٦٦– عن علي بن أبي طالب رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قال: ما كنتُ لأقيمَ حداً على أحدٍ فيموت، فأجدَ في نفسي، إلا صاحب الخمر، فإنَّهُ لو مات وديتهُ، وذلك أن رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لم يسنَّهُ. (الحديث ٦٧٧٨)[٢٠٦٦].

ئیمامی عەلی -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ: داری حەدد لەهەرکەسێ بدەم، لەوکەسانەی کەداری حەدیان لێ دەدرێ، وەك بوختیانکەر و داوێنپیس، ئەگەر بەوداری حەددەی منە بشمرێ دەربەستی نیمو خەمو خەفەتی پێ ناخۆم، چونکە ئەوجۆرە حەددانە پێغەمەر خۆی دیاریکردوون و دایناون، بەڵام ئەگەر گریمان داری حەددی مەینۆشی لەکەسێ بدەمو بەوداری حەددەی منە بمرێ، ئەوە پەستم دەکا، وە خوێنی ئەو کابرایەش دەدەم کەلەکاتی وادا بمرێ، لەژێرداری حەددی مەینۆشیدا.

٢٠٦٧– عن عمر بن الخطاب رَضِي اللَّهُ عَنْهُ: أن رجلا على عهد رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كان أسمه عبدالله، وكان يلقبُ حماراً وكان يضحك رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وكان النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قد جلَدَهُ في الشَّرابِ، فأتِيَ به يوماً فأمر بِهِ فَجُلِدَ، فقال رجلٌ من القومُ: اللهم العنهُ، ما أكثر ما يؤتى به؟! فقال النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : لا تلعنوه، فوا الله ما علمتُ إلا أنه يحبُّ الله و رسولهُ. (الحديث ٦٧٨٠)[٢٠٦٧].

---

[٢٠٦٦] أخرجه مسلم في الحدود، باب/حد الخمر رقم/١٧٠٧.

[٢٠٦٧] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث عمر في قصة الشارب الملقب حمارا (خاتمة كتاب الحدود فتح الباري/١٤ ص/١٦٣.

–المترجم

عومەری كوڕی خەتاب -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: بەسەرینێی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پیاوێ هەبوو ناوی عەبدوڵلا بوو، نازناوی حیمار بوو (واتە: كەر) جاروبار بەقسەی خۆش، یا بەنوكتەیێ، پێغەمەری دەهێنایە پێكەنین، گەلێ جار پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەسەر مەیخواردنەوە داراكاریی دەكرد، واتە: جەڵدەی مەینۆشێ لێدەدا، ڕۆژێ بەوحاڵەوە هێنابوویان، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی فەرموو جەڵدەیان لێدا، هەندێ كەس گوتیان: لەعنەتی خودای لێبێ، چەندە بەزۆری دەیهێنن لەسەر ئەم خووە پیسە! پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: نەفرین (لەعنەت)ی لێ مەكەن، دەسا بەخودا من ئاگام لێیەتی كەخودا و پێغەمەری خودای خۆش دەوێ، ئەوەیش واتای وایەكە باوەڕی بەخودا و پێغەمەر هەیە، دەی لەعنەتی باوەڕداریش دروست نییە.

روونكردنەوە:

جاروبار و كەمەكەمە، قسەی خۆش‌و قسەی نەستەق‌و نوكتەی خۆش گێڕانەوە شتێكی پەسەندە، خەتیب دەفەرموێ: چونكە ئیمامی عەلی، سەبارەت بەم بابەتە دەفەرموێ: (روحوا القلوب و ابتغوا لها طرف الحكمة:) وچانی دڵ بدەن‌و بەقسەی خۆش و نەستەق باوەشێنی بكەن‌و فێنكی بكەنەوە. ئیمامی زوهری بەهاوەڵەكانی دەفەرموو: ئەگەر شیعرتان هەیە ئادەی بیهێنن، قسەی خۆش بگێڕنەوە چونكە گوێ كەرخ دەبێ. (بڕوانە: تەدریبی ڕاوی ئیمامی سیووتی – بەرگی/٢ ل/٥٨١).

هەندێ جار ئەم كابراسوعبەتچیە هیزۆلكەیێ ڕۆن، یا دوو بەرەیێ هەنگوینی بەدیاری دەهێنا بۆ پێغەمەر، بەقەرز وەری دەگرت لەخاوەنەكەی،

کاتێ خاوەنەکەی دەهات بۆ پارەی هیزۆڵکە ڕۆنەکە، یا بۆ پارەی دووبەرە هەنگوینەکە، دەیبرد بۆلای پێغەمەرو پێی دەگوت: ئەی پێغەمەری خودا!! پارەی شتەکەیی پێبدە!! پێغەمەریش زەردەخەنەیکی دەکردو لەپاشا پارەی دیارییەکەی دەدا بەخاوەنەکەی!!

ئەم بەهرانە لەم فەرموودانەوەردەگیرێن:

١. قسەی نەستەق و قسەی خۆش و نوکتە و شتی وا، باش و ڕەواو دروستن، وە دروستە گوێ یان لێ بگیرێ، وە کەسێ بیانگێڕێتەوە، یا کارێکی نوکتەو قۆشمە بکا دروستە، بەمەرجێ گاڵتەو سوعبەت و قسە نەستەقەکە هەق بێ، ناهەق نەبێ.

٢. خاوەنی گوناهی گەورە بەموسوڵمان دائەنرێ، چونکە ڕێگە نەدراوە کەلەعنەتی لێ بکرێ، وە فەرمانکراوە کەدوعای خێری بۆ بکرێ، بەڵام گوناهەکەی لەسەر ئەنووسرێ.

٣. گوناهبارو تاوانبار، ئەگەر چاکەیان هەبوو، یا ڕەفتارێکی جوانیان تیابوو، دروستە باسی ئەوچاکە و ئەورەفتارە جوانەیان بکرێ.

٤. ئەم جۆرەکەسانە، کەخاوەنی گوناهە گەورەکانن، دروستە مامەڵەو گفتوگۆو مەرحەبایان لەگەڵ بکرێ، تەنانەت دیاریشیان لێ وەربگیرێ و تاموشۆو دراوسێتی یان بکرێ، ئەوەندە هەیە بەهیچ جۆرێ نابێ هان بدرێن و تەشجیع بکرێن لەسەرکردنی گوناه، بەڵکوو بە پێچەوانەوە دەبێ ئامۆژگاری خێر، بەپێی حاڵ بکرێن.

٥. دروستە ژن و ژنخوازی لەگەڵیان، وە تەڵاقی موسوڵمان بەکردنی گوناهی گەورە ناکەوێ.

٦. بەکردنی گوناهی گەورە چاکەی مرۆڤ ناسڕێتەوە، ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾.

٧. هەتا لەسەردەمی پێغەمەردا، ئەم جۆرەکەسانەی تیادابووە.

٨. بەڕاستی لەم رۆژگارەی ئێمەدا خاوەنی گوناهی گەورە زۆر بوون، وە موسوڵمانان دەستیان ناڕوا بەسەریانا، لەکاتی وادا، واباشە موداراتیان لەگەڵ بکرێو چاوپۆشی لەهەندێ کاریان بکرێو، موسوڵمان بەخۆڕایی کێشەو بەرە بۆخۆی دروست نەکا.

٢٠٦٨- عن أبي هريرة رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: لعَنَ الله السارق يسرق البيضة فتقطع يده، و يسرق الحبل فتقطع يده. (الحديث ٦٧٨٣)[٢٠٦٨]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: نەفرینو لەعنەتی خودا لەدز، کەئەوەندە نەفسی سووکە، لەسەر دزینی هێلکەیێ، یا بەهۆی دزینی گوریسێکەوە دەستی دەبڕن بەپێی شەرعی خوا. (تاجی کوردی/٣ ل/٢٣٣ ژ/١ ز/٩٠ -ش/د/ت/ن باسی دزی..).

٢٠٦٩- عن عائشة رَضِيَ اللّٰهُ عَنها عن النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: تقطع اليد في ربع دينارٍ فصاعداً. (الحديث٦٧٨٩ طرفاه في: ٦٧٩٠، ٦٧٩١)[٢٠٦٩]:

---

[٢٠٦٨] اخرجه مسلم في الحدود، باب/ حد السرقة و نصابها، رقم/١٦٨٧.

[٢٠٦٩] اخرجه مسلم في الحدود، باب: حد السرقة و نصابها، رقم/١٦٨٤.

عائيشه -ڕەزای خوای لێ بێ- دەفەرموێ خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: دەستی دز بەپێی شەرع، کاتێ دەبڕرێ کە بایی چارەکێ دیناری زێڕ بدزێ، یا بایی زیاتر بدزێ. (تاجی کوردی/٣ ل/٢٣٤ ز/٩٠ ژ/٢ – باسی سزای دزی – ش/د/ت/ن).

٢٠٧٠– و عنها رَضِي اللّٰهُ عَنْها أن يد السَّارق لم تقطع في عهد النبي صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إلا في ثمن مجنٍ، حجفةٍ أو ترسٍ. (الحديث ٦٧٩٢ طرفاه في: ٦٧٩٣، ٦٧٩٤)[٢٠٧٠]:

دیسان عائیشه -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: بەسەرینیی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەستی دز نەدەبڕرا، لەکەمتر لەبەهای مەتاڵێ، ئیتر قەڵخانێ بێ، کەبەچەرم جوتبەقێ کرابێ، یا قەڵخانێ بێ کەتەختەو بەرگی چەرمی تێ گیرابێ.

٢٠٧١–عن عبدالله بن عمر رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما أنَّ رسول الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قطع في مجنٍ ثمنه ثلاثة دراهم. (الحديث ٦٧٩٥ أطرافه في: ٦٧٩٦، ٦٧٩٧، ٦٧٩٨)[٢٠٧١]:

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەستی دزێکی بڕی، لەسەر دزینی قەڵخانێ کە بایی سێ درەم بوو! (تاجی کوردی/٣ ل/٢٣٤ ز/٩٠ ژ/٣ – ش/د).

---

[٢٠٧٠] اخرجه مسلم في الحدود، باب/ حد السرقة و نصابها رقم/١٦٨٥.

[٢٠٧١] أخرجه مسلم في الحدود، باب/ حد السرقة و نصابها رقم/ ١٦٨٦.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٩٠- نامەی موحاریبین
## كتاب المحاربين من أهل الكفر و الردة

موحاريبين: واتە ئەوانەی کە دژایەتی دەکەن لەگەڵ خوداو پێغەمەردا، لەبێباوەڕان و پاشگەزبوان.

٢٠٧٢- عن أبي بردة الأنصاري رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: كان النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقول: لا يجلد فوق عشر جلداتٍ إلا في حدٍ من حدود الله. (الحديث ٦٨٤٨ طرفاه في: ٦٨٤٩، ٦٨٥٠)[٢٠٧٢]:

ئەبو بوردەی ئەنصاری -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: جاران خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: مەگەر بۆ حەددی شەرعی، ئەگینا لەسەر هیچ سەرپێچییەکی تر، لەدەردار (جەڵدە) زیاتر لەکەس نادرێ. (تاجی کوردی/٣ ل/٢٥٤ ز/٩٧ ژ/١ – باسی: تەمێ کردن (تەعزیز = سووك کردن).

روونکردنەوە:

ئەبو بوردەی ئەنصاری ناوی هانی کوڕی نیارە، خاڵی بەڕائی کوڕی عازیبە، ئامادەی جەنگی بەدرو نەبەردەکانی پاش بەدر بووە، هەروا ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووەم بووە. فەرموودەی لەبوخاری و موسلیم داهەیە،

---

[٢٠٧٢] اخرجه مسلم في الحدود، باب/ قدر أسواط التعزيز، رقم/١٧٠٨.

لەبوخاریدا هەرئەم فەرموودەیەی هەیە، کەدوو تەرەفی هەیە، ژمارە: ٦٨٤٩ و ٦٨٥٠.

شەیخان: بوخاری و موسلیم –ڕەحمەتی خودایان لێبێ- لە صەحیحیندا، لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەتیان لێیەوە کردووە، بوخاری لە عەبدولڕەحمانی کوڕی جابیریشەوە تەرەفی ژمارە/٦٨٤٩ ی ئەم فەرموودەیەی ئێرەی لێوە ریوایەت کردووە، ئەبو بوردە بێ وەچەبووە، منداڵو منداڵەزای لەپاش بەجێ نەماوە.

ئەم زاتانە گێڕانەوەیان لێ ئەنجام داوە: بەرائی کوڕی عازیبو کەعبی کوڕی عومەیرو نەصری کوڕی یەسار، پشتگیری عەلی بوو لەهەموو نەبەردەکانیدا، دەڵێن: لەدەوروبەری ساڵی چلو یەك، یادوو، یا پێنج مردووە -ڕەزای و ڕەحمەتی خوای لێبێ-.

٢٠٧٣– عن أبي هريرة رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: سمعت أبا القاسم صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقول: من قذف مملوكه، وهو بريءٌ مما قال، جلد يوم القيامة، إلا أن يكونَ كما قال. (الحديث ٦٨٥٨)[٢٠٧٣].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: بەگوێی خۆم ژنەوتم لەزاری پیرۆزی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: کەسێ بوختان بکا بۆ بەندەی خۆی، کۆیلەکەی ژن بێ یا پیاو، بەلام بەندەکەی بێ تاوان بێو پاك بێ، ئەوە لە رۆژی قیامەتدا، ئەو خاوەن کۆیلەیە دادەنرێ بەبوختیانکار، لەرۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو بوختانە داری حەددی لێ دەدرێ. بەلام ئەگەر وەك دەڵێ، کۆیلەکەوابێ، ئەوە داری حەددی لێ نادرێ. (تاج/٣ ل/٢٥٠ ز/٩٥- باسی حەددی بوختیانو جمێن و جادوو بازیی).

---

(٢٠٧٣) أخرجه مسلم في الإيمان، باب: التغليظ على من قذف مملوكهُ بالزّنا، رقم/١٦٦٠.

# پایانێ - خاتمةٌ

عەسقەلانی –ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: نامەی حودوودو موحاریبین، سەدو سێ فەرموودەی بەرزی واتیادا، حەفتاو نۆیان پەیوەستن، واتە موصولن، لە ئیمامی بوخارییەوە هەتا سەر پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- رشتەکەیان بێ بچڕانە. ئەوانی تریان بێ ڕشتەو موتابەعاتن، دووبارەکانیان شەستو دووە، پوختەکەیان: (٧٩ — ٦٢ = ١٧) حەفدە فەرموودەن، ئیمامی موسلیمیش ئەم پوختەیەی گێڕاوەتەوە بێجگە لەم هەشت فەرموودەیەیان:

١. فەرموودەی ئەبو هورەیرە: (أتي النَّبِيُّ برجل قد شرب الخمر) = ژمارە/٢٠٦٥ تەجرید = ٦٧٧٧ فەتحولباری.

٢. فەرموودەی سائیبی کوڕی یەزید: (كنا نؤتي بالشارب على عهد رَسُولُ اللّٰهِ) = ٦٧٧٩ فەتحولباری.

٣. فەرموودەی عومەر: باسی کابرای نازناوی کەربوو = ژمارە/ ٢٠٦٧ تەجرید = ٦٧٨٠ فەتحولباری.

٤. فەرموودەی ئیبنوعەباس: (لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن) ژمارە/ ٦٧٨٢ فەتحولباری.

٥. فەرموودەی عەلی: (في رجم المرأة وجلدها = ٦٨١٢ فەتحولباری).

٦. فەرموودەی عەلی: (أَمَا عِلِمْتَ أَنَّ القلم رفع عن المجنون = پێش ژمارە/٦٨١٥ فەتحولباری).

٧. فەرموودەی ئەنەس: (يا رَسُولُ اللَّهِ أصبت حدا فاقمه علي) = ژمارە/٦٨٢٣ فەتحولباری.

٨. فەرموودەی ئیبنوعەبباس لەبارەی چیرۆکەکەی ماعیزەوە = ٦٨٢٤.

هەروا دەفەرموێ: فەرموودە درێژەکەی عومەریش سەبارەت بەداستانی سەقیفە کە سەرەتاکەی سەبارەت بەچیرۆکی رەجم متفق علیه یە. هەروا دەفەرموێ: بیست بیستراو (أثر)یشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٩١- نامەی خوێنو خوێنبایی

# كتاب الديات

باسی خوێنو و خوێنبایی لەتاجول ئوصوول دا، تەرجەمە كوردییەكەی دەكەوێتە: بەرگی/٣ ل/٢١٣ ز/٨٣ هەتا زنجیرە: ٨٩ لاپەڕە/٢٣٢. لەفیقهی ئاسانا والەبەرگی/٣ ل/٧٨٢ ز/٣٠٦ هەتا زنجیرە/٣١٧ ل/٨٠٣.

٢٠٧٤- عن ابن عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنهُما قال: قال رسول صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لا يزال المؤمن في فسحة من دينه مالم يصب دماً حراماً. (الحديث ٦٨٦٢ طرفه في: ٦٨٦٣)[٢٠٧٤].

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: موسوڵمان هەتا خوێن ڕشتنی ناڕەوا نەبێ بەتووشیەوە، هێشتا ئاینی بەبەریەوە دەمێنێ.

گێڕانەوەیەكی تری ئەم فەرموودەیە لە تاجا ئاوایە:

موسوڵمان هەتا خوێنی ناڕەوا بەقەستی نەڕێژێ، هێشتا كۆڵی سووكەو خۆش ڕەوتەو هەرباشە، بەڵام هەركاتێ خوێنی ناڕەوا بوو بە تووشیەوە، ئیتر لەپێ دەكەوێو دەوەستێ! (تاجی كوردی/٣ ل/٢٠١ ز/٨١ ژ/٣ – هەڕەشەكردن لەمرۆڤ كوشتن).

---

[٢٠٧٤] و الحديث من أفراده (العيني - عمدة القاري ج/٢٤ ص/٣١). —المترجم-

٢٠٧٥- عن ابن عباس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما قال: قال النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ للمقداد: إذا كان رجلٌ مؤمنٌ يخفي إيمانهُ مع قومٍ كفارٍ، فأَظهرَ إيمانه فقتلتهُ؟ فكذلك كنتُ أنت تخفي إيمانك بمكة من قبلُ. (الحديث ٦٨٦٦)[٢٠٧٥].

ئیبنو عەبباس -ڕەزای خودا لەخۆیو بابی- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- بەمیقدادی کوڕی ئەسوەدی فەرموو: ئەگەر پیاوێکی موسوڵمان، لەناو هۆزێکی ناموسوڵماندا بێ، باوەڕەکەی بشارێتەوە، هەتا نا موسوڵمانەکان پێی نەزانن‌و ئازاری نەدەن، بەڵام کاتێ باوەڕی خۆی ئاشکرا بکا تۆ بچی بیکوژی؟ دەی تۆیش ڕێك ئاوا بوویت کاتێ لەمەککە بوویت لەپێش کۆچ کردندا.

روونکردنەوە:

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە سەرنجی ژمارە: ١٥٣٥ تەجرید = ٤٠١٩ فەتح بدە = بەرگی/٤ ل ل/٢٦٩.

٢٠٧٥م- عن عبدالله بن عمر رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما عن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: من حمل علينا السلاح فليس منَّا. (الحديث ٦٨٧٤ طرفه في: ٧٠٧)[٢٠٧٥م].

---

[٢٠٧٥] راجع رقم: ١٥٣٥ تەجريد = ٤٠١٩ فەتح. —المترجم

[٢٠٧٥م] و الحديث من أفراده (العيني = عمدة القاري/٢٤ ص٣٧). —المترجم

عەبدوڵلای کوڕی عومەر -ڕەزای خوای لیٚ بیٚ- فەرمووی: پیٚغەمەر -دروودی خوای لەسەر بیٚ- فەرمووی: کەسیٚ چەکمان لیٚ هەڵبگریٚ لەئیٚمە نییە. (تاجی کوردی/٨ ل/١٣٣ ز/٥٥ باسی: پەیمان شکاندن و بیٚ پەیمانی).

٢٠٧٦- عن عبدالله رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: قال رسول الله صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لا يحل دَمُ امرِيءٍ مسلمٍ، يشهد أن لا إله إلاّ اللهُ وَأَنّي رسول الله، إلا بإحدى ثلاثٍ: النفس بالنفس، و الثيبُ الزاني، و المفارق لدينه التارك للجماعة. (الحديث ٦٨٧٨)[٢٠٧٦]:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود -ڕەزای خوادای لیٚبیٚ- دەفەرمویٚ: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بیٚ- دەفەرمویٚ: هەر موسوڵمانیٚ شایەتمان بهیٚنیٚ و بڵیٚ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ محمداً رَسُولُ اللّٰهِ: بەدڵ باوەڕم هەیەو بەزمان دەڵیٚم و شایەتی دەدەم کەهەرخودا خودایەو بەس، خودای تر نییە، موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلایش پیٚغەمەری ڕەوانەکراوی خودایە). هەرکەسیٚ ئەم شایەتییە بدا، ئیتر خویٚنی ئەوکەسە حەرامەو بەهیچ شیٚوەییٚ خویٚنیٚ بەکەس ڕەوانابیٚ، مەگەر لەیەکیٚ لەم سیٚ کاتانەدا: بیٚوەی داویٚنپیس، چ ژن بیٚ، چ پیاو، یاکەسیٚ بەناڕەوا کەسیٚ بەئارەزوو بکوژیٚ، یالەئایینی خۆی وەرگەڕابیٚ و لەکۆمەڵەی موسوڵمانان تەرا بووبیٚ! (فیقهی ئاسان/٣ ل/٨١٠ ز/٣١٩ باسی تۆڵەی شەروالپیسی).

---

[٢٠٧٦] اخرجه مسلم في القسامة، باب: ما يباح به دم المسلم، رقم/١٦٧٦.

٢٠٧٧- عن ابن عباس رَضِي اللّٰهُ عَنهُما أن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قال: أبعض النّاس إلى الله ثلاثة، ملحد في الحرم، و مبتغ في الإسلام سنة الجاهلية، و مطلب دمِ امريءٍ بغير حقّ لِيهريق دمهُ. (الحديث ٦٨٨٢)[٢٠٧٧].

ئیبنو عەبباس -ڕەزای خودا لەخۆی و بابی- فەرمووی: خۆشەویست - دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: خودا لەهەموو تاوانبارێ زیاتر، رقی لەم سێ تاوانبارەیە: یەکەم زەندیقی ناوبەستو حەرەمی مەککە، دووەم: کەسێ لەئیسلامەتیدا، منەیی ڕەوشتو یاسای سەردەمی نەزانی بکا، سێیەم: کەسێ منەی خوێنی کەسێ بکا، تا بەناڕەوا خوێنی بڕێژێ. (تاج/٣ ل/٢٠٥ ز/٨١ ژ/٩ — باسی هەڕەشە کردن لەکوشتنی ناڕەوا).

٢٠٧٨- عن أبي هريرة رَضِي اللّٰهُ عَنهُ قال: سمعت رسول يقول: لو أطلع في بيتك أحدٌ، ولم تأذن له، حذفته بحصاةٍ، ففقأتَ عينه ما كانَ عليك من جناحٍ. (الحديث ٦٨٨٨ طرفه في: ٦٩٠٢)[٢٠٧٨].

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لەخۆشەویست - دروودی خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: ئەگەر کەسێ، بەبێ ڕێگە پێدانی خۆت، تەماشای ناومالّی تۆ بکا، تۆ بە پەلەپیتکە چەوێکی تێبگری و چاوی قەلپووت بکەی، گوناهت ناگا. (تاجی کوردی/٣ ل/٢٢٧ ز/٨٧ ژ/٣ — باسی ئەوانەی کە خوێنیان بەفیڕۆ دائەنرێ).

---

[٢٠٧٧] و الحديث من أفراده (العيني - عمدة القاري/٢٤ ص/٤٤). —المترجم

[٢٠٧٨] اخرجه مسلم في الآداب، باب تحريم النظر في بيت غيره رقم/٢١٥٨.

٢٠٧٩- عن ابن عباس رَضِي اللّٰهُ عَنهُما عن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قال: هذه و هذه سواءٌ يعني الخنصر و الإبهام. (الحديث ٦٨٩٥)[٢٠٧٩]:

ئيبنو عەبباس -ڕەزای خودا لەخۆی و بابی- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ئەمەو ئەمە یەکسانن و خوێنیان وەك یەکە. واتە: پەنجە تووتەو پەنجە کەڵە خوێنیان چون یەکە. (تاجی کوردی/٣/ ل/٢٢١ ز/٨٥ ژ/١ – باسی خوێنی ئەندامەکانی لەش – ب/د/ت/ن).

---

[٢٠٧٩] لم یووافقه مسلم على تخریج حدیث ابن عباس: هذه وهذه سواء. (خاتمة كتاب الديات فتح/١٤ ص/٢٦٢ ط-ج). -المترجم-

# پایانێ - خاتمه

شێخی عەسقەلانی —ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: نامەی خوێن‌و قصاص، پەنجاو چوار فەرموودەی بەرزی واتیادا، حەوتیان بێڕشتەو متابعاتن، ئەوانی تریان پەیوەستن لەئیمامی بوخارییەوە هەتا سەر پێغەمەر، ڕشتەکەیان تەواوەو پچڕانی تیادا نییە. دووبارەکانیان چل فەرموودەن، هەموویان موسلیمیش گێڕاویەتیەوە، بێجگە لەمانەیان:

١. فەرموودەی ئیبنوعومەر: (إن من ورطات الأمور ) = ژمارە/٦٨٦٣ فەتحولباری.

٢. ژمارە/٢٠٧٧ تەجرید = ٦٨٨٢ فەتح = فەرموودەی ئیبنو عەبباس (أبغض الناس إلى الله ثلاثة: ملحد في الحرم).

٣. ژمارە/٦٩٠٠ فەتحولباری = فەرموودەی ئەنەس: (لو أطلع عليك).

٤. فەرموودەی ئیبنو عەبباس: (هذه و هذه سواء) = ٢٠٧٩ تەجرید = ٦٨٩٥.

٥. فەرموودە مورسەلەکەی ئەبو قلابە: (ما قتل أحد قط إلا في إحدى ثلاث) = ژمارە: ٦٨٩٩ فەتحولباری = فەرموودە مورسەلەکەی تری: (دخل عليه نفر من الانصار).

هەروا شێخی عەسقەلانی —ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: بیست‌و هەشت بیستراو (أثر)یشی واتیادا، هەندێکیان پەیوەستن و هەندێکیان بێڕشتەن.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٩٢- نامەی داوای پەشیمان بوونەوە لەپاشگەزو لەسەرکەش و شەڕکردن لەگەڵیان
## كتاب استتابة المرتدين والمعاندين وقتالهم

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم باسە بنوارە: فیقهی ئاسان - بەرگی سێیەم، زنجیرە/٣٣٩ هەتا ٣٤٤ =لاپەڕە/٨٤٧ هەتا ٨٦١.

٢٠٨٠- عن إبن مسعود رضي الله عنه قَال: قال رجل يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ؟ قَالَ: مَنْ أَحْسَنَ فِي الْإِسْلَامِ لَمْ يُؤَاخَذْ بِمَا عَمِلَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَمَنْ أَسَاءَ فِي الْإِسْلَامِ أُخِذَ بِالْأَوَّلِ وَالْآخِرِ. (الحديث ٦٩٢١)[٢٠٨٠].

ئیبنو مەسعود -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: پیاوێ لەپێغەمبەری پرسی: قوربان! ئایا لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی کەلە سەردەمی نەفامی پێش هاتنی ئیسلاما کردوومانن سزاو ئەشکەنجە دەدرێین لەدوا ڕۆژدا؟ فەرمووی: هەرکەسێ لەپاش موسوڵمانبوون ڕەفتارو کرداری جوان بێ، لەسەر کارو کردەوەی سەردەمی کافری پێش ئیسلامبوونی، سزا نادرێ‌و موحاسەبە ناکرێ لەسەری، بەڵام هەرکەسێ لەسەردەمی ئیسلامەتی دا کردارو ڕەفتاری ناشیرین بێ، تۆڵەی بەرو دوای لێ دەسێنرێ.

---

[٢٠٨٠] اخرجه مسلم في الايمان، باب: هل يؤاخذ بأعمال الجاهلية، رقم/١٢٠.

## پایانیٚ = خاتمة

مامۆستای عەسقەلانی، -رەحمەتی خودای لیٚ بیٚ- دەفەرمویٚ: نامەی إستتابەی مورتەددین، بیستو یەك فەرموودەی بەرزەوە کراوی واتیادا، یەکێکیان بێپرشتەیە، ئەوانی تریان هەموو پەیوەستن، واتە: موصولن. حەڤدەیان دووبارەن، پوختەکەیان (٢١- ١٧ = ٤) چوار فەرموودەیە. ئیمامی موسلیم ئەم پوختەیەی هەموو گێڕاوەتەوە، حەوت بیستراوی هاوەڵانو دوای هاوەڵانیشی واتیادا، هەموویان پەیوەستن.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٩٣- نامەی خەوپەرژێن ⋆ كتاب التعبير

نامەی خەونو خەوبینین و دەستوورەکانی خەوبینین والەتاجی کوردیدا بەرگی/٨ ل/٣ ز/١ هەتا ل/٣٦ ز/١٠.

٢٠٨١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ الرَّجُلِ الصَّالِحِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. (الحديث ٦٩٨٣ طرفه في: ٦٩٩٤)[٢٠٨١].

ئەنەسی کوڕی مالیك -رەزای خوای لیٚ بیٚ- دەفەرمویٚ: پێغەمەر -درودی خوای لەسەر- دەفەرمویٚ: خەونی باشی پیاوی باش، بەشێکە لەچلو شەش بەش لەپێغەمەرایەتی. (تاجی کوردی/٨ ل/٣ ز/١ ژ/١ + ل/٦ ژ/٢ ز/٢) .

---

[٢٠٨١] اخرجه مسلم عن أبي هريرة (فتح/١٤ ص٣٨٧). -المترجم-

٢٠٨٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يُحِبُّهَا فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ اللَّهِ فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَلَيْهَا وَلْيُحَدِّثْ بِهَا وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُ فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيْطَانِ فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا وَلَا يَذْكُرْهَا لِأَحَدٍ فَإِنَّهَا لَا تَضُرُّهُ. (الحديث ٦٩٨٥)[٢٠٨٢].

ئەبو سەعیدی خودری -رەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست دەیفەرموو: (ئەگەر كەسێكتان خەونێكی بینیو خەونەكەی پێ خۆش بوو، ئەوە لەخوداوەیە، باحەمدو سوپاسی خودای لەسەر بكاو بیگێڕێتەوە بۆ زاناو دۆست، بەڵام ئەگەر خەوێكی وای دی كە بە دڵی نەبوو، ئەوە لەشەیتانەوەیە، باپەنابگرێ بەخودا لەشەڕی شەیتانو لەشەڕی ئەو خەونە، وەباسی نەكا بۆكەس، ئیتر زیانی پێ ناگەیەنێ!). (تاجی كوردی/٨ ل/٤ ز/١ ژ/٣).

٢٠٨٣- عن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلَّا الْمُبَشِّرَاتُ قَالُوا: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ.(الحديث ٦٩٩٠)[٢٠٨٣].

ئەبو هوریرە -رەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: بیستم لەپێغەمەر- دروودی لەسەر- دەیفەرموو: (لەپێغەمەرایەتی تەنیا موژدە بەخشەكان ماون). هاوەڵان -رەزای خودایان لێ بێ- فەرموویان: قوربان! موژدەدەرەكان چین؟ فەرمووی: (خەونی باشە). (بڕ: تاجی كوردی/٨ ل/٣ ز/١ ژ/٢).

---

[٢٠٨٢] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابي سعيد: (إذا رأى أحدكم الرؤيا يحبها. (خاتمة كتاب التعبير، فتح/١٤ ص/٤٩٠). -المترجم-

[٢٠٨٣] والحديث من أفراده (العيني/٢٤ ص/١٣٤). -المترجم-

٢٠٨٤- و عنه رضي الله عنه قَالَ سمعت رَسُولُ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقُول: مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي اليَقْظَةِ و لَا يَتَمَثَّلُ الشَيطَانُ بِي. (الحديث ٦٩٩٣)[٢٠٨٤]:

ديسان ئەبو هوريرە- رەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: ژ نەوتم لەپێغەمەر - دروودی لەسەر- دەیفەرموو: (هەرکەسێ بەخەو من ببینێ، ئەوە بەچاوی سەریش لەحاڵی هۆشیاریدا من دەبینێ، شەیتان قەت ناچێتە شەکڵی منەوە). (تاج/٨ ل/٢٣ ز/٧ ژ/٢).

٢٠٨٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه أنه سَمِعَ النَّبِيَّ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَكَوَّنُنِي. (الحديث ٦٩٩٧)[٢٠٨٥]:

ئەبو سەعیدی خودری -رەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ژنەوتم لەپێغەمەر -درودی خوای لەسەر- دەیفەرموو: هەرکەسێ لەخەونیدا من ببینێ، ئەوە خەوێکی ڕاستو دروستی دیوە، چونکە شەیتان خۆی بۆ ناکرێ بەمن و، ناتوانێ بەهیچ شێوەیێو لەهیچ حاڵێکا بچێتە شکڵ و شێوەی منەوە). (تاجی کوردی/٨/ل-٢٣ز:٧ژ:٣-ش- باسی دیتنی پێغەمەر بەخەون.

---

[٢٠٨٤] أخرجه مسلم في الرؤيا، باب: قول النبي صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلمَ من رآني في المنام فقد رآني، رقم/٢٢٦٦.

[٢٠٨٥] قال الشيخ منصور علي ناصِف مُؤلفُ (التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول صَلى اللهم عَليهِ وَسَلمَ: (رواه الشيخانِ). راجع التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول. الأصل العربي مجلد/٤ ص/٣١٦. راجع صحيح مسلم بشرح النووي ج/٥ ص/٢٦. -المترجم-

روونکردنەوە:

بینینـی پێغەمـەر -درودی خـوای لەسـەر- بەخـەو، بـەدوو شـێوە دەبـێ، بەهێزەکەیان ئەوەیە: کەلەسەر شێوەی کـاتی ژیـانی پێغەمـەر -درودی خـوای لەسـەر- ببینـێ، ئـیتر شـێوەی کـاتی لاوی بـێ، یاکـاتی هـەرەتی پیـاوەتی بـێ، یاشێوەی کاتی پیری بێ، یاهی کاتی ئاخرو ئوخری ژیـانی بـێ، دەبـێ تەنانـەت ئیبنو سیرین کە گەورەترین خەونزانی ناوداری موسوڵمانانە، کاتێ کەسـێ بـۆ یدەگێڕایەوە کەپێغەمەری دیوە، پێی دەگوت: ئادەی باسی شـێوەو شـەکڵیم بـۆ بکە چۆن بوو؟ ئەگـەر کـابرا بیگوتبایـە شـێوەی ئـاواو ئـاوابوو، وەئـەوەی ئـەو دەیگوت جیابوایە لەشێوەو سیفەتی پێغەمـەر لـەکاتی ژیانیـدا، ئیبنـو سـیرین دەیگوت پێـی: نـەت دیـوە!). پیـاوێکیش بـەئیبنو عەباسـی فـەرموو: لەخـەونا بەخزمەتی پێغەمەر -دروودی لەسەر- گەیشتم، پێی فەرموو: ڕەنگـو ڕواڵەتو شێوەی چۆن بـوو؟ پیـاوە کـە پێـی گـوت: مـن حەسـەنی کـوڕی عـەلیم دیـوە، پێغەمەر لەخەوما لـەوی دەکـرد) . فـەرمووی: ڕاسـت دەکـەیت دیوتـە. جالـەم ڕوانگەیـەوەو بـۆ دڵنیـا بـوون لەڕاسـتیو دروسـتی خـەونی وا، باشـترین شـت ئەوەیە کەمرۆی موسـوڵمان شـارەزایی تـەواوی لەسـیفەتو چۆنێتی ی شـەکڵو شـێوەی پێغەمـەر هـەبێ، هـی کـاتی ژیـانی، وەبـەپێ ی سوننەتو ژینناมـەی ڕاسـتو دروسـتی پێغەمـەر، شـێوەی شـیرینی بناسـێ. بەهـەرحاڵ بینینـی پێغەمەر لەخەونـدا، لەسـەر هـەر شـێوەیێ بـێ، خـاڵی نییـە لەسـوودو بـەهرە، بەڵام بەمەرجێ کە ئەو شێوەیە شایانی شانی پێغەمەر بێت.

٢٠٨٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ فَتُطْعِمُهُ وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ تَحْـتَ عُبَـادَةَ بْنِ الصَّامِتِ فَدَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمًا فَأَطْعَمَتْهُ وَ جَعلَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ فَنَامَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْـرِ مُلُوكًـا

عَلَى الْأَسِرَّةِ أَوْ مِثْلَ الْمُلُوكِ عَلَى الْأَسِرَّةِ قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ ادْعُ اللّٰهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا لَهَا رسول الله صَلّى اللّٰهم عَلَيْهِ وَسَلّمَ ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ فَنَامَ ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللّٰهِ. كَمَا قَالَ فِي الْأُولَى، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ ادْعُ اللّٰهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ قَالَ: أَنْتِ مِنَ الْأَوَّلِينَ. فَرَكِبَتْ أُمُّ حَرَامٍ بِنْتُ مِلْحَانَ الْبَحْرَ فِي زَمَنِ مُعَاوِيَةَ بن أبي سفيان، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ فَهَلَكَتْ. (الحديث ٢٠٠٧)[٢٠٨٦].

ئەنەسی کوڕی مالیك -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: (گەلێ جار پێغەمەر -درودی خوای لەسەر- دەچوو بۆ دێنی ئوم حەرام، کەپووری هەقی من بوو، خوشکی دایکم بوو، وەپووری شیریی پێغەمەریش بوو، مەحرەمی بوو، نامەحرەم نەبوو، ئوم حەرام ناوی رومەیصای کچی میلحان بوو، خێزانی عوبادەی کوڕی صامیت بوو، ڕۆژێ پێغەمەر -درودی خوای لەسەر- هات بۆ دێنی ی ئوم حەرام، نانی بۆ دانا، دوایی هەنێ سەری پێغەمەری دۆزی، پێغەمەر خەوی لێ دەکەوێو سەرخەوی نیوەڕۆ لەوێ دەشکێنێ، کاتێ خەبەری دەبێتەوە پێ دەکەنێ. ئوم حەرام فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! باوكو دایکم بەقوربانت بن، ئەوە بۆچی پێ دەکەنی؟ فەرمووی: (لەخەوما کۆمەلانێ لەگەلی ئیسلامی خۆمم بینی، دەبن بەخەباتکارو غەزا کار لەڕێگەی خوادا، سواری پشتی ئەم دەریایانە دەبن، شوێنو جێگەیان لەناو پاپۆڕو کەشتی یەکاندا، ئەوەندە باشو خۆشو فەرەحو ئاوەدانە دەلێی پاشان لەسەر تەختو قەنەفەی شاهانە دانیشتوون) ئوم حەرام فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! داوا لەخودا بکە کەمن یەکێ لەم چینەی ئۆمەتت بم. فەرمووی: (تۆ لەوانیتو لەچینی غەزا

[٢٠٨٦] أخرجه مسلم في الإمارة، باب: فضل الغزو في البحر، رقم/١٩١٢.

کاران‌و شەهیدانی ناو دەریایت!) ئەنجا دیسان پێغەمەر -درودی خوای لەسەر- سەری نایەوەو جارێ تر خەوتەوە، کەهەڵسایەوە دیسان پێدەکەنی، کاتێ لەم بارەیەوە پرسیارم لێ ی کردەوە، هەمان وەڵامی پێشووی دامەوە، کەکۆمەڵانێ تریش لەئۆمەتی لەبارو دۆخێکی شاهانەدا دەچن بۆ خەباتگێڕان‌و غەزاکردن لەڕێگەی خودای گەورە داو، ئەویش لەخۆشی ئەوە پێدەکەنێ‌و موعجیبە پێیان). ئوم حەرام فەرمووی: منیش عەرزیم کردەوە: ئەی پێغەمەری خودا! نزام بۆ بکە کە خودا بمکات بەیەکێ لەو دەستەیە.فەرمووی(تۆ لەدەستەی پێشینی!).

لەپاشا لەکاتی موعاوییەی کوڕی سوفیاندا، کەنوێنەری ئیمامی عوسمان بوو لەسەر وڵاتی شام، عوبادەی مێردی، لەدەریاوە ئوم حەرامی لەگەڵ خۆی برد بۆ غەزای قوبروس، کاتێ هاتەوەو گەڕایەوەو گەیشتە وشکانی، هێسترە ماچەیەکیان بۆ یبرد، کاتێ سواری هێسترە کەبوو، گلاندی‌و کەوتە خوارەوەو مرد. بەپێ ی دووعاکەی پێغەمەر، کەبۆیی کرد، شەهید بوو). (تاجی کوردی/٨ ل/٥٣ ژ/١٧ -ش/د/ت/ن).

٢٠٨٧- عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ لم تكد رؤيا المؤمن من تكذب وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. وَمَا كَانَ مِنَ النُّبُوَّةِ فَإِنَّهُ لَا يَكْذِبُ. (الحديث ٧٠١٧)(٢٠٨٧):

ئەبو هوریرە -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -درودی خوای لەسەر- فەرمووی: (کاتێ شەوو ڕۆژ بەرابەر بوون، وەك ناوەڕاستی وەرزی پایزو ناوەڕاستی وەرزی بەهار، لەو کاتەدا زۆر نزیکە کەخەونی موسوڵمان هەڵەی نەبێ‌و ڕاست دەرچێ.ئەو کەسەیشتان خەونی زۆر ڕاست‌و دروستە

---

(٢٠٨٧) أخرجه مسلم في أوائل الرؤيا، رقم/٢٢٦٣.

کەخۆی زۆر ڕاستگۆیە، وەخەونی موسوڵمان، پیاوبێ یاژن، بەشێکە لەچل و شەش بەش لە پێغەمەرایەتی). (شتێکیش کە لەبابەتی پێغەمەرایەتی بێ، قەت بەدرۆ دەرناچێ). (تاجی کوردی/٨ ل/٤ ز/١ ژ/٤ - باسی: بەشەکانی خەون).

٢٠٨٨- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ بن عمر رضي الله عنهما أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: رَأَيْتُ كَأَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ حَتَّى قَامَتْ بِمَهْيَعَةَ وَهِيَ الْجُحْفَةُ فَأَوَّلْتُ أَنَّ وَبَاءَ الْمَدِينَةِ نُقِلَ إِلَيْهَا. (الحديث ٧٠٣٨ طرفاه في: ٧٠٣٩، ٧٠٤٠)[٢٠٨٨].

ئیبنو عومەر ڕەزای خودا لەخۆی و بابی فەرمووی: پێغەمەر دروودی لەسەر فەرمووی:(لەخەوما دیتم وەکوو بڵێی ژنێکی ڕەشی سەر ئاڵۆسکاوی لەمەدینە دەربچێ و بچێ بۆ مەهیەعەوابوو) واتە: بۆ جوحفە، حەزرەت- دروودی لەسەر- فەرمووی: (جامن وام لێکدایەوەو واپەرژینم کرد کەپەتاو ناسازییەکەی مەدینە دەگوێزرێتەوە بۆ مەهیەعە). (تاج/٨ ل/١٧ ز/٥ ژ/٥ - ب/ت -باسی: ئەو خەونانەی کەپێغەمەر خۆی دیونی).

٢٠٨٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ تَحَلَّمَ بِحُلْمٍ لَمْ يَرَهُ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ وَلَنْ يَفْعَلَ وَمَنِ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ أَوْ يَفِرُّونَ مِنْهُ صُبَّ فِي أُذُنِهِ الْآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمَنْ صَوَّرَ صُورَةً عُذِّبَ وَكُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا وَلَيْسَ بِنَافِخٍ. (الحديث ٧٠٤٢)[٢٠٨٩].

ئیبنو عەباس -ڕەزای خودا لەخۆی و لەبابی- دەفەرموێ: پێغەمەر -درودی خوای لەسەر- دەفەرموێ: (هەرکەسێ لە خۆیەوە، خەونێ بەدرۆ هەڵ بەستێ،

---

[٢٠٨٨] قال الشيخ منصور ناصف علي: رواه البخاري. -المترجم-

[٢٠٨٩] لم يوافقه مسلم على حديث عكرمة عن ابن عباس وهو يشتمل على ثلاثة احاديث (من تحلم، ومن استمع، ومن صور)(خاتمة كتاب التعبير فتح/١٤ ص/٤٩٠) -المترجم-

لەڕۆژی قیامەتدا جەختی لێ دەکرێ کە دوو دەنکە جۆی ئاگرین پێکەوە گرێ بدا، ئەویش هەرگیز ئەوەی بۆ ناکرێ، واتەی وایە، کەبەردەوام هەر لەو سزاو ئەشکەنجەیەدا دەبێ. هەرکەسەیش گوێ لە قسەی هۆزێ بگرێ، کەئەوان ئەو گوێگرتنەی ئەویان پێ ناخۆش بێ، یائەوان خۆیانی لێ دوور بخەنەوە هەتا گوێی لەقسەیان نەبێ کەچی ئەویش هەر بچێتە پێشەوەو گوێ یان لێ بگرێ، ئەوە لەڕۆژی قیامەتا، لەتوڵەی ئەو تاوانەدا، قوڕ قوشمی سوورە وەکراوی تواوە دەکرێتە ناو هەردوو کونە گوێچکەیەوە، هەرکەسێکیش وێنەیێ بکێشێ، ئەوە ئازارو سزا دەدرێو بەزۆر داوای لێ دەکرێ کەدەبێ گیان بکا بەبەریدا، دیارە کەئەوەیشی بۆ ناکرێ). (تاجی کوردی/٨ ل/٩ ز/٣ ژ/١ ب/د/ت- باسی: لەخەون گێڕانەوەدا درۆ دروست نییە).

٢٠٩٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إِنَّ مِنْ أَفْرَى الْفِرَى أَنْ يُرِيَ عَيْنَهُ مَا لَمْ تَرَ.(الحديث ٧٠٤٣)[٢٠٩٠]:

ئیبنو عومەر -ڕەزای خودا لەخۆیو بابی- فەرمووی: پێغەمەر -درودی لەسەر- دەفەرموێ: (هەلاتێکی فرە زلە: کەسێ بڵێ: لەخەوما ئەوەم دیوە، وەلەڕاستیشدا هیچی نەدیبێ). (تاجی کوردی/٨ ل/١٠ ز/٣ ژ/٢ -باسی: لەخەون گێڕانەوەدا درۆ دروست نییە).

٢٠٩١- عن ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهمَا أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَجُلًا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطُفُ السَّمْنَ وَالْعَسَلَ فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا فَالْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ وَإِذَا سَبَبٌ وَاصِلٌ مِنَ الْأَرْضِ إِلَى السَّمَاءِ فَأَرَاكَ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلَا بِهِ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلَا بِهِ ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ ثُمَّ وُصِلَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ

---

[٢٠٩٠] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث ابن عمر: (من أفرى الفرى أن يُرى...). (خاتمة كتاب الرؤي و التعبير. ج/١٤ ص/٤٩٠). -المترجم

اللّٰهِ بِأَبِي أَنْتَ وَاللّٰهِ لَتَدَعَنِّي فَأَعْبُرَهَا فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اعْبُرْهَا. قَالَ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَالْإِسْلَامُ وَأَمَّا الَّذِي يَنْطُفُ مِنَ الْعَسَلِ وَالسَّمْنِ فَالْقُرْآنُ حَلَاوَتُهُ تَنْطُفُ فَالْمُسْتَكْثِرُ مِنَ الْقُرْآنِ وَالْمُسْتَقِلُّ وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ فَالْحَقُّ الَّذِي أَنْتَ عَلَيْهِ تَأْخُذُ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللّٰهُ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُهُ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ ثُمَّ يُوَصَّلُ لَهُ فَيَعْلُو بِهِ فَأَخْبِرْنِي يَا رَسُولَ اللّٰهِ بِأَبِي أَنْتَ أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا. قَالَ: فَوَاللّٰهِ يَا رَسُولَ اللّٰهِ لَتُحَدِّثَنِّي بِالَّذِي أَخْطَأْتُ قَالَ لَا تُقْسِمْ. (الحديث ٧٠٤٦)[٢٠٩١]:

ئیبنو عەبباس –ڕەزای خودا لەخۆی و لەبابی- فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمەر -دروودی لەسەر- گوتی: ئەی پێغەمەری خودا! ئەمشەو لەخەوما پەڵەیەك هەورم دیت، ڕۆن و هەنگوینی لێ دەچۆڕایەوە، دیشم کەئەو خەڵکە بەهەردوو لەپ لێیان دەگرتەوە، هەبوو زۆرو هەبوو کەمی گرتبۆوە! وەدیشم کەمەندێ لەئاسمانەوە شۆڕبۆتەوەو گەیشتۆتە سەرزەوی، وەتۆم دی، ئەو کەمەندەت گرتبوو سەرکەوتیت، لەپاش تۆ پیاوێکی تر گرتی و ئەویش سەرکەوت، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش هەروا، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش گرتی، بەڵام کەمەندەکە لە دەستی دا پسا! هەتا بەستیانەوە بەیەکەوە بۆی و ئەویش سەرکوت. ئەبوبەکریش – ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: ئەی پێغەمەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ، بەخودا دەبێ لێم گەڕێیت من ئەو خەوە لێك دەدەمەوە، فەرمووی: (باشە خەوپەرژینی بکە). ئەبو بەکریش فەرمووی: پەڵە هەورەکە کەپرو ساباتی ئیسلامە ئەو ڕۆن و هەنگوینەیش کەدە چۆڕایەوە، ئەوە شیرینی و نەرمو ناسکی ی قورئانە،ئەوەیش کەخەڵك بەهەردوو دەست لێیان دەگرتەوە ئەوەیە کەهەندێ کەس زۆر لەقورئان

---

[٢٠٩١] أخرجه مسلم في الرؤيا، باب: في تأويل الرؤيا، رقم/٢٢٦٩.

وەردەگرن‌و هەندێ کەس کەم، ئەو کەمەندەش کە لەئاسمانەوە گەیشتبوە سەرزەوی ئەو هەق‌و ڕاست‌و دروستیە یە کەتۆی لەسەریت، ڕێگەی هەق‌و ڕاستی ئیسلامە، هەر لەسەری دەڕۆیت‌و هەرخودا پلەو پایەت، جار لەگەڵ جاردا، بڵند ترت دەکا. لەپاش تۆش پیاوێ ڕێگەی ڕاستی تۆ دەگرێت‌و پێی بڵند دەبێتەوە، پیاوێکی تریش دوای ئەو هەروەها، لەپاشا پیاوێکی تریش ئەو کەمەندە دەگرێ‌و لەسەری دەڕوا، بەلاّم لەدەستیدا دەپچڕێ‌و بۆی دەبەستنەوە بەیەکەوە، جا ئەویش پێی بەرز دەبێتەوە!، جا ئەی پێغەمەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ، پێم بفەرموو ئایا پێکاومە یابەهەڵەدا چووم؟ فەرمووی: (هەندێکیت پێکاوەو هەندێکیت هەڵە کردووە) جا گوتی: دەسا بەخودا ئەی پێغەمەوری خودا! دەبێ پێم بفەرموویت کە کامەیم بەهەڵە خەو پەورژێن کردووە، فەرمووی: (سوێن مەخۆ پێت ناڵێم. (تاجی کوردی/٨ ل/٢٠ ز/٦ ژ-٤-ش/د/ت- باسی: ئەو خەونانەی کەپێغەمەر -درودی خوای لەسەر- خۆی خەوپەرژینی کردوون).

## پایانێ = خاتمة

**یەکەم**: مامۆستای عەسقەلانی -ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ- دەفەرموێ: نامەی خەو پەرژێن (تەعبیر) نەوەدو نۆ فەرموودەی بەرزەوە بووی لەخۆ گرتووە، هەشتاو دوویان پەیوەست (موصول)ن، ئەوانی تریان بێڕشتەو موتابە عاتن، حەفتاو پێنجیان دووبارەن، پوختەکەیان (٩٩ — ٧٥ = ٢٤) بیست‌و چوار فەرموودەن، موسلیمیش ئەم پوختەیەی گێڕاوەتەوە بێجگە لە مانەیان:

١. ژمارە/٢٠٨٢ تەجرید = ٦٩٨٥ فەتح = فەرمودەی ئەبو سەعید: (إذا رای احدکم الرؤیا یحبها..).

٢. فەرموودەی ژمارە/٦٩٨٦ فەتحولباری - فەرموودەی ئەبو قەتادە: (الرؤيا الصالحة جزء من ستة واربعين).

٣. ژمارە/٢٠٨٩ تەجرید - ٧٠٤٢ فەتحولباری - فەرموودەی ئیبنو عەباس: (من تحلم، ومن استمع، ومن صور).

٤. فەرموودەی ئیبنو عومەر:(من أفرى الفرى ان يرى..) - ٢٠٩٠ تەجرید - ٧٠٤٣ فەتحولباری. هەروا دەفەرموێ: دەبیستراو (أثر)ی صەحابەو تابعینیشی واتیادا. خوا بۆ خۆی لەهەموو شتێ باشتر دەزانێ.

**دووەم**: خەون‌و خەو بینین دیاردەیەکی ڕاست‌و دروستە، وەلق‌و پۆپی زۆری لێ دەبێتەوە، خەوی پێغەمەران هەقە، وەك خەونەکەی حەزرەتی ئیبراهیم کەلەخەویدا حەزرەتی ئیسماعیلی کردبوو بەقوربانی، وەك خەونەکەی حەزرەتی یوسف، وەك خەونەکەی عەزیزی میسر، کەگاکان یەکتری یان خوارد، وەك خەونەکانی پێغەمەر کە لەقورئان‌و سوننەتدا باس کراون. لەسوننەتیش دا کۆمەڵێ خەونی پێغەمەران‌و پیاو چاکان تۆمار کراوە، لەبەر ئەوە هەرکەسێ باوەڕی بەخەون نەبێ، باوەڕی بەقورئان‌وسوننەتی راست‌و دروستی پێغەمەر نییە لەبەر ئەوە دادەنرێ بەناموسوڵمان. لێرەدا بۆ سوودی گشتی کۆمەڵێ زانیاری بەسوودو ڕاست‌و دروست لەبابەت خەونەوە دەنووسین، لە خوا داوا دەکەم کەبیکا بەنووری چاوی ئەو کەسانە کەپابەند دەبن بەم ڕێنماییانەوە. ئامین:

١. باشترین خەون خەونی موسوڵمانی باشە، کەم وادەبێ کەخەونی موسوڵمانی باش، ڕاست دەرنەچێ، جیاوازی لەنێوانی ژن‌و پیاودا لەم لایەنەوە نییە.

٢. جارو بار خەوی پیاو خراپ‌و ناموسوڵمانیش ڕاست دەردەچێ، وەك دوو هاوڕێکەی یوسف لەبەندیخانەکەدا.

٣. باشترین کات بۆ خەونی ڕاستو دروست کاتی بەرەبەیانە.

٤. مامۆستای عەسقەلانی دەفەرموێ: (ذیکری پیاو لەم فەرموودانەدا بۆ تەغلیبە، مەفهومی نییە، چونکە ژنی باشیش لەم لایەنەوە ڕێك وەك پیاوی باشە، خەونەکەی وەك خەونی ئەو ڕاستو دروستە).

٥. واباشە ئەگەر کەسێ حەزبکا خەونی باش ببینێ، خۆی بۆ ئامادەبکا، وەك حەلاڵ خواردنو خۆپاراستن لەحەرامو بێ شەرعیو بەردەوام بوون لەسەر دەسنوێژو لەپێش خەوتن دا زیکرو یادێکی زۆری خودا بکا، قورئان بخوێنێ، سەلاواتی زۆر لەدیداری خۆشەویست بدا. ئەگەر مەبەستێکی تایبەتی بوو، بالەپێش خەوتن دا دوورکات نوێژی استخارەش بکات.

٦. کەسێ لەخەو نپەرژێن نەزانێ دروست نییە، کەدەم لەشتی وابدا، ئەوە وەك ئەوە وایە گاڵتە بەپێغەمەرایەتی بکا. چونکە خەونو بەشێکە لەپێغەمەرایەتی.

٧. خەوون هەیە ڕێك دەقاو دەق دەردەچێ، وەك ئەوە لەخەودا کەسێ دەبینێ دەچێ بۆ حەج، وە ئەو کەسە لەو ساڵەدا دەچێ بۆ حەج، یا لەخەودا دۆستێکی دێ بۆ دێنی، وەلەکاتی دیاریکراودا دۆستەکەی دێت بۆ سەردانی. وەمن بەش بەحاڵی خۆم لەم جۆرە خەونەم دیوە. جارێ لەکەرکوك بووین، سوودی زۆرم لەتەفسیری خالۆ تەفسیری نامی وەردەگرت، شەوێ لەخەوما بایەکی سەخت هەڵی کرد، کۆمەڵێ دار خورمای گەورە هەبوون، بایەکە دەیهێنانو دەیبردن، جاری واهەبوو نووچی تەواوی پێ دەدانو هەڵ دەسانەوە، بەرە بەرە بایەکەی خست، دارخورماکان وەك جارانیان ڕاستەوە بوون، ناو بەناو خورما لەدارە خورماکان دەوەری، منیش لەگەڵ کەسانی تردا خورمام دەچنییەوەو دەمانخوارد، لەم کاتەدا شەماڵێ هەڵی کرد یەکێ لەدارخورماکانی لەڕەگو ڕیشە هەڵکەند، کارێکی سەیر بوو بە لامانەوە بەو باسەختە هەڵ نەکەندرا، کەچی بەوشەماڵە سووکەڵەیە هەڵکەنرا!!. وەك

بڵێی هەر لەخەونەکەدا هەستم کرد کەئەمە خەونە، وە هەر لەخەونەکەم دا ئەم خەونەمم ئاوا خەو نپەرژێن کرد:

(کەخورما نموونەی پیاو چاکی موسوڵمانە، من خۆم لەبەری زانستی جەنابی شێخ محمدی خاڵو شێخ عبدالکریمی بیارەم زۆر چەشتووە، بەتایبەتی لەبابەتی تەفسیردا، دیاربوو، ئەو خورما وەریوە بەری زانستە پیرۆزەکەی ئەوان بوو، ئەڵڵاهو ئەعلەم: یەکێ لەم دوو زاتە وەفات دەکەن). جا بۆ سبەینێ کاتی نوێژی عەسر لەمزگەوت باسی ئەم خەونەمو وەفاتی یەکێ لەم دوو زاتەم دەکرد بۆ نوێژ کەرەکان، لەم کاتەدا حاجی قادر ناوێ هەبوو، شوفێر بوو، پیاوێکی زۆر چاك بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، هات بۆ نوێژ گوتی: مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ ئەمڕۆ لەسلێمانی، ئەمری خودای کرد!!).

لەدوا حەجی ئەمساڵیش، حاجییەك کە باوەڕی تەواوم پێی هەیە، فەرمووی: (لەمەدینە، لەپاش تەواوکردنی مەراسیمی حەج، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریسم دی، لەچواردەرێیانێکا، بەبەرگی ئیحرامەوە ڕاوەستابووم، سەروشانی رووت بوو، پێی پەتی بوو، بەرگی ئیحرامەکەی سەوز بوو، سەرو ڕیشی ماش‌و برنج بوو، حاجیەکان بەرودوا لەهەموولایەکەوە دەهاتن، تەوقەو بەخێرهاتن و خوا حافیزی لێ دەکردن، کەلەدوو پیاوەکەی کەلەگەڵی دابوون پرسیارم کرد: ئەمە چییە، گوتیان: (ئەمساڵ مامۆستا مەلا عەبدولکەریم، لەلایەنی پێغەمەرەوە، کراوە بەنوێنەر، بۆ ئیستقبال‌و تەودیعی حاجیانی ئەمساڵ). والله علی صدق ما نقول شهید.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٩٤- نامەی ئاژاوەو فەرتەنەکان
## كتاب الفتن

نامـەی فەرتەنـەو ئاژاوەکـان لـەتاجول ئوصـول دا وا لـە بـەرگی دمیـەم دا، لاپەڕە/٢٠٥ زنجیرە/٨٧ هەتا لاپەڕە/٢٧٢ زنجیرە/١٠٤.

٢٠٩٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: من كرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا فَلْيَصْبِرْ فَإِنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنْ السُّلْطَانِ شِبْرًا مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً. (الحديث ٧٠٥٣ طرفاه في: ٧٠٥٤، ٧١٤٣)[٢٠٩٢]:

ئیبنـو عـەباس -رەزای خـودا لـەخۆیو بـاوکی- دەفـەرموێ: پێغەمـەر - دروودی لەسـەر- دەفـەرموێ: (ئەگـەر کەسـێ شـتێکی دی لەفەرمانڕەواکـەی، ومئەو شتەی بەدڵ نەبوو، پێ ی ناخۆش بوو، ئەوە بائەوە نەکا بە مەهانە بۆ هـەڵکردنی بەیـداخی یـاخێتیو لەفەرماندەرچوونیو، ئـەوە نـەکا بـەبیانووی تێکدانی کۆمەڵەی موسوڵمانان، بەڵکوو باددان بەخۆیدا بگرێ، چونکە ئـەوەی یەك بـست لەکۆمەڵەی موسـوڵمانان جیـا ببێتـەوە، ومبمـرێ ئـەوە بـە نـەزانی دەمرێ، وەك مردنی سەردەمی نەزانی پێش ئیسلام) (تاجی کوردی/٣ ل/٢٧٩ ژ/٥ ز/١٠٥- ش- باسی: بەگوێ کردنی فەرمانڕەوا پێویستەو..).

٢٠٩٢م- و عنه في ريواية أخرى قَالَ: مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ عَلَيْهِ فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ شِبْراً فَمَاتَ إِلَّا مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً. (الحديث ٧٠٥١)[٢٠٩٢م]:

---

[٢٠٩٢] اخرجه مسلم في الإمارة، باب وجوب ملازمة جماعة المسلمين عند ظهور الفتن ..رقم/١٨٤٩.

واتەکەی لەژمارەکەی پێشەوەیدا بەتەواوی ڕابورد.

٢٠٩٣- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه قَالَ: دَعَانَا النبيّ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَايَعْنَاهُ فَقَالَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا: أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأَثَرَةٍ عَلَيْنَا وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ قَالَ إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللّٰهِ فِيهِ بُرْهَانٌ *. (الحديثان ٧٠٥٥، ٧٠٥٦)[٢٠٩٣].

عوبادەی کوڕی صامیت -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی لەسەر- لەشەوی پەیمانی عەقەبەدا، داوای لێ کردین، کەپەیمانی پێ بدەین، ئێمەیش پەیمانمان پێ دا، پێغەمەر -دروودی لەسەر- لەکاتی پەیمانپێدانەکەماندا، فەرمووی: (پەیمانو بەڵێنم پێ بدەن لەسەر ئەوە: کەهەمیشە گوێڕایەڵو فەرمانبەری خوداو پێغەمەری خودابن، لەخۆشیو ناخۆشیدا، لەکاتی ئاسوودەییو تەنگانەدا، تەنانەت ئەگەر فەرمانڕەواکانیشمان خۆمانە خۆمانەمان لەگەڵ بکەنو نازی ئەمو ئەو بدەن بەسەر ئێمەدا، ئێمە ئەوە نەکەین بەمەهانەو لەفەرمانیان دەرنەچین)وە لەسەر ئەوەیش پەیمانمان لەگەڵیدا بەست:(کەگەڕو گێچەڵو تەشقەڵە بەوکەسانە نەکەین کەبوون بەسەرەوکارو کاربەدەستو بەرپرسو فەرمانڕەوای موسوڵمانان، مەگەر لەکاتێکا کەبەتەواوی شوولی لێ هەڵ بکێشنو لەڕێ دورچنو کاربگاتە ئەوە کوفرێکی پەتیو بێ باوەڕییەکی ئاشکرایان بەچاوی خۆتان لێ ببینن، کەببێ بە بەلگەیەکی ڕۆشنو بەهانەیەکی ڕەوا بۆتان لەلای خودا، ئەوجا هەقتان هەیە بەزەبری شیرو تیر، بایان پێ بدەنەوە بۆ سەر شەقامە ڕێگەی ئیسلام). (تاجی کوردی/١ ل/٤٧/ ز/٨ ژ/١+٢+٣ - باسی پەیمان بەستنو بەیعەت وەرگرتن).

---

[٢٠٩٢]م لاحظ ماجاء في رقم ٢٠٩٢ السابق عليه. -المترجم

[٢٠٩٣] أخرجه مسلم في الإمارة، وجوب طاعة الأمراء في غير معصية ..، رقم/١٧٠٩.

٢٠٩٤- عن ابْنُ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قال: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مِنْ شِرَارِ النَّاسِ مَنْ تُدْرِكُهُمُ السَّاعَةُ وَهُمْ أَحْيَاءٌ. (الحديث ٧٠٦٧)[٢٠٩٤]:

ئیبنو مەسعوود -ڕەزای خودای لیّ بیّ- فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمەر- دروودی لەسەر- دەیفەرموو:(قیامەت کاتیّ هەلّ دەستیّ، تەنیا کۆمەلاّنی خەلّکی بەدکار بەسەر زیندوون و لەناو ولاّتا دەژین).

٢٠٩٥- عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَدِيٍّ رحمه الله تعالى قَالَ: أَتَيْنَا أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ مَا نَلْقَى مِنَ الْحَجَّاجِ، فَقَالَ: اصْبِرُوا، فَإِنَّهُ لَا يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ إِلَّا الَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ، حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ سَمِعْتُهُ مِنْ نَبِيِّكُمْ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ٧٠٦٨)[٢٠٩٥]:

زوبەیری کوڕی عەدی -ڕەحەتی خودای گەورەی لیّ بیّ- فەرمووی: چووین بۆ خزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیك- ڕەزای خودای لیّ بیّ- لەخزمەتیدا سکالاّمان لەدەستی زوڵم و زۆری حەجاج کرد. فەرمووی: (ددان بگرن بەخۆتانا، بەئارام بن، چونکە ڕۆژ بەڕۆژ دنیا خراپتر دەبیّ، لەڕاستیدا زەمانە ڕۆژ بەڕۆژ خراپتر دەبیّ، وەئەم بارودۆخی بەردەوامی خراپبوونی دنیایە هەروا دەبیّ هەتا لەقیامەتا دەچنەوە بەردیوانی خودا) وە ئەمەم لەپێغەمەرەکەتان بیستووە. (تاجی کوردی/١٠ ل/٢٢٥ ز/٨٩ ژ/٣/).

---

[٢٠٩٤] اخرجه مسلم في الفتن و اشراط الساعة، باب: قرب الساعة رقم/٢٩٤٩.

[٢٠٩٥] لم يوافقه مسلم على تخريج حديث انس/ اشرار الناس من تدركهم الساعة وهم احياء، فتح/١٤ ص/٦٢٥ خاتمة كتاب الفتن. -المترجم-

٢٠٩٦- عن أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النبيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلَاحِ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَحَدُكُمْ لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ. (الحديث ٧٠٧٢)[٢٠٩٦]:

ئەبو هورەیرە -رەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی لەسەر- دەفەرموێ: (ئەی موسوڵمانینە! نەبەڕاستو نەبەدرۆ، کەستان ڕووی چەك مەکەنە برای ئایینی خۆتان، چونکە دوور نییەو ڕێی تێ دەچێ کەشەیتان هەڵەیەکی پێ بکاو لە دەستی دەرچێو براکەی بپێکێو بەهۆی ئەوەوە، ڕەهەندی ناو ئاگردانی دۆزەخ ببێ). (ریاض/٤ ل/١٦٥ ز/٢٥٧ ژ/١/١٧٨٣-٢٤٨- ش- باسی: ڕێگە نەدراوە کەچەكو شتی وا ئاڕاستەی موسوڵمان بکرێ، ئیتر بەڕاست بێ یابەسوعبەت..).

٢٠٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: سَتَكُونُ فِتَنٌ، الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي مَنْ تَشَرَّفَ لَهَا تَسْتَشْرِفْهُ فَمَنْ وَجَدَ فِيهَا مَلْجَأً أَوْ مَعَاذًا فَلْيَعُذْ بِهِ. (الحديث ٧٠٨٢)[٢٠٩٧]:

دیسان ئەبو هورەیرە -رەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -دروودی لەسەر- فەرمووی: (ئاشووبو ئاژاوەو فەرتەنە گەلێ دەقەومێن، هەتا لێیان دووربیو دووریان لێ بگری کەمە، ئەوەی بچێ بەپیریانەوە دێن بەپیریەوەو بەرۆکی پێ دەگرن! دانیشتوو تیایانا لەڕاوەستاو تیایانا باشترە، ڕاوەستاو تیایانا لەڕۆیشتوو باشترە، ڕۆیشتوو تیایانا لەڕاکردوو باشترە. واتە: هەتا

---

[٢٠٩٦] اخرجه مسلم في البر و الصلة و الآداب، باب/النهي عن الإشارة بالسلاح الى مسلم، رقم/٢٦١٧.

[٢٠٩٧] اخرجه مسلم في الفتن و اشراط الساعة، باب: نزول الفتن كمواقع القطر، رقم/٢٨٨٦.

کەمتر بەشداری لەو ئاژاوانەدا بکەی باشترە. دەی هەرکەسێ لەو دەمەدا پەناو پاسارێکی دەست کەوت، باپەنای بۆ بەرێو خۆی لەوێ قایم بکاو خۆی قوتار بکا). (تاج/١٠ ل/٢٠٨ ز/٨٧ ژ/٦ - ش/د/ت- باسی ترساندن لەئاژاوەکان).

٢٠٩٨- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ رضي الله عنه أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى الْحَجَّاجِ فَقَالَ يَا ابْنَ الْأَكْوَعِ ارْتَدَدْتَ عَلَى عَقِبَيْكَ تَعَرَّبْتَ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَذِنَ لِي فِي الْبَدْوِ. (الحديث ٧٠٨٨)[2098]:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع -ڕەزای خودای لێ بێ- ڕۆیشت بۆ لای حەجاج، پێی گوت: ئەی کوڕیئەکوەع! لەئیسلامو کۆچ کردن بۆ مەدینە پاش گەز بوویتەتەوەو ئەوەتا بوویتەوە بە ئەعرابو لەناو بەدوەکانا لەسارا نیشتەجێ بووی! سەلەمە فەرمووی: (نا من نەلەئیسلام پاشگەز بوومەتەوەو نەلەکۆچکردن پەشیمان بوومەتەوە، بەڵام من کاتی خۆی پێغەمەر -درودی لەسەر- ڕێگەی ئەوەی پێ داوم کەلەدەشت نیشتەجێ بم).

٢٠٩٩- عَنْ إبن عُمَرَ رضي الله عنهما قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا أنزل الله بقومٍ عذاباً، أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى نِيَّاتِهِمْ. (الحديث ٧١٠٨)[2099]:

ئیبنو عومەر -ڕەزای خودا لەخۆیو بابی- فەرمووی: پێغەمەر -درودی لەسەر- فەرمووی: (کاتێ خودا سزا دەنێرێ بۆ هۆزێ، سزا کە تەڕو وشکو پاکو پیسیان دەگرێتەوە، بەڵام لەپاشا لەڕۆژی قیامەتا هەرکەسەیان لەسەر نیازی خۆی زیندوو دەکرێتەوە، چاکیان بەچاک پاداشتی دەدرێتەوەو

---

[2098] اخرجه مسلم في الإمارة، باب: تحريم رجوع المهاجر الى إستيطان وطنه، رقم/١٨٦٢.

[2099] اخرجه مسلم في الجنة و صفة نعيمها، باب/الأمر بحسن الظن بالله تعالى ...رقم/٢٨٧٩.

خراپییان بەخراپ). (تاجی کوردی/٢ ل/٢٧٥ ز/١٣٧ ژ/١ - ش/د/ت/ن- باسی لەشکرێ شالاو دێنن بۆ سەرکابە، وەلەڕێ ڕۆدەچن بەناخی زەویدا).

٢١٠٠- عَنْ حُذَيْفَةَ بن اليمان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ إِنَّمَا كَانَ النِّفَاقُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَّا الْيَوْمَ فَإِنَّمَا هُوَ الْكُفْرُ بَعْدَ الْإِيمَانِ. (الحديث ٧١١٤)[2100]:

حوزەیفەی کوڕی یەمان -ڕەزای خودای لێ بێ- دەفەرموێ: (دوو ڕوویی‌و ناپاکی‌و بەدەم موسوڵمانبی‌و بەدڵ ناموسوڵمان ئەوە تایبەت بوو بەسەردەمی پێغەمەرەوە، بەلام ئێستا مرۆڤ یان موسوڵمانی ساغە، یان ناموسوڵمانەو موسوڵمان بووەو بووە بەکافر).

٢١٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ تُضِيءُ أَعْنَاقَ الْإِبِلِ بِبُصْرَى. (الحديث ٧١١٨)[2101]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر- دروودی لەسەر- فەرمووی:(قیامەت هەڵناسێ هەتا ئاگرێ لەخاکی حیجاز دەردەچێ، گەردنی وشتر لەشاری بوصرا ڕووناك دەكاتەوە. بوصرا شاری حۆرانە، والەشام سێ ڕۆژە ڕێ لەدیمەشقەوە دوورە). (تاجی کوردی/١٠ ل/٢٧٦ ز/١٠٥ ژ/٤-ش/ت باسی نیشانەی داهاتنی قیامەت).

٢١٠٢- وعَنْهُ رضي الله عنه قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ فَمَنْ حَضَرَهُ فَلَا يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا. (الحديث ٧١١٩)[2102]:

---

[2100] لم يوافقه مسلم على إخراجه، راجع خاتمة هذا الكتاب، رقم/٥. -المترجم-

[2101] اخرجه مسلم في الفتن و اشراط الساعة، باب: لاتقوم الساعة حتى تخرج نار...رقم/٢٩٠٢.

دیسان فەرمووی: پێغەمەر -دروودی لەسەر- فەرمووی: (هاکا گەنجێ لەژێڕ لەبن رووباری فوراتەوە دەرکەوت، هەرکەسێ پیادا گەیشتو لەو سەردەمەدا بوو، باهیچی لێ نەباو هیچی لێ هەڵ نەگرێ). (تاجی کوردی /١٠ ل/٢٧٨ ز/١٠٥ ژ/٧ - ش/د/ت).

٢١٠٣- و عنه رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ يَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ دَعْوَتُهُمَا وَاحِدَةٌ وَحَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلَاثِينَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ وَحَتَّى يُقْبَضَ الْعِلْمُ وَتَكْثُرَ الزَّلَازِلُ وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ وَهُوَ الْقَتْلُ وَحَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمْ الْمَالُ فَيَفِيضَ حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ الْمَالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ وَحَتَّى يَعْرِضَهُ عَلَيْهِ فَيَقُولَ الَّذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ: لَا أَرَبَ لِي بِهِ وَحَتَّى يَتَطَاوَلَ النَّاسُ فِي الْبُنْيَانِ وَحَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ وَحَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ يَعْنِي آمَنُوا أَجْمَعُونَ فَذَلِكَ حِينَ ( لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا ) وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلَانِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا فَلَا يَتَبَايَعَانِهِ وَلَا يَطْوِيَانِهِ وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ فَلَا يَطْعَمُهُ وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَهُوَ يُلِيطُ حَوْضَهُ فَلَا يَسْقِي فِيهِ وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ فَلَا يَطْعَمُهَا. (الحديث ٧١٢١)[٢١٠٣].

دیسان ئەبوهوریرە -رەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: حەزرەت -درووودو سلاّوو پیتو فەرو میهرەبانی خودای گەورەی لەسەر بێو، سەروماڵو رۆحو هەستو نەست گشتی، بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ- فەرمووی:

---

[٢١٠٢] اخرجه مسلم في الفتن و أشراط الساعة، باب: لاتقوم الساعة حتى يحسر الفرات.... رقم/٢٨٩٤.

[٢١٠٣] اخرجه مسلم في الفتن و اشراط الساعة، باب: إذا توجه المسلمان بسيفيهما و باب/لاتقوم الساعة حتى يمر الرجل...رقم/١٥٧.

قیامەت هەڵناسێ هەتا دوو بەرەی زۆر گەورە دەچن بەگژ یەکا، کوشتارێکی فرە گەورەو زۆر سامناك لەنێوانیاندا روو دەدا، داوای هەردوو لاشیان هەریەك داوایە، وەهەتا نزیکەی سیی پێغەمەرە درۆزنەی جادووگەری لاسدەری هەلاتبازی فریودەر پەیدا دەبن، کەهەموویان بەدرۆ خۆیان بەپێغەمەری خودا دەزانن و لافی پێغەمەرایەتی لێ دەدەن، وەهەتا بەرەبەرە زانا ئایینی یەکان دەمرن‌و بەنەمانی ئەوان عیلم‌و زانین هەڵ دەگیرێ‌و شوێنەواری کوێر دەبێتەوەو نامێنێ، وەبوومە لەرزەیش زۆر دەبێ، وەکات‌و وەخت بەری کورت دەبێ (چونکە پیت‌و فەڕ نامێنێ، خراپە پەرە دەستێنێ، تەمەن کورت دەبێ) وەفەرتەنەو ئاژاوە سەرهەڵ دەدەن‌و فەرتەنە لەدوا فەرتەنە بەرپادەبن، وەکو شت‌و بڕین زۆر دەبێ، وەهەتا بەشێوەیەکی وا ماڵو سامان زۆر دەبێ‌و دەبێ بەلێشاو، تەنانەت خاوەن ماڵ دەکەوێتە مشووری ئەوەوە کەیەکێ بدۆزرێتەوە خێرو زەکاتی لێ وەربگرێ! بگرە وارێ دەکەوێ خاوەن ماڵ ماڵەکەی پێشکەشی کەسێ دەکا کەچی دەڵێ نامەوێ‌و هیچکارم پێ‌ێ نییە، وەهەتاوای لێ دێ مەردوم خانوبەرەو کۆشك‌و تەلاری لێ ڕادەکێشن‌و فیزو دەعیەی پێوە دەکەن، وەهەتا وای لێ دێ پیاو دەدا بەلای گۆڕی پیاوداو دەڵێ: خۆزگەم بەخۆی کەلەکێشەو بەرەی دنیا ڕزگاری بوو، وەهەتا ڕۆژ دەگەڕێتەوەو خۆرلەخۆر ئاواوە هەڵ دێ! جا کە خۆر لەوێوە هەڵهات‌و خەڵك بەچاوی خۆیان دییان، ئەو حەلە هەموو بەناچاری ئیمان‌و باوەڕ دەهێنن، بەلام تازە چ سوود، چونکە ئەوە ئەو ڕۆژەیە کەئیمان‌و باوەڕهێنان تیادا قەهری یە، اختیاری نییە، لەبەرئەوە ئیمان‌و باوەڕهێنان تیا هیچ سوودێ نابەخشێ، ئەگەر لەوەپێش ئیمانی نەبووبێ، وەك لەم ئایەتەدا باسی ئەو کاتە دەکاو دەفەرموێ: يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ. سورة الأنعام -٦/١٥٨).

قیامـەت لـەپڕو لـەناکاو ڕوودەدا، هەیـە دوو پیـاو کـەل‌و پـەل‌و تۆپـە کووتاڵیـان بلاوکردۆتەوەلەبـەینی خۆیانـا، هـەتا سـەودای بکـەن، بـەلام فریـای ئەوە ناکەون کەسەودایەکەی ببڕنەوە، یان دیسان بیپێچنەوە کوتو پڕ قیامەت هەڵ دەستێ، هەیە پیـاو شـیری وشـترەکەی دەدۆشـێ‌و دەیباتـەوە بـەلام فریـای ئـەوە ناکـەوێ کەبیخواتـەوە لـەو ماوەیـەدا قیامـەت هـەڵ دەسـتێ، هەیـە ئەستێڵەکەی قوڕ دەداو بـەری ئەسـتێڵەکەی دەگـرێ هـەتا پـڕ بـێ لـەئاو، وەلێ فریای ئەوە ناکـەوێ کـەئاژەڵی لێ ئاوبـدا، هەیـە تێکەکـەی دەبا بۆدەمی،بـەلام فریاناکەوێ کەبیخواو قووتی بدا، قیامەت لەو وەختەدا لەپڕ هـەڵ دەسـتێ[1].

(تـاجی کـوردی/١٠ ل/٢٨١ ز/١٠٤ ژ/١٢ - ش/د/ت - باسـی: نیـشانەکانی داهـاتنی قیامەت).

# پایانیٚ = خاتمة

**یەکەم**: ماموٚستای گەورەو مەزن ئیمامی عەسقەلانی -رەحمەتی خودای لیٚ بیٚ- لیٚرەدا لەم پایانەدا، وەك دەستووری خوٚی، دەفەرمویٚ: نامەی ئاژاوەو فەرتەنەکان سەدو یەك فەرموودەی بەرزەوە کراوی هەتا سەر پیٚغەمەر واتیادا، هەشتاو حەوتیان موصول و پەیوەستن، ئەوانی تریان- کەچواردە فەرموودەن بیٚرِشتەو هەلٚسپیٚراو و موتابەعاتن- هەشتایان دووبارەن، پوختەکەیان (١٠١-٨٠=٢١) بیستو یەك فەرموودەن، پیٚشەوا موسلیمیش وەك پیٚشەوا بەخاری ئەم پوختەیەی لەصەحیحی موسلیم دا، بەرِشتەو دەقی خوٚی، لەموسنەدی ئەم زاتانەی ئیمامی بوخاری تەخریجی فەرموودەکانی ئەوانی کردووە لەصەحیحی بەخاریدا، ئەویش ئەم پوختەیەی دەرهیٚناوە لەموسنەدی ئەو زاتانە، لەصەحیحی موسلیم دا -رەزاو رەحمەتی خوا لەهەردوکیان بیٚ-، بیٚجگە لەم چەند فەرموودەیەیان:

١. ژمارە/٢٠٩٤ تەجرید = ٧٠٦٧فەتحولباری - فەرموودەی ئیبنو مەسعوود: (شرار الناس من تدركهم الساعة وهم أحياء...) (لاحظ ماجاء في الهامش من تخريج مسلم لة برقم:٢٩٤٩. - المترجم-

٢. ژمارە/٢٠٩٥تەجرید =٧٠٦٨ فەتحولباری = فەرمودەی ئەنەس: (لاياتي زمان إلا والذى بعده شر منة).

٣. الحديث ٧١٠٢ و٧١٠٣ و٧١٠٤ فەتحولباری - حديث عمار و ابن مسعود (في قصة الجمل).

٤. ژمارە/٧١١٢ فەتحولباری = حديث أبي برزة في الإنكار على من يقاتل للدنيا).

٥. ژمارە/٢١٠٠ تەجرید = ٧١١٤ فەتحولباری - فەرموودەی حوزەیفە، لەبارەی نیفاقەوە.

٦. ژماره/ ٧١١٣ فەتحولباری - فەرموودەی حوزەیفە لەبارەی منافقیەوە.

٧. ژمـاره: ٧١٣٤ فـەتحولباری - فـەرموودەی ئەنـەس: (في المدينـة لايدخلـها الدّجال ولاالطاعون إن شاء الله).

پازده بیستراو- أثر- ی هاوەلاّنو دوا ئەوانیشی واتیادا. خوا خۆی زۆر باش دەزانیّ.

**دووەم**: یارەببی خودایە سەرمان لیّ نەشیّوینی، وەرِیّگەی ڕاستمان نیشان بـدەی، وەبـەهۆی نـەفامیو سەرلیّشیّواویی هەنـدیّ لایەنـەوە، گـەلی کـوردی ستەمدیدە تووشـی ئاشـووبو فەرتەنـەو ئاژاوەی نـویّ نەکـەی وە نـەبین بـەو هۆزانە، کەخوا لەبارەیانەوە دەفـەرمویّ: ﴿وَاتَّقُوا فِتْنَـةً لاتُـصِيبَنَّ الَّـذِينَ ظَلَمُـوا مِنكُمْ خَاصَّةً﴾.

جیّگـەی داخـە، کەئیّمـەی گـەلی کـورد، بەتایبـەتی لـەعیّراقی بـەعـث دا، لەسیّبەری عوروبـەو عونـصوریيەتدا، حالّمـان لەکۆیلـە زۆر خـراپتر بـوو، ژیّـر دەستەو ژیّر چەپۆکە بووین، هەتا کاسەی زۆروستەم پڕ بـوو، وەخـوای گـەورە بەمیهرەبانی خۆی دەرووی رەحمەتی لیّ کردینەوە، وەئازادیو سەربەستی پـیّ بەخشین، وەبووین بەخاوەنی ناموسو قەوارەو کیانو ولاّتی خۆمان، وەخودا دوژمنەکەمانی کرد بەپەنـدی بسات، سـەد هـەزار خوزگـەی بـەجاری جارانی ئیّمە، کەچـی هیّشتا بەتـەواوی پـڕ بەسـینگی خۆمـان هـەوای ئازادیمـان هـەلّ نەمـژی بـوو، بەدەنکـە جـۆیّی زەرِیـن، لـەباتی ئـەوەی کەبـەپیّ ی یاسـای دەستووری خودایی: ﴿لئن شكرتم لأزيـدنكم﴾ سوپاسـی خـودا بکـەینو هـەولّ بدەین کەئەم نیعمەتی سەربەستیو ئـازادی یـە، ئـەمجارەش وەك لەمـەوپیّش لەکیس نـەدەین، وەخۆمان لەناوچەکەدا لەبـەر چاوی دۆسـتو دوژمـن شـیرین بکەین، وەبیسەلمیّنین ئیّمە گەلیّکی بـاوەڕ داری خـاوەن نـاموسو حیثیـەت و رەفتاری بەرزین، دورترین گەلین لـەبیّ دینـیو بـیّ ڕەوشـتی کەچـی لـەجیاتی

ئـەوە، ئێـستا ڕاگەیانـدنی کوردسـتانی ئـازاد، شـەوو ڕۆژ، ئـاڵای دژەدینـیو زەندیقی هەڵکردووە، هەر خەریکی پەخشی بێ ڕەوشتیو گۆرانی خەلاعیو بڵاوکردنـەوەی بەربـەرەڵایی نێرومێیـە، تەنانـەت زۆریـان بـۆ قوتـابیو خوێندکارە کان هێناوە، کەفێرگەکان بکەن بەجێگەی عیشقبازیو زانکۆ بکەن بەگانکۆ، وەبۆ ئەم مەبەستە گلاوەی خۆیان، کۆمـەڵێ کۆلکە میرزاو نیمچە ئەفەنـدیو خوێنـەوارانی دەربـاری خۆیـان کـردووە بـە (پـەڕو فیـسۆرو مـەلا چلکاو خۆر!).

وەلەسـەر شاشـەو کەناڵـەکانی ڕاگەیانـدن، وەك مێکـی مـاوسو بووکەڵـە دارینە، بەردەوام قوتیان دەکەنەوەو فوویـان تـێ دەکەنوسـەرو مـڕ ڕەفو بـێ ڕێزی بەبیرو باوەڕی پیرۆزی ئایینیو رەوشـتی گـەلی کـورد دەکـەنو بـەزۆری زۆرداری دەیانەوێ ئەو خەڵکەیش وەك ئەوان زەندیقو بـەرەڵاو بـێ ڕەوشـتو بـێ نـامووسو حیـزو سـەفیلو تـڕۆو هێبـی بـن، کـورتو پوخـت مەبەسـتی سەرەکی یان ئەوەیە کەئەو خەڵکەش وەك خۆیان بـەرەڵاو لەزەتپەرست بـێو هەموو لەکینو چون یـەکین بـێ، نـەبادا خـەڵك ڕێـزدار ئـەوان بـێ ڕێـز، وەك قورئان بەدەق دەفەرموێ: ﴿ودوا لو تكفروا كما كفروا فتكونوا سـواء﴾ بـەڵێ کەناڵـەکانی ڕاگەیانـدنیان کـردووە بـەبلوێری شـەیتان لـەباتی ئـەوەی کەئـەم ڕاگەیاندنە بەهێزانە رەحمەتی خودا بڵاو بکەنەوەو ڕەفتـاری شـیرین پـەخش بکەنـەوەو نـاوی جـوان بـۆ کـوردو کوردسـتان دروسـت بکـەنو بیـانووی چەوسێنەرەوەکانی کوردو کوردستان ببڕن، کەگوایە کورد بـێ دیـنو هـۆزێکی خێڵەکیو شەڕانیو دوور لەنەریتو باوو کەلتووری جوانی ناوچەکەن، لەباتی ئەوەی کـەدەرزی مەردایـەتیو ئازایـەتیو دلێـری لـەلاو و گەنجەکانمان بـدەن، بەکوڕو کچیانەوە، هەتا کاتێ کوردستان پێویستی بەخوێنی گەشی ئاڵی ئەوان بوو، بەرخی نێر بن بۆ سەربڕینو بیچەسپێنن: شێر کە لەلانـە دەرچـوو، چ نێـر چ مـێ! لـەجیاتی ئـەوەی ڕاگەیانـدنی هـەرێم ببـێ بەمەشـخەڵ

لەناوچەکەداو ببێ بەمینبەرێکی جوان بۆ پەخشی خووی جوان‌و عادەتی شیرین‌و ژیانی پڕ لەشەرم‌و شکۆو سەربەرزی دین‌و دنیا، خەڵکی فێری نیشتمان پەروەری بکا، فێری خەبات‌و تێکۆشان‌و نەبەرد بکا، وەك هەموو ڕاگەیاندنێکی مسۆلی جیهانی پێشکەوتوو، بەتایبەتی لەناوچەکەی خۆماندا، کەچی لەجیاتی ئەوە، ڕاگەیاندنی کوردی بووە بەنوێنەری هۆلیۆدو لەپەخشی بەر بەرەلایی دا، شان لەشانی کەناڵە جنسی یەکان دەدا، کارگەیشتۆتە ئەوە، بەپێچەوانەی ڕاگەیاندنی هەموو جیهان، ڕاگەیاندنی چەواشەی کوردی، چلەی مردوو لەسەر گۆڕەکەی بەئامادەبوونی کەسوکارەکەی ناو دەنێ ئاهەنگ‌و وەك خۆیان دەڵێن: (ئاهەنگی چلەی پێشمەرگەی دێرین لەسەر گۆڕەکەی بەچەند گۆرانییەك لەلایەن فلانە گۆرانی چییەوە رازایەوە!!) من لەم جێگە پیرۆزەدا، بەنوری فیراسەی ئیمانی، لەسەر زمانی ئەو جەماوەرە ستەمدیدە بێ ئاوو نان‌و بێ کارەباو نەوت‌و غازو بەنزین‌و بێ خانەو لانەو رەشو رووتە، عەرزی ئەم ڕاگەیاندنە چەواشەیە دەکەم: (... بەڵێ دەتوانن یەك دووساڵی تریش بەم جۆرە بەنگ‌و تلیاکە، خەڵکێکی زۆر سرو چەواشە بکەن، وەسوودو بەهرە لەرق‌و غەزەبی گەلی کورد لەسەدام‌و ڕژێمەکەی وەربگرن‌و نان‌و پیازی پێوە بخۆن‌و ئەم دیاردەیە بەرهەم بهێنن‌و بۆ چەند ساڵێکی تریش بۆ خۆیان بخۆن‌و بدزن‌و گیرفان پڕکەن، تەنانەت مەلای (وُعَّاظ السَّلاَطِين) یش فەتوای ئەوەیان بۆ بدەن‌و ژنی دووەم‌و سێیەم‌و چوارەمیان لێ مارە ببڕن‌و تەلاقنامە بۆ ژنە دێرینەکانیان بنووسن، وەرێك وەك ڕژێمە داپلۆسنەرەکان، کۆمەڵێ کاسەلیس‌و چڵکاو خۆر لەخۆیان کۆبکەنەوەو، خەڵکێکی زۆریش، لەبەر دڵسافی‌و خۆشباوەڕی‌و ساویلکەیی خۆیان باوەڕیان پێ بکەن وەك گەنەی گونی گا بلکێن پێتانەوە، بەلام خەیاڵیان خاوە، هاکا قاری خوداو رق‌و تووڕەیی ملەت، دەق وەك زبڵ‌و خاشاك، خۆیان‌و بێ ڕەوشتی‌و گەندەڵی‌و زەندیقی کەیانیان تووڕ دایە ناو زبڵدانی مێژووەوە!!

ئێمە رووی دەممان لەجەماوەری گەلی کوردستانە، دەنا ئەو لەرێدەر چوانە، وشترەکەی هۆزی ثەموود، بەخۆی و بەچکەکەیەوە لەشاشەی کەناڵەکەیان دەربچێ باوەڕی پێ ناکەنو بگرە سەریشی دەبڕن، ئەمانە لەو جۆرە لەخوا دوورە بەدرەوشتانەن، ئەگەر بشتۆپنو لەقەبرو قیامەتا حسابو کتابو دۆزەخو سزابە چاوی خۆیان ببینن، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دنیا لەبێ دینی تێ هەڵ دەچنەوە! وەك قوورئان بەدەق دەفەرموێ: (ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه).

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٩٥- نامەی بڕیارەکانو خاوەن بڕیارەکان
## كتاب الأحكام

٢١٠٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَإِنِ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ. (الحديث ٧١٤٢)[2104]:

بەتەواوی رابورد لەژمارە/٣٩٠ تەجرید - ٦٩٣ فتح الباری - بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٣٨٠.

٢١٠٥ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلَى الْإِمَارَةِ وَسَتَكُونُ نَدَامَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَنِعْمَ الْمُرْضِعَةُ وَبِئْسَتِ الْفَاطِمَةُ. (الحديث ٧١٤٨)[2105]:

---

[2104] راجع رقم/٣٩٠ تجريد. -المترجم-

ئـەبو هـوریره -رەزای خـودای لێ بـێ- فـەرمووی: خۆشەویـست -درووردی خــودای لێ بــێ- دەفــەرموێ: (ئێــوه وادیــاره زۆر ســوورومجێزن لەســەر فەرمانڕەوایی‌و کار بەدەستی، وەلحالٚ ئـەم کـاره لـەڕۆژی قیامـەتا، پەشیمانی لەدوایه، لەڕاستیدا فەرمانڕەوایی‌و کاربەدەستی، دایـەنی چاکه، بـەلاٚم لەشێر بڕینەوەکـەی گـەلێ ناخۆشــه) تــاجی کـوردی/٣ ل/٢٧١ ز/١٠٣ ژ/٣- باســی نەویستنی فەرمانڕەوایی و کاربەدەستی).

٢١٠٦- عن مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قال سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ اسْتَرْعَاهُ اللَّهُ رَعِيَّةً فَلَمْ يَحُطْهَا بِنَصِيحَةٍ إِلَّا لَمْ يَجِـدْ رَائِحَـةَ الْجَنَّةِ. (الحديث ٧١٥٠)[٢١٠٦]:

مـەعقیلی کوڕی یەسار -رەزای خـودای لێ بـێ- فـەرمووی: بـەگوێی خـۆم لـەزاری پیرۆزی پێغەمـەرم ژ نـەوت دەیفـەرموو: (هـەر بەنـدەیێ خـودا بیکا بەســەر گــەورەی کۆمــەلێ‌و بەباشــی‌و بەدلــسۆزی ســەرەوکاریی کاروباریــان نەکا،بێگومان کەئەو بەندەیه بـۆنی بەهەشت ناکات). (تـاجی کـورد/٣ ل/٢٨٥ ز/١٠٦ ژ/٢ - باسی ئەركی سەر شانی فەرمانڕەوا).

٢١٠٧- و عنه رَضِي اللَّهُ عَنْهُ عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَا مِنْ وَالٍ يَلِي رَعِيَّةً مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لَهُمْ إِلَّا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّـةَ. (الحـديث ٧١٥١)[٢١٠٧]:

مـەعقیلی کـوڕی یەسـار نـەخۆش بـوو، عوبەیـدوللاٚی کـوڕی زیـاد — کـه فەرمانڕەوای بەسره بوو- چوو بۆ لای، بۆ سەر خۆشی کردنـی، مـەعقیل پێـی

---

[٢١٠٥] لم يوافقه مسلم على تخريج هذا الحديث (فتح/١٥ ص١٦٧). -المترجم-

[٢١٠٦] اخرجه مسلم في الإيمان باب/استحقاق الوالي الغاش ... وفي الإمارة باب/فضيلة الإمام العادل...رقم/١٤٢.

[٢١٠٧] طريق آخر في الحديث السابق (عيني = ٢٤ عمدة القاري/٢٤ ص/٢٢٨). -المترجم-

گوت: گویٚ بگره فەرموودەیەکی پێغەمەرت بۆ بگێڕمەوە، کەخۆم لێیم بیستووە، دەیفەرموو:(هەرکار بەدەستێ ببیٚ بەگەورەی دەستەییٚ لەموسوڵمانانو کزیو ناپاکی یان لیٚ بکاو، لەسەر ئەو حاڵە دەوام بکا تادەمریٚ، ئەوە بێگومان کەخودا بەهەشتی لیٚ قەدەغە دەکا). (تاج/٣ ل/٢٨٥ ز/١٠٦ ژ/٢ - باسی: ئەرکی سەرشانی فەرمانڕەوا –ش).

مەعقیلی کوڕی یەسار -ڕەزای خودای لیٚ بیٚ- لەپێش ڕۆژی حودەیبییەدا موسوڵمان بوو، ئامادەی پەیمانی خۆشنوودی - بیعة الرضوان) بوو، فەرموودەی لەصەحیحەینو سونەنی ئەربەعەدا هەیە، لەبەصرە نیشتەجیٚ بوو، ئەم زاتانەو کەسانی تریش فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتە: عەمری کوڕی مەیمونی ئەزدیو ئەبو عوثمانی نهدیو حەسەنی بەصری، دووفەرموودەی لەبوخاریدا هەیە. لەئاخرو ئوخری جێنشێنی موعاویەدا مەرگ بووبە میوانی- ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لیٚ بیٚ.

٢١٠٨- عَنْ جندب رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: سمعت رَسُولِ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يقولَ: مَنْ سمع سمع الله به يوم القيامة، قال: وَمَنْ شَاقَّ شَقَّ اللّٰهُ عَلَيْهِ يوم القيامة. فقالوا: أوصنا. فقال: إن أول ما ينتنُ من الإنسانِ بطنهُ، فمن استطاع أن لايأكل إلا طيبا فليفعل، ومن استطاع أن لايحال بينه وبين الجنة بملءِ كَفٍّ من دمٍ أهراقهُ فليفعل. (الحديث ٧١٥٢ سبق طرفه في رقم ٢٠٢٢ تجريد = ٦٤٩٩ فتح الباري = بەرگی/٥ ل/٢٧٩)[٢١٠٨].

لێرەدا ئەم پتری یەی هەیە: (وەهەرکەسیٚ بەبیٚ پێویست کار لەموسوڵمانانو بەندەکانی خودا گران بکا، لەرۆژی قیامەتا لەتۆڵەی ئەوەدا خودا کارئاسانی بۆ ناکاو بەڵکوو کارگرانی بۆ دەکاو کاری لیٚ گران دەکا).

---

[٢١٠٨] راجع رقم/٢٠٢٢ تجريد - بەرگی/٥ ل/٢٧٩. -المترجم-

هاوڕێ یان عەرزی حەزرەت -یاعەرزی جوندوبیان- کرد: ئامۆژگاری خێرمان بفەرموو: فەرمووی: (یەکەم شت کەلەمرۆڤ لەپاش مردن، لەئەندامەکانی دەگەنێ ورگیەتی، کەواتە هەتا دەتوانن شتی حەلاڵی پاك بخۆن، نەکەن کەبەهۆی رشتنی خوێنی ناهەقەوە، باپڕبەلوێچێکیش بێ، پەردە لەنێوانی خۆتانو بەهەشتا دروست بکەن، واتە: رشتنی خوێن بەناهەق ، کەم بێ یا زۆر دەبێ بەهۆی نائومێد بوون لەبەهەشت).

٢١٠٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَا يقضين حكمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ. (الحديث ٧١٥٨)[٢١٠٩]:

ئەبو بەکرە -رەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست- دروودی لەسەر- فەرمووی:(دادوەر لەکاتی تووڕەیی دا دادپرسیو مەحکەمەی کەس نەکا). (تاج/٣ ل/٣٠٤ ز/١١٣ ژ/١ - ش/د/ت/ن-باسی دەستوورو یاسای دادوەری).

٢١١٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ و محيّصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما خرجا إِلَى خير مِنْ جَهدٍ أَصَابَهُمْ فَأَخْبِرَ مُحَيطَةُ أَنّ عبدالله قَدْ قُتِلَ وَطُرِحَ فِي فَقِيرٍ أَوْ عَيْنٍ فَأَتَى يَهُودَ وَقَالَ أَنْتُمْ وَاللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ قَالُوا وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ فَأَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ فَذَكَرَ لَهُمْ ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ فَذَهَبَ مُحَيِّصَةُ لِيَتَكَلَّمَ وَهُوَ الَّذِي كَانَ بِخَيْبَرَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمُحَيِّصَةَ كَبِّرْ كَبِّرْ يُرِيدُ السِّنَّ فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ وَإِمَّا أَنْ يُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ.(الحديث ٧١٩٢)[٢١١٠]:

---

[٢١٠٩] اخرجه مسلم في الأقضية، باب: كراهة قضاء القاضي وهو غضبان، رقم/١٧١٧.

[٢١١٠] اخرجه مسلم في القسامة و المحاربين و القصاص...باب/القسامة، رقم/١٦٦٩.

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە -ڕەزای خودای لیٚ بیٚ- فەرمووی: عەبدوللاٚی کوڕی سەهل و موحەییسەی کوڕی مەسعوود -ڕەزای خودایان لیٚ بیٚ- دەچن بۆ خەیبەر، لەبەردەست کورتی، بۆ کەسابەت...تاد. (ڕابورد لەژمارە:١٢٨٢ تەجرید= ٣١٧٣ فەتحولباری= بەرگی /٣ل-٤١٢

٢١١١- عن عبادة بن الصامت رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قال: بايعنا رسول الله صلى الله عليه وسلم على السمع و الطاعةِ ....). (الحديث ٧١٩٩ و ٧٢٠٠ سبق طرف الحديث الأول في رقم:١٨تجريد= ١٨فتح البارى= بەرگى/١ ل/٣٧ وسبق طرف الحديث الثاني في رقم:٢٠٩٣تجريد= رقم/٧٠٥٦ فتح البارى = بەرگى/٥ ل-)[٢١١١]:

٢١١٢- عن عبدالله بن عمر رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما قال: كنا إذا بايعنا رسول الله صلى الله عليه وسلم على السمع و الطاعة، يقول لنا: فيما استطعتم. (الحديث ٧٢٠٢):

عەبدوللاٚی کوڕی عومەر- ڕەزای خودایان لیٚ بیٚ- فەرمووی: جاران کاتیٚ پەیمانمان لەگەلٚ پیٚغەمەردا دەبەست، دەیفەرموو: (ئەوەندەی کە لەتواناتانا هەیە). (تاج/٣ ل/٢٧٣ ز/١٠٤ ژ/٢ - ش/د/ت/ن-باسی: پەیمان بەستن (بەیعەت) و پەیمان بردنە سەر).

٢١١٣- وعنه رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قال: قِيلَ لعمر" ألا تَسْتَخْلِفُ؟ قَالَ: إن أَسْتَخْلِفْ فَقَدِ اسْتَخْلَفَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ وَإِنْ أَتْرُكْكُمْ فَقَدْ تَرَكَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ٧٢١٨)[٢١١٣]:

دیسان ئیبنوعومەر -ڕەزای خودا لەخۆی و باوکی- فەرمووی: (کاتیٚ عومەر -ڕەزای خودای لیٚ بیٚ- پیٚکرا، عەرزیان کرد کەبۆچی جیٚنشین بۆ پاش

---

[٢١١١] اخرجه مسلم في الإمارة، باب/ وجوب طاعة الأمراء في غير معصية رقم/١٧٠٩.

[٢١١٣] اخرجه مسلم في الإمارة، باب/ الاستخلاف و تركه رقم/١٨٢١.

خۆت دیاری ناکەیت؟ فەرمووی: (خۆئەگەر جێ نشین بۆ پاش مردنی خۆم دیاری بکەم، ئەوە جێگەی خۆیەتی چونکە ئەبو بەکر کەلە من باشتر بوو، جێنشینی بۆ خۆی دانا، وەسیێتی کرد کەمن مردم عومەری کوڕی خەتاب لەجێگەی من ببێت بەخەلیفەی موسوڵمانان، وە خۆشی وابوو، خۆ ئەگەر جێنشێنیش دیاری نەکەم ، ئەوە پێغەمەر- دروودی لەسەر- کەلەمن باشترە، جێنشێنی دیاری نەکرد بۆ پاش مەرگی خۆی).

٢١١٤- عن جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ يَكُونُ اثْنَا عَشَرَ أَمِيرًا فَقَالَ كَلِمَةً لَمْ أَسْمَعْهَا فَقَالَ أَبِي إِنَّهُ قَالَ كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ. (الحديثان ٧٢٢٢/٧٢٢٣)[٢١١٤]:

جابیری کوڕی سەمووره -رەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: لە زاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست دەیفەرموو: (هەتا دوانزه جێنشین، ئایینی ئیسلام هەرزاڵو سەرکەوتوو دەبێو لەشەوقو برەودا دەبێ) ئەنجا قسەیەکی فەرموو، باش تێی نەگەیشتم، چونکە بەباشی نەم بیست، بەباوکم گوت: ئەوەفەرمووی‌چی؟ فەرمووی: (هەموویان لەهۆزی قورەیش دەبن) (تاجی کوردی/٣ ل/٢٦٨ ز/١٠٢ ژ/٤ - ش/ت - باسی: کێ ڕەواترین کەسە بەفەرمانڕەوایی).

---

[٢١١٤] اخرجه مسلم في الإمارة، باب/الناس تبع لقريش...رقم/١٨٢١.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٩٦- نامەی ئاواتخواستنو خۆزگە خواستن
## كتاب التمني

٢١١٥- عن أنس رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ قال: لَوْلاَ أَنِي سَمِعْتُ النبيَّ صلى الله عليه وسلم يقول: (لاتَتَمَنَّوْا المَوْتَ) لتَمَنَّيْتُ. (الحديث ٧٢٣٣ سبق طرفه في: ١٨٦٦ تجريد = ٥٦٧١ فتح الباري بەرگی/٥ ل/١٥٩):

لێرەدا ئیمامی ئەنەس- رەزای خودای لێ بێ- دەفەرموێ: لەبەرئەوەی كەبەگوێچكەی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمەرم ژ نەوتووە كە دەیفەرموو: (مەرگ بەخۆزگە مەخوازن) دەنا مەرگم بەئاوات دەخواست).

٢١١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا يَتَمَنَّى أَحَدُكُمْ الْمَوْتَ إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ يَزْدَادُ وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ يَسْتَعْتِبُ. (الحديث ٧٢٣٥):

سبق طرفه في/ ٣٧ تجريد = ٣٩ فتح الباري = بەرگی/١ ل/٥٦) واتاكەی بەتەواوی لەپێشەوە لەژمارە:/١٨٦٨ تەجرید = ٥٦٧٣ فەتحولباری = بەرگی/٥ ل/١٦٠ رابورد.

# پایانێ = خاتمة

مامۆستا عەسقەلانی دەفەرموێ: (نامەی ئەحكامو تەمەننیو ئەخباری ئاحاد، سەدو شەستو سێ فەرموودەی بەرزەوە كراویان بۆ پێغەمەر- دروودی لەسەر- واتیادا- سییو حەوتیان بێڕشتەن، یالە حوكمی معلق دان، ئەوانی تریان پەیوەستن، سەدو چلو نۆ یان دووبارەن، پوختەكەیان (١٦٣-١٤٩=١٤) چوار دەفەرموودەن، موسلیمیش ئەم پوختەیەی گێڕاوەتەوە ئەمانەیان نەبێ:

١. ژمارە:٢١٠٤تەجرید = ٧١٤٢فەتح = (إنكم ستحرصون).
٢. حديث ابى أيوب في البطانة.
٣. حديث أبى هريرة فيالبطانة.
٤. حديث ابن عمر في بيعة عبدالملك.
٥. حديث عمر في بيعة أبي بكر الثانية.
٦. حديث أبي بكر في قصة وَفد بزاخة.

كتابی تەمەننی (٢٧) فەرموودەیە هەموویان دووبارەن هەروا خەبەری واحد (٢٢) فەرموودەن هەموو دووبارەن پەنجاو هەشت ئەپەریشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

## ٩٧- نامەی دەستگرتن بەکەمەندی نامەی خوداو کەمەندی ڕێبازو ڕەفتاری پێغەمەر- دروودی لەسەر-
## كتاب الإعتصام بالكتاب والسنة

٢١١٧ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ أَبَى قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَنْ يَأْبَى قَالَ مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى. (الحديث ٧٢٨٠)[٢١١٧]:

ئەبو هوریرە -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی : پێغەمەر -دروودی لەسەر- فەرمووی: (گەلی ئیسلامی من هەمووەچنە بەهەشت مەگەر ئەوانەی کەمل نەدەن). عەرزیان کرد: قوربان!ئەوانە کامانەن کەمل نادەن؟ فەرمووی:(هەرکەسێ بەگوێی من بکاو فەرمانی من جێ بەجێ بکا، لەبارەی کاروباری جۆراو جۆری ئایینیەوە، دەچێتە بەهەشت، وەهەرکەسێ لەمن یاخی بێو فەرمانی ئایینی ئیسلامی پیرۆز جێ بەجێ نەکا، ئەوە واتای وایە مل بەئیسلام نادا لەبەر ئەوە ناچێتە بەهەشت).

٢١١٨- عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِاللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما يَقُولُ جَاءَتْ مَلَائِكَةٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ نَائِمٌ فَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّهُ نَائِمٌ وَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ فَقَالُوا إِنَّ لِصَاحِبِكُمْ هَذَا مَثَلًا فَاضْرِبُوا لَهُ مَثَلًا فَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّهُ نَائِمٌ وَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ فَقَالُوا مَثَلُهُ كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى دَارًا وَجَعَلَ فِيهَا مَأْدُبَةً وَبَعَثَ دَاعِيًا فَمَنْ أَجَابَ الدَّاعِيَ دَخَلَ الدَّارَ وَأَكَلَ مِنَ الْمَأْدُبَةِ وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّاعِيَ لَمْ يَدْخُلِ الدَّارَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنَ الْمَأْدُبَةِ فَقَالُوا أَوِّلُوهَا لَهُ يَفْقَهْهَا فَقَالَ

---

[٢١١٧] و الحديث من افراده (عينى عمدة القاري/٢٥ ص٣٧). -المترجم-

بَعْضُهُمْ إِنَّهُ نَائِمٌ وَقَالَ بَعْضُهُمْ إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ فَقَالُوا فَالدَّارُ الْجَنَّةُ وَالدَّاعِي مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَنْ أَطَاعَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ وَمَنْ عَصَى مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَمُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرْقٌ بَيْنَ النَّاسِ. (الحديث ٧٢٨١)[٢١١٨]:

جابیری کوڕی عەبدوللا -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: جارێ پێغەمەری خۆشەویست -دروودو سەلاوات و سەلامی خودای گەورەی لەسەر بێ و باوك و دایك و ماڵ و منداڵ و هەست و نەست هەمووی بەقوربانی بێتەوە-، فریشتە دێنە دیاری، هەندێکیان دەڵێن: ئەمە نووستووە، هەندێکی تریشیان دەڵێن: بەچاو نووستووە بەڵام بەدڵ وریایە، چونکە پێغەمەران دڵیان نانوێ. جاگوتیان: ئەم برادەرەی ئێوە مەسەل و وێنەیەکی هەیە، ئەو مەسەل و وێنەیەی خۆیی بۆ ڕوون بکەنەوە. هەندێکیان گوتیانەوە: ئاخر خەوتووە، هەندێکی تریشیان گوتیانەوە: بەچاو نووستووە، بەڵام بەدڵ وورریایە. ئینجا فەرموویان: مەسەل و وێنەی ئەم پیاوە وەك پیاوێ وایە، کەوا خانوویێ دروست بکاو شایی یەکی بۆ بکاو بانگکەر بنێرێ کەخەڵك خوڵك بکا بۆ سەرشایی، ئیتر ئەوەی بەدەنگی بانگکارەکەوە بچێت دەچێتە ناو خانووەکەوەو لەنانی شاییەکە دەخوات، ئەوەشی نەچێ بەدەنگی بانگکەرەکەوە نەدەچێتە ناو خانووەکەوەو نە لەنانی شاییەکەیش دەخوا. ئەنجا فریشتەکان فەرموویان: ئادەی ئەم مەسەل و سەرگورشتەی بۆ لێك بدەنەوە باباش تێ ی بگات، جادیسان هەندێکیان فەرموویان: ئاخر خەوتووە، وەهەندێکی تریشیان فەرموویان: چاو خەوتووەن دڵ خەبەردارە! ئینجا فەرموویان: خانووەکە بەهەشتە، بانگکەرەکەش موحەمەدە- دروودی خودای لێ بێ- ئیتر ئەوەی فەرمانی موحەمەد لەگوێ بگری لەڕاستیدا فەرمانی خودا لەگوێ دەگرێ، وەئەوەی لەموحەمەد یاخی بێ لەفەرمانی خودا دەردەچێ،

---

[٢١١٨] قال في التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول رواه البخاري. -المترجم-

ئەوە بەڕاستی لەخودا یاخی دەبیٚو لەفەرمانی خودا دەردەچیٚ. وەموحەمەد- دروودی خودای لیٚ بیٚ- پاك وپیسی ئەو خەڵكە لەیەك جویٚ دەكاتەوە. چونكە ئەوەی پەیڕەوی ئەوە، ئەوە پەیڕەوی فەرمانی خودایە، وە ئەوەی لەدژی ئەوە، ئەوە لەحیزبو پارتی شەیتانە). (تاج/١ ل/٥٤ ز/٩ ژ/٨- باسی ڕەفتاركردن بەقورئانو بەسوننەتی پیٚغەمەر -دروودی خودای لیٚ بیٚ-).

٢١١٩- عَنْ أنس بن مالك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لن يبرح النَّاسُ يَتَسَاءَلُونَ حَتَّى يقول: هَذَا خَلَقَ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شيءٍ فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ. (الحديث ٧٢٩٦)[٢١١٩]:

ئەنەسی كوڕی مالیك -ڕەزای خودای لیٚ بیٚ- فەرموودەی: خۆشەویست -دروودی لەسەر- فەرمووی: (ئەو خەڵكە هەر بەرمبەرە پرسیار لەدوا پرسیار لەم شتو لەوشت دەكەن) تابەرمبەرە سەردەكیٚشیٚ بۆ ئەوە دەڵیٚن: باشە ئەوا خودا ئەم خەڵكو جیهانو بوونەوەرەی هەموو دروست كردووەو هەمووشتیٚ ئەو دروستكاریەتی، ئەی كیٚ خودای دروست كردووە؟) (تاج/١ ل/٢٨ ژ/٣+٤+٥ - ش).

٢١٢٠- عَنْ عبدالله بن عمرو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ اللَّهَ لَا يَنْزِعُ الْعِلْمَ بَعْدَ أَنْ أَعْطَاكُمُوهُ انْتِزَاعًا وَلَكِنْ يَنْتَزِعُهُ مِنْهُمْ مَعَ قَبْضِ الْعُلَمَاءِ بِعِلْمِهِمْ فَيَبْقَى نَاسٌ جُهَّالٌ يُسْتَفْتَوْنَ فَيُفْتُونَ بِرَأْيِهِمْ فَيُضِلُّونَ وَيَضِلُّونَ. (الحديث ٧٣٠٧- سبق في رقم/٨٥ تجريد = ١٠٠ فتح الباري = بەرگی/١ ل/١٠٧) لەویٚ بەتەواوی رابورد)[٢١٢٠]:

---

[٢١١٩] اخرجه مسلم في الإيمان، باب/بيان الوسوسة في الأيمان و مايقوله من وجدها....رقم/١٣٦.

[٢١٢٠] اخرجه مسلم في العلم، باب/رفع العلم و قبضة رقم/٢٦٧٣.

٢١٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَأْخُذَ أُمَّتِي بِأَخْذِ الْقُرُونِ قَبْلَهَا شِبْرًا بِشِبْرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَفَارِسَ وَالرُّومِ فَقَالَ وَمَنِ النَّاسُ إِلَّا أُولَئِكَ. (الحديث ٧٣٢٠- سبق طرفه من رقم/١٣٧٨ تجريد = ٣٤٥٦ فتح الباری = بەرگی/٤ ل-٦٣):

جیاوازی ئێرە ئەوەیە: دەفەرمووێ: قیامەت هەڵناسێ هەتا... تاد. وەدەفەرموێ: (مەبەست فارس و روومە..)

٢١٢٢- عن عمر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ بَعَثَ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَقِّ وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ فَكَانَ فِيمَا أُنْزِلَ آيَةُ الرَّجْمِ. (الحديث ٧٣٢٣ - سبق في رقم/١٣٧٣ تجريد - ٣٤٤٥ فتح الباري - بەرگی/٤ ل/٦٠)[٢١٢٢]:

عومەر -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: خودای گەورە حەزرەتی موحەممەدی ڕەوانە کردووە لەگەڵ دینێکی حەق و ڕاست و دروستا، وەقورئان کەنامەی خودایە ناردوویەتی بۆی، یەکێ لە ئایەتەکانی قورئان، ئایەتی ڕەجمی زانی موحصەن بوو، کەدوایی لەتیلاوەتا نەسخ بۆوە، بەلام حوکمەکەی هەرماوە) ئایەتەکەیش ئاوابوو: (الشَّيْخُ وَ الشيخة إذا زنيا فارجموهما).

٢١٢٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ. (الحديث ٧٣٥٢)[٢١٢٣]:

عەمری کوڕی عاص -ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمووی: خۆشەویست- دروودی لەسەر- فەرمووی: (دادپرس - حاکم) ئەگەر تێکۆشێ و باش ووردببێتەوە بۆ

[٢١٢٢] اخرجه مسلم من الحدود، باب: رجم الثيب في الزنا، رقم/١٦٩١.

[٢١٢٣] اخرجه مسلم في الأقضية، باب/ بيان اجر الحاكم إذا اجتهد فأصاب او اخطأ، رقم/١٧١٦.

گەیشتن بەهەق لەمەسەلەکەداو ئەنجا بڕیارەکە دەرکا، ئەوە لەم حاڵەدا، ئەگەر بڕیارەکەی ڕاست بوو ئەوە دووپاشی بۆ هەیە، بەلاّم ئەگەر لەم کاتەدا بڕیارەکەی هەڵەبوو ئەوە یەك پاداشی بۆ هەیە، چونکە ئەو بەئەرکی سەرشانی خۆی هەڵساوەو درێغی نەکردووە). (تاجی کوردی/٣ ل/٣١٢ ز/١١٨ ژ/١ - باسی تێکۆشین (إجتهاد)- ش/د/ت/ن).

روونکردنەوە:

داوەر، یاحاکم، کاتێ مافی ئەوەی هەیە، کەلەمەسەلەکەدا تێکۆشی‌و اجتهاد بکا، کەشایانی ئەوەبێ‌و بتوانی اجتهاد بکا، دەنا نەزان‌و نەتەوانا ئەگەر اجتهاد بکەن وانییە، هەروا ئەگەر دەقێکی روون هەبوو، پێویست بە إجتهاد ناکا.

٢١٢٤- عن محمد بنِ المكدرِ رحمه الله تعالى قال: رَأيتُ جابرَ بن عيدالله رَضِي اللَّهُ عَنْهُما يحلفُ بالله أنَّ ابنَ الصيادِ الدَّجَّالُ، قلتُ: تحلفُ بالله؟ قال: إنّي سمعت عمر رَضِي اللَّهُ عَنْهُ عنه يحلف على ذلك عند النبيّ صلى فلم ينكرهُ النبي صلى الله عليه وسلم. (الحديث ٧٣٥٥)[٢١٢٤].

موحەممەدی کوڕی مونکەدیر- رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ- فەرمووی: بەچاوی خۆم جابیری کوڕی عەبدوڵلاّم بینی سوێندی دەخوارد کە ئیبنو صەییاد ججاڵە، منیش عەرزیم کرد: چۆن سوێندی وا دەخۆیت؟ فەرمووی: (بەگوێی خۆم گوێم لەعومەری کوڕی خەگاب بوو لەخزمەت پێغەمەر خۆیدا، سوێندی لەسەر ئەوە خوارد کەئیبنو صەییاد جەجاڵە، کەچی پێغەمەر- دروودی لەسەر- إنکاری ئەوەی نەکرد، شتی وایش بەتەقریردائەنرێ). (بڕوانە: تاجی کوردی/١٠ ل/٢٤٧ ز/٩٦ - سەرگوزەشتەی ئیبنو صەییاد).

---

[٢١٢٤] أخرجه مسلم في الفتن و أشراط الساعة، باب/ذكر ابن الصياد، رقم/٢٩٢٩.



# پایانیٚ = خاتمة

گــەورەو ســەرومرمان ئیمــامی عەســقەلانی، لەفــەتحولباری شــەرحی صــەحیحی بوخاریــدا، لەخاتمــەی ئــەم باسانەدا لەبــەرگی/١٥ ص/٢٨٩. طبعــة جدیــدةدا دەفــەرمویٚ: نامــەی اعتــصام ســەدو بیــستو حــەوت فــەرموودەی بەرزەوە کراوی واتیادا، بیستو شەشیان تعلیقن، ئــەوانی تــر موصولن. ســەدو دەیان دووبارەن، پوختەکەیان: (١٢٧ - ١١٠ = ١٧) حەڤدە فەرموودەن. هەموویان موسلیمیش گێڕاونیەتەوە ئەمانەیان نەبیٚ:

١- ژمارە/٢١١٧ تەجرید = ٧٢٨٠ فەتح = (..إلامن أبى).

٢- حديث عمر: (نهينا عن التكلف).

٣- ژمارە/٢١٢١ تەجرید = ٧٣٠ = في مأخذ القرون.

٤- حديث عائشة في الرفق.

٥- حديث عائشة لاأذكى به.

٦- حديث عثمان في الخطبة.

٧- حديث أبي سلمة المرسَلِ في الأجتهاد.

٨- حديث المشاورة في الخروج إلى الأحد.

شازدە ئەسەریشی واتیادا.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٩٨- نامەی یەکتا پەرستی
# كتاب التوحيد

٢١٢٥- عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْها زوج النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ رَجُلًا عَلَى سَرِيَّةٍ وَكَانَ يَقْرَأُ لِأَصْحَابِهِ .....(الحديث ٧٣٧٥) (راجع: رقم/١٧٢٨ تجريد = ٥٠١٣ فتح البارى = بەرگی/٥ ل/.... )[٢١٢٥]:

٢١٢٦- عن أبي موسى الأشعري رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قال: قَالَ النبِيّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا أَحَدٌ أَصْبَرَ عَلَى أَذًى يَسْمَعُهُ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى إِنَّهُمْ يَجْعَلُونَ لَهُ نِدًّا وَيَجْعَلُونَ لَهُ وَلَدًا وَهُوَ مَعَ ذَلِكَ يَرْزُقُهُمْ وَيُعَافِيهِمْ وَيُعْطِيهِمْ *. (الحديث ٧٣٧٨ – سبق طرفه بالكامل في رقم /٩٤٧ تجريد =٦٠٩٩ فتح البارى = بەرگی/٥ ل/ )[٢١٢٦]:

٢١٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنهُما أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي أَنْتَ الْحَيُّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ يَمُوتُونَ. (الحديث ٧٣٨٤ – طرفه في: رقم/١٦٩٧ تجريد = ٤٨٤٨ فتح الباري = بەرگی/٤ ل/٤٢٩)[٢١٢٧]:

---

[٢١٢٥] اخرجه مسلم في الصلاة و قعرها، باب/فضل قراءة قل هو الله...رقم/٨١٣.

[٢١٢٦] اخرجه مسلم في صفات المنافقين، باب/لا احدا أصبرَ على أذى رقم/٢٨٠٤.

[٢١٢٧] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة...رقم/٢٧١٧.

ئیبنو عەباس -ڕەزای خوا لەخۆی و بابی- فەرمووی: خۆشەویست -دروودی لەسەر- فەرمووی: (پەنا دەگرم بەعیزەت و گەورەیی تۆ خودایە، تۆ نەمری و نامری، بەڵام جنۆکەو مرۆڤ دەمرن).

٢١٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ وَهُوَ يَكْتُبُ عَلَى نَفْسِهِ وَهُوَ مَوْضُوعٌ عِنْدَهُ على العرشِ إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي. (الحديث ٧٤٠٤ – سبق طرفه في رقم/١٢٨٩ تجريد = ٣١٩٤ فتح الباري) = بەرگی/٣ ل/٤٢١)[٢١٢٨]:

٢١٢٩- وَ عَنْهُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُ وَإِنِ اقْتَرَبَ إِلَيَّ شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا وَإِنِ اقْتَرَبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا اقْتَرَبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً). (الحديث ٧٤٠٥ طرفه في ٧٥٠٥، ٧٥٣٧)[٢١٢٩]:

ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لەسەر بێ- دیسان فەرمووی: خۆشەویست -دروودی خوای لێ بێ- فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: بەندەی من گومانی چۆن بێ بەمن، من وا دەبم لەگەڵی. لەودەمەدا کەئەو ناوی من دەباو یادی من دەکا، خۆم وام لەگەڵیدا، جا ئەگەر ئەو بەتەنیا هەرخۆی یادو زیکری من بکا، ئەوا منیش هەرخۆم بەنهێنی یادی ئەو دەکەم، ئەگەر ئەو لەناو دەستەیەکا یادو زیکری من بکا، ئەوا منیش بەئاشکرا لەناو دەستەیەکی باشتردا یادو باسی ئەو بەچاکە دەکەم، ئەگەر بەندە بستێ لەمن نزیک ببێتەوە، من باڵێ لەو نزیک دەبمەوە، ئەگەر ئەو باڵێ لەمن نزیک بێتەوە من

---

[٢١٢٨] اخرجه مسلم في التوبة، باب/في سعة رحمة الله رقم/٢٧٥١.

[٢١٢٩] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: الحث على ذكر الله تعالى.. وباب فضل الذكر و الدعاء، رقم/٢٦٧٥.

دوو باڵ لەو نزیك دەبمەوە، كاتێ ئەو بەڕۆیشتنی ئاسایی بێ بۆلای من، من بەلۆقە دەچم بەپیریەوە، واتە: تابەندە، نێربێ، یامێ، بەتاعەت خۆی لەمن نزیك بكاتەوە من بەرەحمەتی خۆم زیاتر لەو نزیك دەكەومەوە. (تاجی كوردی/٩ ل/١٣٦ ز/٥٨ ژ/١ – باسی گەورەیی یادی خوا).

٢١٣٠– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَقُولُ اللَّهُ إِذَا أَرَادَ عَبْدِي أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَلَا تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ حَتَّى يَعْمَلَهَا فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا بِمِثْلِهَا وَإِنْ تَرَكَهَا مِنْ أَجْلِي فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ. (الحديث ٧٥٠١)[٢١٣٠]:

له رياض الصالحين دا ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

(فەرمووی: لەفەرموودەیەكی قودسیدا، كە پێغەمەر -دروودی خوای لێ بێ- دەیگێڕێتەوە لەخودای گەورەو پیرۆزەوە، حەزرەت فەرمووی: خودای گەورە هەموو چاكەیەك و هەموو خراپەیەكی لە لەوحول مەحفوظ نووسیوە، و بەم شێوەیە روونی كردۆتەوە بۆ هەمووكەسێ: ئەگەر كەسێ ویستی چاكەیێ بكاو بۆی نەكرا، ئەوە خودا لەلای خۆی چاكەیەكی تەواوی بۆ دەنوسێ، وە ئەگەر كەسێ ویستی چاكەیێ بكاو لەهەمان كاتا كردی، ئەوە خودای سەردارو سەرومر لەلای خۆی لەدەچاكەوە هەتا حەوت سەد چاكە، هەتا ئەوەندەی كەخودا خۆی حەز دەكا، چاكەی بۆ دەنوسێ، وەئەگەر كەسێ ویستی خراپەیێ بكا، بەڵام نەیكرد، ئەوە خودا لەلای خۆی چاكەیەكی تەواوی بۆ دەنووسێ، وە ئەگەر كەسێ ویستی خراپەیێ بكا وە كردی، ئەوە خودا بەیەك خراپە دەینووسێ لەسەری). (ش-تاج). (ریاض/١ ل/١٦ ژ/١١/١١ ز/ باسی نیازو نیاز پاكی).

---

[٢١٣٠] اخرجه مسلم في الإيمان، باب: إذا هم العبد بحسنة كتبت...، رقم/١٣١.

٢١٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ اعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ قَالَ عَبْدُ الْأَعْلَى لَا أَدْرِي أَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ اعْمَلْ مَا شِئْتَ قَالَ أَبُو أَحْمَدَ حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ زَنْجُويَةَ الْقُرَشِيُّ الْقُشَيْرِيُّ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ النَّرْسِيُّ بِهَذَا الْإِسْنَادِ حَدَّثَنِي عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ حَدَّثَنِي أَبُو الْوَلِيدِ حَدَّثَنَا هَمَّامٌ حَدَّثَنَا إِسْحَقُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ قَالَ كَانَ بِالْمَدِينَةِ قَاصٌّ يُقَالُ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي عَمْرَةَ قَالَ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ عَبْدًا أَذْنَبَ ذَنْبًا بِمَعْنَى حَدِيثِ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ وَذَكَرَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ أَذْنَبَ ذَنْبًا وَفِي الثَّالِثَةِ قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي فَلْيَعْمَلْ مَا شَاءَ. (الحديث ٧٥٠٧)[٢١٣١]:

**ئەم فەرموودەیەش لە ریاض الصالحین دا ئاوایە:**

**ئەبو هورەیرە -رەزای خوای لەسەر بێ- فەرمووی: پێغەمەری خۆشەویست و نازدار – دروودو سڵاوو صەلاواتو ڕەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێ و سەرو ماڵو منداڵو حاڵو هەستو نەست گشتی بەقوربانی تۆزی بەرپێی دێنیکەرانی گۆڕی پیرۆزی بێ- لەفەرموودەیەکی قودسیدا، لە پەروەردگاری گەورەو سەروەری خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کەخودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: بەندەیێ گوناهێ دەکا، لەپاشا پەشیمان دەبێـەوە و دەڵـێ: خودایـە! پەشـیمانم، لـێم خـۆش بـە، خـودای پـیرۆزو گـەورەش**

---

[٢١٣١] اخرجه مسلم في التوبة، باب: قبول التوبة من الذنوب...، رقم: ٢٧٥٨.

دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من، وەك ئەم گوناهەی کردووە، هەق دەیشزانێ، کەخودایەکی وای هەیە دەتوانێ: هەم لەگوناه خۆش بێ و هەم لەسەر گوناه تۆڵە بستێنێ، دیسان ئەو بەندەیە تێ هەڵ دەچێتەوە و گوناهێکی تر دەکاتەوە دەڵێتەوە: خودایە! پەشیمانم لەگوناهم خۆش بە.دیسان خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێتەوە: ئەم بەندەیەی من، وەك ئەم گوناهەی کردووە، دەیشزانێ کە خودایەکی وای هەیە، میهرەبان‌و لێبوردەیە، دەتوانێ هەم لەگوناه خۆش بێ و هەم لەسەر گوناه تۆڵە لەگوناهکار بستێنێ، دەی ئیتر هەرچی ئارەزوو دەکا با بیکا، مادام ئەمە حاڵیەتی: گوناه دەکات‌و تەوبەی بەڕاستی لێ دەکا، واڵیی خۆش بووم –ش. (ریاض/٢ ل/١١ ژ/٤٢١/١٠ – باسی هیوا و ئومێد بەمیهرو ڕەحمەتی خودای گەورە زنجیرە/٥١).

٢١٣٢– عن أنس بن مالك رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ شُفِّعْتُ فَقُلْتُ يَا رَبِّ أَدْخِلِ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ خَرْدَلَةٌ فَيَدْخُلُونَ ثُمَّ أَقُولُ أَدْخِلِ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ أَدْنَى شَيْءٍ فَقَالَ أَنَسٌ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى أَصَابِعِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ٧٥٠٩ طرفه في: رقم/٤١ تجريد = ٤٤ فتح الباري = بەرگی یەکەم لاپەڕە/٦٣)[٢١٣٢]:

لێرەدا خۆشەویست -دروودی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: کاتێ ڕۆژی قیامەت هات، خودای گەورەو سەروەر، گوفتوگۆیەکی تایبەتی لەگەڵ پێغەمەران‌و کەسانی تریش دەکا، وە من ڕێگەم پێ دەدرێ، تکاو شەفاعەت دەکەم، وە تکام بۆ گوناهبارانیش گیرا دەبێ، منیش عەرزی پەروەردگاری خۆم دەکەم: ئەی خودایە! ئەوەی تۆسقاڵێ خێرو چاکەو باوەڕ بە تۆی لەدڵیا بێ داخڵی بەهەشتی بفەرموو، جا ئەو جۆرە کەسانە هەموو دەڕۆنە ناو بەهەشت‌و لەدۆزەخ‌و سزا ڕزگاریان دەبێ، دیسان عەرزی پەروەردگاری گەورەو سەروەر و

---

(٢١٣٢) راجع رقم/ ٤١ تجرید = بەرگی/١ ل/٦٣. —المترجم

بەلوتف و کەرەم و بەخششی خۆم دەکەمەوە: ئەوەی کەمترین باوەڕو ئیمانی بەتۆ هەبووە بیبەرە بەرسێبەری ڕەحمەتی خۆت و داخلی بەهەشتی بفەرموو، وە لەئاگری دۆزەخ بەکەرەمی خۆت رزگاری بکەو بە بەهەشتی شاد بفەرموو، وە لەئاگری دۆزەخ بەکەرەمی خۆت رزگاری بفەرموو، وە خودایش وادەکا. ئەنەس -رەزای خوای لەسەر بێ- دەیفەرموو: ئێستاش هەروا لەبەر چاوم کەچۆن چۆنی پێغەمەر -درودی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێ- بۆ روونکردنەوەی نموونەی کەمترین باوەڕو ئیمان، بەنووکی پەنجەکانی خۆی ئاماژەی بۆ ئەوەدەکرد.

٢١٣٣- عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال: حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ مَاجَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ ... (الحديث ٧٥١٠ – سبق طرفه في رقم/٤١ تجريد = ٤٤ فتح الباري = بەرگی/١ ل/٦٣)[٢١٣٣].

ئەم فەرمووده پیرۆزمیە لەم جێگەیەدا بە تێرو تەسەلی لەحەزرەتی ئەبو هورەیرەوە -رەزای خوای لەسەر بێ- رابورد. ژمارە/١٦٧٠ تەجریدی بوخاری کەناسراوە بە (مختصر صحیح البخاری) بەرگی چوارەم، لاپەڕە/٤٥٣ + تاج/١٠ ز/١٣٠ ل/٤٠٤ ژ/٨ + ژمارە/٧١١ تەجرید = بەرگی/٢ ل/١٣٤.

٢١٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ. (الحديث ٧٥٦٣ طرفه في: ٦٤٠٦) = آخر حديث من أحاديث صحيح البخاري رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ[٢١٣٤].

---

[٢١٣٣] راجع رقم/٤١ تجريد - بەرگی/١ ل/٦٣. - المترجم-

[٢١٣٤] اخرجه مسلم في الذكر و الدعاء و التوبة، باب: فضل التهليل و التسبيح و الدعاء، رقم/٢٦٩٤.

ئـەبو هـورەیرە -رەزای خـوای لێ بـێ- فـەرمووی: خۆشەویـست -درووودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: ئەم دوو ووشـەیە: (سُبْحَانَ اللّٰـهِ وَبِحَمْـدِهِ سُبْحَانَ اللّٰـهِ الْعَظِيمِ = خـودا بـەپاكو پـیرۆز دەزانم و سـوپاس و ستايـشی بـێ پايـانی دەكەم، ديسان خـودای خـۆم، يـەزدانی مـەزن، بـەپاكو پـیرۆز دەزانم و لەمـەدا هـیچ گومـانو سوو يـەكم نييـە). ئـەم دوو ووشـە پیرۆزەيـە سووكو خـۆشو ئاسانن لەسەر زمان، قورسو گرانن لەناو شايان لەكاتی كێشان، خۆشەويـستن لـەلای خـودای ميهرەبـان —ش = موسـليم و بوخـاری، رەزاو رەحمـەتی خـودای گـەورەو سـەروەريان لێ بـێ. ئـامين. (ريـاض صـالحين/٣ ل/٢٧٨ ژ/١/١٤٠٨ — ٤٦٢).

لێرەدا لەكۆتايی ئەم نامە پيرۆزەدا لە ڕەشنووسی يەكەمی ئەم تەجريـدی بوخاريـەدا، بـەدەق ئەمـەم نووسيوە، وا ئێـستا بـەبێ ئـەوەی پيتێكـی لێ كـەم بكەمـەوە وەك خـۆی دەينووسـم، خۆزگـەم بـەرێز چـاپكاريش وەك خـۆی بەهەمان إملاو إنشا نەقلّی دەكرد:

"پێـشەوای دانـاو مـەزنو گـەورە -دانـەری ئـەم نامـە پـيرۆزە- سـەروەرو مامۆسـتامان: ئەبولعـەبباس، زەينـوددين: ئەحمـەدی كوڕی ئەحمـەدی كوری عبـد اللطيفـي شـەرجی زوبەيـدی —خـوا لێـی خـۆش بـێ- ئەفـەرموێ: لـەم تەجريدە لێ بوومەوە لە ڕۆژی چوارشەممە ڕێكـەوتی بيست و چواری مـانگی شەعبانی پيرۆز ساڵی (٨٨٨ كۆچـی) والحمد لله وَحْدَهُ، وَ الصَّلوةُ و الـسَّلاَمُ عَلَـى مَنْ لاَ نَبِيَّ بَعْدَهُ.

بەندەش لەسايەی خـوداوە ئـەم نامـە پـيرۆزە مەزنـەم كـرد بـەكوردی، وە وەرم گێـڕايە سەر زمانە شيرينەكەی گەلی كوردی خواپەرستی ئيـسلام دۆسـت، وە لێ بوومەوە لێی لەشەوی چوار شەممە ڕێكەوتی ١٤ مـانگی ڕەمـەزانی سـاڵی ١٣٩٣ كۆچی بەرامبەر ١٠-١٠-١٩٧٣ زايينـی لەهۆدەكـەی خۆمـا لـە خەسـتەخانەی سەربازی كەركوك لەكاژێر نۆی تەواو.

سا خوايه! بيكەيت بەچراى هەردوو جيهانى خۆمو باوكمو دايكمو هەموو كەسو كارێكم (و دوورو نزيك، ئەوەى بەخۆىَ چێشت پێم دەگات، لە زيندوو و مردووم، لە ئوصولو فروعو حواشيم) و هەموو موسوڵمانێك كەسوودى لىَ وەردەگرىَ (وەهەركەسىَ بۆ ڕەزاى خوا خزمەتى ئەم كتێبە دەكا، پەخشى دەكا، وەقفى دەكا، چاپى دەكا) بەتايبەتى باوكى سەروەرو خواناسم حاجى فارس برايماوەيى كەزۆرنييە رووەو دييوانى خواى ميهرەبان سەرى نايەوە.

نورى فارس

٩٧٣/١٠/١٠

مستشفى كركوك العسكري

ئێستاش كەسەعات هەشتى بەيانى رۆژى ٢٠٠٦/٥/١٠ ز = ١٢ رەبيعى دووەمى ساڵى ١٤٢٧ كۆچى، لەپاش سوپاسو ستايشى بىَ پايانى خوا لەسەر ئەم جهاد و كۆششە بىَ وچانە دەڵێم:

غَفَرَ اللهُ لِي وَ لِوَالِدَيَّ وَ لِسَائِرِ الْمُسْلِمِين. وَ آخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينْ.

بە ئومێدى دوعاى خێرتان..

خوايە بە لوتف و كەرەمو ڕەحمەتى خۆت توفيقم بدەيت كە: مختصر صحيح مسلم -لِلْمُنْذِرِ- يش تەرجەمە بكەم بەزمانى شيرينى كوردى. آمين.

دوعا گۆتان

نورى فارس حەمە خان حەسەن

٢٠٠٦/٥/١٠ زايينى

سلێمانى- كوردستان - مامۆستايان - ماڵى خۆمان

# فەهرەسی باسەکان